**گەورەترین پڕۆژەی**

**بەکوردی کردنی تێکڕا فەرموودەی قودسی!**

**(١)**

# گەورەترین مەوسووعەی (ئینسکلۆپیدیا) فەرموودەی قودسی

**بەرگی یەکەم – بەشی یەکەم**

**نووسین و لێکدانەوەی/ مامۆستا ابوبکر توفیق**

(ئەم بەرگە) کۆی بەشەکانی:(یەکەم ودووەم) لە خۆ دەگرێت، وبە یاوەری ئیزنی خودای گەورە دەبێتە بەرگی یەکەم لەپڕۆژەیەکی زۆر گەورەو پیرۆز و پێویست ، بۆ هەرموسوڵمانێکی کورد زمان. چونکە لە لە راستیدا یەکەم پڕۆژەیە و بۆیەکەم جارە لەکوردوستان و ناوچەکە ئەم جۆرە پڕۆژەیە بە بخۆیەوە ببینێت ، ئەوەی ئاشکرایە لەلای هەرموسوڵمانێك ئەوەیە پێگەو نرخ وبەهاو سەنگی فەرمودەی قودسی لەلای موسوڵمانان وبەتایبەت لەلای گەلەکەمان گەلی کوردزمان ! بۆیە وەك هەست کردن بەبەرپرسیارێتی و وەك خزمەتێك بۆ گەلەکەمان ئەم پڕۆژەیەهاتە کایەوە..جا داوا کارین لە تێکرای موسوڵمانان کۆمەکمان بن بۆ سەرخستنی ئەم پڕژە پیرۆزە. هەر کەسەو بەپێی تواناو دەرفەتی خۆی..

*********************

١٤٣٠هـ ٢٧٠٩ ك ٢٠٠٩م

* ناوی کتێب : **گەورەترین پرۆژەی بەکوردی کردنی تێکڕا فەرمووودەی قودسی! و((پوختەی کۆباسی تێکڕای فەرمووودەکانی قودسی ( پیرۆز).))**

**(١)**

* ((بەرگی یەکەم)) ((بەشی یەکەم))
* بەرگی کۆ کراوەی بەشەکانیەتی یەکەم ودووەمیەتی

* ناوەرۆك : فەرمووودەی قودسی
* نووسەر:نوسین و ئامادەکردنی: مامۆستا ابو بکر توفیق
* ژمارەی سپاردن : :(٧٠٢) ی پەڕتووکخانەی گشتی هەولێر
سالّی ٢٠٠٧ ز
* پیت چنین : زیلمان=دیندار سورچی
* دیزاین : هێلّی شینی بۆکاروباری کومپیوتەری
* تیراژ : (١٠٠٠) دانە
* نۆرەی چاپ:چاپی دووەم بەزیادکردن وپوختەکردنەوە

چاپخانەی رۆژهەلاّت / هەولێر

**************************************

*********************************************************

# پێناسەی ئەم پەڕتووکە

١- گرنگترینی ئەو فەرموودانەم هێناوە کە لە رۆژانەی ژیانمادا رێنمایی لێ وەرگرین .

٢- راسترین فەرموودەم هەڵبژاردووە کەهەمووەرجەکانی زانایانی فەرموودەیی تیادایە بۆپەسەندکردن و وەرگرتنی فەرموودەکان.

٣-هەوڵمداوە بەکورترین واتا واتاکەی بدەم بەدەستەوە .

٤_زۆرترین رێنمایی وپەند وانە سوودو قازانج وئامۆژگاریم لێهەڵجنیوە کە زۆر پێویستن بۆ پەوەردەو کارپێکردنیان.

تێبینی //
ئەمانە هەمووی دەقێکی قورئان یان فەرموودیەکی راست یان ئامۆژگاریەکی دانا و زانایەکی لەسە رە.

## کاری دانەر و لێکدەرەوە..

١. هەڵبژاردنی گرنگترین فەرموودەکانی کەزیاتر لەرۆژانەی خۆماندا دووبارە دەبێتەوە بۆسوود لێوەرگرتن لێیان .

٢. راسترین فەرموودەکانم هێناوە کەبەهەموویێوەرێکی زانایانی ئەوبوارەپەسەندبێت بۆکارپێکردنی،لەوانە ئیبن سەلاح شەهرەزووری وبوخاری وموسلیم ونەحمەد ونەبوداوود ونەسائی ونیبن ماجە وتورموزی-- --رەحمەتی خودایان لێبێت.

٣. پەسەندکردن وناپەسەندکردنی توێژینەوەی فەرموودەیی لەلایەنی زانایانی پێش لەئێستا و زانایانی ئێستا ش هێناوە زۆربەدەست پاکییەوە.

٤. بۆ تەخریجی فەرموودەکانی ئەم بەشە بەشی دووەمی فەرموودە قودسیەکە (الجامع الاحادیث القودسیة ).

٥. بۆسود وەرگرتنەکان زۆرهەوڵم داوە خۆم ماندوو کردوە زۆرترین سودوو وانەی لێهەڵبجنم کەبەخەیاڵم دا هاتبێت یاداشتم کردوە ،ئەویش بەمەبەستی سود وەرگرتن .

٦. چاوەڕوانی زنجیرەی تری ئەم پەرتوکە بن .

٧. ئەم وانەو سود و هەڵجاندنە تەنها لەم پەرتوکەدا دەست دەکەوێت.

٨. دەکرێت ئەم پەرتوکە بکرێتە وانەیەکی سەرەکی بۆ قوتابخانە ئاینیەکان تەنانەت لەمال و مزگەوتەکاندا یان دایك و باوك بیکەن بەوانە بەمنداڵکانیان بڵێنەوە بەمەش منداڵەکان بەهرەی هەڵێنجاندن و تێگەیشتنیان بۆدروست دەبێ .

٩. لێکدانەوەی تێرو تەسەل و ڕێنوێنی کردنی خوێنەر لەو فەرمودانەی کەمرۆڤ هۆش و بیرو زانینی دەرەکی پێتەواو دەبێ وەك دەڵێ (کلم الناس علی قدر عقولهم اتریدون ان یکذب الله ورسوله) واته بەپێی هۆشی خەڵکی قسەبکەن بەکەن ئایا دەتانەوێت قسەیەك بکەن وبەدەر لەسنوری هۆشو هزری خەڵك بێت لەدەر ئەنجامدا خواو پێغەمبەرەکەی بەدرۆبخەنەوە .

١٠.هەڵبژاردنی راسترین فەرمووده وەك(متفق علیه)ئیامی بوخاری وموسلیم یانهە ر تەنهابخاری یان موسلیم کەکەمترین پلەی ئەم فەرموودانە ئیامام موسلیمە کەلە م پەرتووکەدا هاتووە.

١١.هەڵبژاردنی واتاترین فەرمووده بێگومانلە هەردەروازەیەك چەندەها فەرموده هەیە بەڵام واتاترینیانوگرنگترینیانم هێناوە.

١٢.هەڵبژاردنی فەرموودەکان بەبێ ئەوەی هیچدووبارە بونەوەیکی تیادا بێت.

١٣.،ئەمەشبۆخزمەتکردنیخوێنەرە بۆئەوەیکاتی بۆبگێڕمەوەوبتوانێت بەئاسانترین شێوە لەفەرموودەکانتێبگات سەری لێنەشێوێنێ.

١٤.هەڵبژاردنی ئەومودانەی کەخۆمان زۆر لەرۆژانەی پێویستمان پێیەتی ودووبارە دەبێتەوە.

**تێبینی** : //
**زۆر بە خۆشحاڵیەوە رەخنەو پێشنیارەکان لە بەرچاو دەگرین لەم ڕێگایانەی خوارەوە:**
**ژمارەی مۆبایل** ( ٤٨٢٧٠٥٣ )
**ئیمێل** nusar-abubaker tofeeq @yahoo.com

**یان بەنامە بدرێت بەدەست هەریەك لەوپەرتووکخانانەی کەئەمپەرتووکەی لێدەفرۆشرێت** ----



# سوپاس و پێزانین

- بۆ گەردیلەی چاومان پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت .
- بۆ هەر کەسێ چاوی بەهەڵەیەك بکەوێت لەم نووسینە کەمەم بکەرێت، بەدوای پاساودا بۆم چونکە بەس خودا تەواوەو بێ کەم و کورتییە .
- بۆ ئەو کەسە ئەگەر تێبینی بنیات نەری هەیە لەهەر هەڵەیەك ئاگادارمان بکاتەوە پێی دەزانم و چاوی بەووردی پیادا دەڕوانمەوە.
- بۆ ئەو کەسەی هەوڵ دەدات ئەم نووسینە کەمەو نووسینی تر بڵاو بکاتەوە بەهەمووماڵێکدا لەکوردستانی خۆشەویستدا.
- بۆ ئەو کەسەی ئەگەر بڵاوی کاتەوە چ بەلایەنی فرۆشتنی یان بەلایەنی بەخشینی لەناو خەڵکاندا .
- بۆ ئەو کەسەی هەوڵی بڵاو کردنەوەی دەدات پەیوەندیم پێوە بکات ئەوەی کەم و زیادی بۆ چاپی داهاتوو بکەین، کاری یاسایش بۆ ئاسان بکەم.

نووسەر

م/ ابوبكر توفيق

# (پێشەکی چاپی یەکەم)

سوپاس بۆ خوای گەورە ، لەپاشان سلاو لە گیانی پێغەمبەر ﷺ و خێزان و یارانی .

لە پاشاندا :

**وەك وەفادارییەك بە دیاری بۆهەرکورد زمانێك لەمانگی رەمـەزانی ئەم سا ڵدا نز یکەی چل فەرموودەم هەڵبژارد وەك چەپکەگوڵێك..**

**دەستەگوڵێك پێشکەشیان بکەم بەهەرموسوڵمانێك..**

**بەهیوای ئەوەی خودای گەورە لێمان وەرگرێت بە وپەڕی جوانییەوە..**

**داواله موسوڵمانان دەکەم بێ بـەشمان نەکـەن لـە نـزاو پاڕانـەوە وسکالانووزانەوەی خۆیان..**

**خودای گەورە لەهەموولایەك وەرگێرگرێ..**

**ئامین..ئامین.. ئامین.**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەكی چاپی دووەم

لەپاش كەوتنە بازاری پەرتووكی گوڵبژێری ((الاحاد یث القد سية))بەناوی هەڵبژاردن لە فەرموودە پیرۆزەكان و ئەو سوودەگەورەو بەرچاوەی كەمن چاوەڕوان بووم بە ئومێدی خودای گەورە. سوود ی زۆرگەورە و بەرچاوبە ئاشقان وتامەزۆیانی فەرموودەیی بكات ئەمەشم بەچاوی خۆم دی خەڵكان زۆرو پڕ بەدڵ تام وچێژی تایبەتیان لێكرد. ئاگاداریش كرامەوە كەكراوەتە وانە لەهەندێك لەمزگەوتەكاندا ئەمەش چاكەیەكی زۆر گەورە و بێژماری خودای گەورەیە بە سەرمەوە.

**چونكە ئەو پەرتووكە ئەم تایبەت مەندیانەی هەبوو :**

**یەكەم** : راسترین فەرموودەی هەڵبژاردووە- - -

**دووەم**: ئاماژەی سەرچاوەكان كردووە- - -

**سێیەم** :لێكدانەوەی زاناكانی زۆر بەدەست پاكیەوە هێناوە- - -

**چوارەم** : راسترین بۆچوونی هەڵبژاردووە بە بەڵگەوە - - -

**پێنجەم** : بۆچوونی لایەنی تریشی روون كردووەتەوە وپەرچ دانەوەیان ئەگەر پێچەوانەی راو بۆچوو نی ئەهلی( سووننەو جەماعەت)بێت- - -

**شەشەم** :زیاتر لەچوارسەد سوودو وانەی هەڵجنراوە . كە تا ئێستا لەهیچ پەرتووكێكیتر دانیە. هەر نبێ تادەرچوونی ئەو پەرتووكە...

## پرۆژەی مەوسووعەو كۆكراوەی فەرمودەی قودسی ..

پرۆژەی مەوسووعەو كۆكراوەی فەرمودەی قودسی .. پرۆژەیەكی هەرە گەورەیە هەقی خۆیەتی چەندەها داموو دەزگا هەستێت بەتاوتوێكردن و هەڵبژاردن و پوختەكردن و بەكوردی كردنی ئەم فەرمووده قودسیانە..

**لەبەر ئەم چەند خاڵانە:**

**خاڵی یەكەم:** دەتوانرێت بەچەند بەرگێك تێكرای فەرموودەكانی قودسی كۆبكرێتەوە..لەكاتێكا لەوانەیە بەسەدەها بەرگ تێكرای فەرموودەكانی پێغەمبەر كۆنەبێتەوە.

**خاڵی دووەم:** پێگەی فەرموودەی قودسی لەناو دڵ و دروونی هەرموسوڵمانێكدا، كەپێگەیەكی یەكجار پڕ بەهاو قورس و سەنگین و بەرزو گەورەی هەیە.

**خاڵی سێیەم:** هەتا ئەو رادەیەی كەفەرموودەی قودسی بەرانبەر قورئان ناودەبرێت، بۆنموونە: لەكاتی گێڕانەوەی و باسكردنی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو :خودای گەورە دەفەرموێت: كەواتە فەرموودەكەی دەدایەوە پاڵ خودای گەورە.

**خاڵی چوارەم:** واتاداریی و پڕبەهایی وشەكانی فەرمودەی قودسی كەبەكەمترین رستە واتایەكی زۆر گەورە زل دەدات بەدەستەوە.

**خاڵی پێنجەم :** گرنگترین كارێك كە لە و رێگەیەوە بتوانرێت خودای گەورەی پێرازی بكرێت بەهۆی تێگەیشتن و كارپێكردنە بەفەرمووده قودسیەكان .

**خاڵی شەشەم:** ئەوەی زۆر پێویستەو لە پێش هەموو شتێكیترەوەیە ، ئەوەیە كە خودای گەورە لەقورئاندا یان لەفەرموودەكانی قودسیدا باسی لێوە كردووە و لەپاشاندا بەفەرمووددەی پێغەمبە ر(صلى الله عليه وسلم ) زیاتر وزیاتر بۆ ئێمە روونكراوەتەوە.

**خالی حەوتەم:** لەبەر ئەمھۆیانە منیش لەپاش پشتیوانی بەخودای گەورە چەند رێگەیەکم گرتووەتە بەر بۆ ئەوەی کەبتوانم خزمەتێك بە ئایین و گەل و وڵاتم بکەم...

**بەم شێوەیە ی خوارەوە:**

**شێوەی یەکەم:** هەڵبژاردنی گرنگترین فەرموودەی قودسی لەسەدان فەموودەکانیتر.

**شێوەی دووەم:** راسترین فەرموودەم هێناوە لەهەزارەها بەناو کراو بە فەرموودەو لەرستیدا فەرموودەش لێی دوورە و بەریە.

**شێوەی سێیەم:** راڤەکردن و لێکدانەوەی زاناپسپۆرەکانی ئەم بوارەم باسکردووە.

**شێوەی چوارەم:**هەڵێنجانی زۆرترین و گرنگترین رێنمایی و وانە و سوود و قازانج و پەند و ئامۆژگاری، کەزۆر پێویستە بۆ باری ژیانی رۆژانەی خۆمان و هەموورموسوڵمانێك چونکە چاو روونی دەکات لەهەڵسو کەوتی لەگەڵ خودای گەورەی خۆی وپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و ئایین وتێکراو سەرجەم موسوڵمانان و خزمان و دۆستانی ، تەنانەت لەگەڵ دووژمنانیشی لەشەیتان وناخەزانیشی.

**شێوەی پێنجەم:** دەتوانم بڵێم ئەم هەڵجنینانە و رێنمایی و دەرس و وانەو پەند و سود و قازانج وئامۆژگاریەکانی بەسەدەها رێنمایی لەخۆگرتووەو هەژمار کردووە. بۆیە دەتوانم بڵێم، ئەم پەرتووکە یەکەم پەرتووکە تا رۆژی ئەمرۆ لەسەر ئاستی هەموو ناوچەکە لەوانەشە بتوانم بڵێم لەسەر ئاستی هەموو جیاهانیش، لەم جۆرە رێ

*و شوێن گرتنە بەر و پاپند بوونە.(( لەپێش هەموو شتێك خودای گەورە رێنمووی و چاودێری تایبەتی سوپاس وستاییشی بێپایانی دەکەم بەزمان و بەدڵ..من هەرگیز*

*ناتوانم گووزارشت لەسوپاسی تەواوی خودای گەورە بکەم لە سەرئەو هەموو بە هرەو چاکانەی ئەو بەسەرمەوە))کردوووم لەم جۆرە خزمەتکردنە بۆ فەرموودەکانی خۆی بۆیە: بەیەکەم پەرتووك دەژمێردرێت لەمدبوارەدا.. خۆ ئەگەر هەرنەبێ ئێمە هێشتا نەماندیوە!..*

***شێوەی شەشەم:** ئەم بەرگە یەکەم بەرگ دەبێت دەخرێتەماڵانی موسوڵمانانەوە: لەکاتێکا چاوەڕوانی بەرگی دووەمین بەیارمەتیدان خودای گەورە..*

***شێوەی حەوتەم:**هیچ فەرموودەیەکم دووبارە نەکردوتەوە. بەئەمەش خۆی لە خۆیدا* خوێنەری بەرێز... ***لەزۆر ماندووبوون وگەڕان دەپارێزێ:***

***لەوانە:***

***ماندوو بوونی یەکەم:** لەسەرئێشەی تێکەڵکردنی فەرموودەی راست لە ئەوانەی نانراون فەرمووده و لەهەمانکاتدا راستنین!! .*

***ماندوو بوونی دووەم:** پەرش وبلاوی و فراوانی قووڵی فەمووددکان لەناو سەرجەم پەرتووکەکانی فەرموودەییدا.*

***ماندوو بوونی سێیەم:**واتاکردنی بەکورترین شێوە دراوە بەدەسەتەوە .*

***ماندوو بوونی چوارەم**:هەڵبژاردنی واتاترینیان کۆکراوەترینیان لە فەرموودەکان.چونکە هەمان فەرمووده لە وانیە بە زیاتر لە سەنەد ریوایەت کرابێت...هەر زانای بەسەنەدی خۆیەوە...*

***ماندوو بوونی پێنجەم**: ئەم بەرگە و لەوانەیە بەرگی دووەمیش هەرو بەس تەنها فەموودە قودسیەکانە ((متفق علیه)) یان هەرنەبێت بوخاری یان مەسلیم بهێنم بەجیاگێڕوایەتیەوە یان موسلیم بەجیا لەبخاری گێڕاویەتیەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بارسەنگی و پڕبەهایی و دڵنیایی دەدات بەخوێنەری بەرێز لەم فەموودانەدا.*

***جابۆئەم مەبەستانە دوا لەسەرجەم موسوڵمان دەکەم کە بە هەموو شێوەیەك بشتگیریم بکەن بۆ هێنانە دی و سەرخستنی ئەمپرۆژە گەورەیە...خودای گەورە هاریکاری ئەو کەسە یە کە ئایینی خودای گەورە سەردەخات..***

***براتان خزمەتکاری فەرموودەکان بەم پرۆژەیە:***
***پرۆژەی پوختەو مەوسووعەو کۆکراوەی فەرمودەی قودسی.***

**م: ابوبکر**

**٢٩ ی صفر/ربیع الاول١٤٣٠کۆچی**
**٥ ی ڕێبەندان/ ڕەشەمێی ٢٧٠٨ کوردی**
**٢٤ ی شباط ٢٠٠٩ زایینی**

# گوڵبژێر لە گەورەترین مەوسووعەی (ئینسكلۆپیدیای) فەرموودەی قودسی

## ((پیرۆز))

هەڵبژاردن ولێكدانەوەی/ مامۆستا ابوبكر توفیق فتاح

(ئەم بەرگە) كۆی بەشەكانی:(یەكەم ودووەم) لە خۆ دەگرێت، وبە یاوەری ئیزنی خودای گەورە دەبێتە بەرگی یەكەم لەپڕۆژەیەكی زۆر گەورەو پیرۆز و پێویست ، بۆ هەرموسوڵمانێكی كورد زمان. چونكە لە لە راستیدا یەكەم پڕۆژەیە و بۆیەكەم جارە لەكوردوستان و ناوچەكە ئەم جۆرە پرۆژەیە بە بخۆیەوە ببینێت ، ئەوەی ئاشكرایە لەلای هەرموسوڵمانێك ئەوەیە پێگەو نرخ وبەهاو سەنگی فەرمودەی قودسی لەلای موسوڵمانان وبەتایبەت لەلای گەلەكەمان گەلی كوردزمان ! بۆیە وەك هەست كردن بەبەرپرسیارێتی و وەك خزمەتێك بۆ گەلەكەمان ئەم پرۆژەیەهاتە كایەوە...جا داوا كارین لە تێكرای موسوڵمانان كۆمەكمان بن بۆ سەرخستنی ئەم پرۆژە پیرۆزە. هەر كەسەو بەپێی تواناو دەرفەتی خۆی..

**********************

٢٧٠٧ ك ١٤٢٨ھ

## ((پوختەی کۆباسی تێکڕای فەرموودەکانی قودسی ( پیرۆز).))

## ((ماجاء في الاخلاص في العمل وذم الرياء))

عن ابي هريرة-رضى الله عنه –قال :قال رسول الله -(صلى الله عليه وسلم) (قال الله تبارك وتعالى ((انا أغنى الشركاء عن الشرك ،من عمل عملاً اشرك فيه غيرى تركته وشركه))رواه مسلم في صحيحه(١)

**((باس لەتايبەت كردنى جۆرەكانى پەرستن و ووتە وكار كردن دەكات كەتايبەت بكرێت بۆخوداى گەورە ،لەپاشان باس لەوەدەكات ئەگەرمرۆڤ مەبەستى بێجگە لەخودا هەبێ كەچەندبەخراپى باس ى لێوەدەكات))**

لەباوكى هورەيرەوە((خوداى لێ رازى بێت)) دەگێرێتەوە كە دەڵێت :پێغەمبەر (صلى اللەعليەوسلم) فەرموويەتى ولەخوداى گەورە وپاك وبێگەردەوە كەدەفەرموێت ((انا اغنى الشركاء عن الشرك)) واتە:-من لەهەمووهاوبەشەكانى تركەبۆمن دادەنرێ دەوڵەمەندو زەنگين ترم لەوەى پێويستم بەهاوبەشى هەبێ هەركەسێ كارێك بكات هەركارێك بێت وبێجگەلەخۆم بكات بەهاوبەشم تركته وشركه).بۆى بە جێ دەهێڵم وازى لێ دێنم بەخۆى وهاوبەشەكەيەوە.

### ((لێكدانەوەى ئيمامى نەوەوى بۆفەرموودەكە))

واتە:-خواى گەورە ئەوەيە كە ئەو هيچ پێويستى بەهاوڵ و هاوبەشى نى يە تاخەڵك هاوەڵى بۆدابنێن بۆيە هەركەسێ هەركارێك بكات لەپەرستنەكان وبێجگە لەخودا هاوبەشى كەسى تر تيادابێ بابەناو بۆخوداش بێ خوداڵێ ى وەرناگرێ هيچ پێويستى

---

(١)اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الزهد-باب من اشرك في عمله غيرالله وفي نسخة باب تحريم الرياء برقم : (٤٦-٢٩٨٥) . واخرجه ابن ماجه في كتاب الزهد باب: الرياء السمعة برقم : (٤٢٠٢) قال الهيثمي في الزوائد :اسناده صحيح رجاله ثقات وقداخرجه الامام احمد والترمذي وابن حبان والبيهقى .وقد حسنه الالبانى في صحيح الجامع الصغير، برقم : (٢٨٢-٢١٦) .

بەم جۆرە هاوبەشی یە نی یە کە هەرکەسێکی تری لەگەڵ بشداربێ، بۆیە وازی لێ دێنێ بۆ ئەو کەسەی کەبەهاوبەشی خودای گەورە دانراوەبانەو پاداشتی بداتەوە وپاداشت لەوەوە وەربگرێت.

مەبەست ئەوەیە هەرکارێك لەهەر کەسێکەوە بکرێت بۆئەوەی خەڵك لەبەرچاویان بێ ، ئەوا ئەوجۆرە کارانە لەبەرئەوەی بۆبەرچاوی خەڵکی یە خودا نایەوێ وپوچەڵی دەکاتەوە ، هیچ چاوەڕوانی پاداشت وخێر وچاکە نەبێ لەلای خودای گەورەی ؛بەمەشەوە راناوەستێ بەڵکو تاوان باریش دەبێ لەسەری.

(کۆتایی لێکدانەوەی ئیمامی نەوەوی- رحمەتی خودای لێبێ-.)

بۆیەتاوان بار دەبێ چونکە تایبەت نەکراوە بۆخودای گەورە کەئەبێت هەمووجۆرە پەرستنەکان تایبەت بکرێن بۆخودا وکەسی ترتیایدا بەهاوبەش وهاوسەنگ وشان بەشانی دانەنرێت ، چونکە خودای گەورە خۆی فەرمانی بەم شێوە یە داوە وەك خودا خۆی دەفەرمووێت: (( {وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ }[٥]})((البينة:٥)).واتە( تەنها فەرمانی خودا پەرستیان پێدراوە کە پەرستنەکان بۆخودا تایبەتی بکەن- - - ).

## ((سوودەکانی تایبەت کردنی پەرستنەکان))

١) ئەوا خودا بۆت بەبەر هەم دەهێنێ وپێ دەگات

٢) بەرو بوومە کەشی رەنگ دەداتەوە وئاشکراو دیاردەبێ لەسەر خاوەنەکەی ئەوکەسەی کەدڵسۆزی وتایبەتمەندی لەپەرستەکانیابۆ خودا ئەنجام داوە

٣) هەتاوای لێ دێ دەبێتە رووناکی بۆیی و رووی پێ سپی دەبێت ،

٤) شیرینی لەووتەکانی دەبارێ کاتێ بێتە قسەکردن ،

٥) کاریگەرەو رۆڵی بەرچاوی دەبێ لەسەر دڵانی ئەوکەسانەی کە گوێبیستی ووتە و ووتاری دەبن ،

٦) بۆیە بیسەران کاریەقسەکان و گۆیرایەڵی ئامۆژگاریەکانی دەبن،

٧) خەڵكانی سەرلێشێواو و سەرگەردانی پێ ئاسوودە وكامەران وپێ ی دێنە سەر رێ چونكە ووتەكان ئەگەر لە دڵەوەهاتن دەكەونە دڵەوە لێ ی نایەتە دەرێ ؛ بەڵام ئەگەر ووتەكانی تەنها بەزمان رازێنرابێتەوە ، مەبەستی گوێ بیست و چاولێكاری خەڵكی بێت لەگوێ یەكانی بیسەرانەوە ناچێت وناگاتە ناودڵەكانەوە ، تەنهائەوەندە دەچێت بەرزدەبێتەوە كە لەسەر زارو زمانی ووتە بێژبە داوەدە بارێ ولێ ی جیا دەبێتەوە ، چونكە گۆی یەكان نزیك و دراوسێ و زمانت ،بەڵام وەك ووتمان ئەگەر لەدڵەوە بێت خۆی ناگرێت دەچێتە ناخی دڵەوە وتامردنیش بەهیچ نایەتەدەرێ چونكە سەرچاوەی ووتە كە لەدڵەوەیە بۆیە لەدڵ دەچەسپێ ، چونكە دڵ لەئاستی دڵەوەیە بۆیە دەگاتە دڵەوە، وەك ئاوێك وایە تەنها دەگاتە ئەوجێگایەی كە لەئاستی خۆیدایە بەهیچ شێوەیەك لەخۆی بەرز تر نابێتەوە ئەگەر هۆكارێكی تر نەگرێتە بەر بۆئەم كارە . دەپارێینەوە ئەی خودایە تۆبەگەورەیی خۆت دڵسۆزی وتایبەت مەندی لە پەرستنە كاندا بكەیت بەبەش ولێمان وەرگریت ئامـــــــین.

## گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودە:

١. خودا فەرمانی بە هەموو گەلەكان داوە بەتایبەتی كردنی هەموو جۆرەكانی پەرستن بۆخودا.

٢. گەورەترین پەرستن بۆخودا ئەگەر هاوبەشی كەسی تری تیادابێ خودا لێ ی وەر ناگرێ وپەكی بەكەس نەكەوتووە وناكەوێ.

٣. هەرجۆرە پەرستێك كەدڵسۆزی تایبەت بوونی بۆخودا تیادا بێت باكەمیش بێت خودا بەباشترین وەرگرتن وەری دەگرێت.

٤. رەنجەرۆترین كەس ئەوانەن كە پێش چاو خەڵكی پەرستنی خودا دەكەن بەڵام لەرۆژی دوایی خودا پێیان دەفەرموێت ئێوە هاوەڵتان پەیدا كردووە ومەبەستان من نەبوو برۆن بائەوان پاداشتان بدەنەوە.

٥. خودا خاوێنە تەنها خاوێن وەردەگرێت لەپەرستنەکانیش.

٦. -خودا دەوڵەمەندە پێویستی بە هاوبەشی کردنی کەس نی یە وەك چۆن مرۆڤەکان پێویستی تیان بە یەکتر هەیە بۆهاوبەشی کردنی یەك.

بسم الله الرحمن الرحیم

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢)لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣)وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)

﴿ الاخلاص : ١-٤ ﴾

واتـە : ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بڵێ خودا تاك و تەنهایە مەبەست بەجێ هێنەری هەموو خەڵکانە خۆی لەکەس نەبووە و کەسیشی لێ نابێ : هیچ هاوشێوە و وێنەی نیە .

**((ماجاء في ان رحمة الله غلبت غضبه ))**

٢-((عن ابي هريرة- رضى الله عنه– عن النبي- صلى الله عليه وسلم- قال (( لماقضى الخلق ، كتب عنده فوق عرشه : ان رحمتى سبقت غضبي)).رواه الامام البخاري في صحيحه(١)

**((باس لەوەدەكات چی هاتووە لەفەرموودەی خودا لەباس میهرەبانی خودا كەزاڵترە بەسەر تورەیی و ڕەنجاندنی))**

لە باوكی هورەیرەوە- دەڵێت.ڕەزای خودای لەسەربێ- پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی (كاتێ خودای گەورە ئەم گەردوون و بوونەوەرەی دروست كرد، ((كتب عنده فوق عرشه)) نووسی لای خۆی لەسەر تەخت وعەرشی خۆیەوە ، (ان رحمتي سبقت غضبي )- (ان رحمتي سبقت غضبي ) واتە:-خودا فەرمانی داوە فەرمووی بەراستی میهرەبانیم بەرامبەر دروست كراوانم لەپێش تورەیی ووئازار دانیانەوەیە)).

**((لێكدانەوەی فەرموودەكە لەلایەن زانایانی فەرمودەیی یەوە))**

زانا قەستەلانی لەلێكدانەوە یدا بۆ –بوخاری- دەفەرموێت واتای ((كتب)) فەرمانی بەپێنووسدا كەبنوسێت.

واتای (على العرش) مەبەست ئەوەیە لەسەر عەرش بێت بۆئەوەی كەس دەركی پێ نەكا بنهێنی بێت لەهەمووكەسێك بێجگە لەخودای گەورە خۆی .

---

١) اخرجه الامام البخارى في صحيحه في كتاب التوحيد –باب:مايذكر في الذات ، والنعوت ، وأسامى الله. وأيضاً في كتاب التوحيد-باب :ولقد سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلين.وايضاً في كتاب بدء الخلق – باب ماجاء في قول الله تعالى وهوالذى يبدأ الخلق ثم يعيده) .واخرجه مسلم في كتاب التوبة-باب :في سعة رحمة الله تعالى برقم ((١٤(٢٧٥١) واخرجه النسائي في كتاب النعوت –باب الرحمة والغضب برقم ((٧٧٥٠)) .واخرجه الترمذي في ابواب الدعوات-باب ،خلق الله مأة رحمة رقم ((٣٥٥٤٣)).

ئەمەش مەبەستی لەگرنگی ئەوکارە دێت کە خودای گەورە سۆزەکەی زیاترە لەتۆڵەی بۆیە لەوجێگە بەرز و گەورە ورێزەدا نووسراوە چونکە تێ نووسراوەکانی پارێزراوە لەهەرکەسێك لەژێر عەرش وتەختی خوداوەیە.

بەلاّم ئەو پێنووسەی کە تایبەتە بە میهرەبانی خودالەهەمووجێگەو شوێنێك بەرز تر لەتەنانەت لەسەر عەرشی شەوەیە.ئەمەش لەوانەیە نهێنی لەوەدابێ کەئەوەی لەژێر عەرشەوەبێت بریتی بێ لەجیهانی هۆکارو هۆکار رێخەرەکان (عالم الاسباب والمسببات) بەلاّم ئەوتێنووسەی کەپارێزاوە ولەژێر عەرشە وەیە ئەوهەموو شتانە دەگرێتەوە کەدەبێت لەکات و جێ و رێ و شوێنی تایبەتی خۆیانا (ان رحمتی تغلب عضبي ) مەبەست ئەوەیەمیهرەبانی خودا پێش تۆڵەی خودا دەکەوێ تەنانەت بۆئەوکەسانەش شیاوی ئەوەن سزابدرێن بە هۆی سەرپێچی کردن وگومراِیی ویاخی بوون و تاوان کردنیانەوە چونکە پێش خستن و زاڵ بوونی میهرەبانی وسۆزو لێ خۆشبوون ولێ بوردەیی خودایی هەمووکات دێت تەنانەت ئەگەر کاری خێریش ی ئەنجام نەدابێت بەلاّم سزاو تۆڵەو ئازاروئەشکەنجەی خودایی بۆهیچ کەس نایەت ئەگەر بەهۆی خراپە کاری خۆیەوە نەبێت بەپێچەوانەی رژاندنی میهرەبانی وبەهرە وسۆزی خودایی بۆسەربەندەکانی کەمەرج نی یە بەتەنها بەهۆی گۆیراڵی و فەرمان رەوایی خوداو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وبەجێ هێنانی کاری خێرو چاك بەسەریاندا برژێت.

ئیمامی –جەزەری- دەفەرموێت((ان رحمتی تغلب غضبي)) ئاماژەیە لەبۆفراوانی و زۆری وگەورەیی بێ سنووری میهرەبانی و سۆزی خودایی کە هەموو دروست کراوانی گرتووەتەوە بەبێ هیچ جیاوازیەك لەم دوونیایەدا وەك چۆن دەڵێن فلاّن کەس میهرەبانی و سەخاوەتی زاڵترە بەسەر یدا لەچاوچنۆکی و دەست گیرۆیی ((دووربێت لەوەی کە کەس نموونەی بە خودا بنوێنرێ))چونکە خودا خۆی خاوەن سۆز و تۆڵەشە بەلاّم سۆزی زیاترە بۆپیاوچاکان وەك چۆن تۆڵەی نزیکترە لەکەسانی خراپکاران ئەمەش ئەوپەڕی یەکسانی خودایی یە.

***((گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان))***

١) هەردەم میهرەبانی خودا لەپێش ترە لەبەرامبەر تۆڵەی.

٢) دەرگای گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی هەردەم ئاوالآیە بۆکەسانێ کە بگەڕێنەوە.

٣) تاوانکار یان گونا هبار باهەرچەندەتاوانی گەورەبێت هەرمیهرەبانی وسۆزی خودا گەورەترە.

٤) خودا بەپەلەنی یە لەتۆڵەو ئازاردانی خراپکاران بەڵکو دەرفەتیان دەدات بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆلای خودا .

٥) دەرخستن و دیاری کردنی وئاشکراکردنی میهرەبانی خودایی دەردەخات لەوەی کەبەتاوانێك یان زیاتر خودا لەبڕو بیانوو نی یە بۆ ڕق وکینە و تۆڵە لێ سەندنەوە.

٦) ئێمەش فێردەکات کە میهرەبان بین لەگەڵ خۆمان ولە گەڵ :ئەوکەسانەش کەلێیان بەرپرسین کەچاو لێ پۆشی هەبێت کاتێ کەهەڵەیەك دەکرێت دونیا ناروخێت بەو هەڵەیە بەڵکو دەرفەت بدە بۆبیرکردنەوەو ساغکردنەوەی هەڵەکە چونکە ئێمە خۆمان بێ هەڵەنین ئەی چۆن و کەی دادپەروەری یە بمانەوێ خەڵك هەڵەنەکەن لەکاتێکا خۆمان بەلێزمە هەڵەکارین.!!

٧) زیاتر مرۆڤ مژدەدەر بێت وئاسانکار تربێت نەك خەڵك دوور خەربێت وکارەکان گرانکار تر بکات.

چۆن لەگەشبینی تێبگەین؟
گەشبینی ئەبێ پاڵدەرت بێت بۆپشت بەخودا بەستن و لە پاشاندا کارگێڕو کاراترت بکات (نووسەر)

## ((ماجاء في تصحيح العقيدة ومايجب ان يكون الانسان عليه))

٣) عن ابى هريرة - رضي الله عنه-قال- قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) :- قال الله تعالى يسب بنو آدم الدهر ، وانا الدهر بيدي الليل والنهار) رواه البخارى في صحيحه(١)

**((باس لەوەدەكات ج فەرموودەیەك هاتووە وهەیە دەربارەی راست كردنەوەی بیرو باوەڕومرۆڤ پێویستە لەسەر ج باوەڕێك بێت)).**

٣- لەباوكی هوریرەوەخودای لێ رازی بێت -كە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت// خودای - پاك وبێ وێنە - فەرموویەتی// ((نەووەومندالآنی ئادەم قسەو جنێو بەرۆژگار دەدەن من خۆم رۆژگار كارم وشەو رۆژ لەدەستی خۆمدا یەوچۆنم بوێ هەڵی دەسوڕێنم و دەیگۆڕم))

### ((لێكدانەوەی زاناكان بۆ فەرموودەكە))

قەستەلآنی لەلێكدانەوەی بۆ واتاكردنی صحیحەكەی بوخاری دەفەرمووێت مانای (یسب بنوا ادم الدهر) قسەو جنێو نەوەكانی ئادەم بەرۆژگارە كاتێ كەتوشی ناخۆشی دەبن ئەوا لەراستیدا قسە وجنێو دانە بەخودای گەورە چونكە خودای گەورە هەڵسو ڕێنەری كات وساتانی شەوو رۆژەو چیشی تیادا روودەدات وەك چۆن ئەوەی خەڵك دەڵێت ((ئای زەمانەو رۆژگار چەندبێ وەفایت)) چونكە زەمانەو رۆژكاریش هەر دروست كراوی خودان هیچیان بێ ناكرێ لەباشی و چاكە بۆخەڵك بۆیە خودا

---

١) اخرجه الامام البخارى في صحيحه في كتاب التفسير وايضاً في باب (لاتسبوا الدهر)ج ٨ ص٤١ من كتاب الادب المفرد. سورة الجاثية باب:وما يهلكنا الا الدهر وايضاً رواه البخارى في الادب المفرد باب ((لاتسبوالدهر)) ج٨ ص٤١ من كتاب الادب المفرد.

واخرجه مسلم في كتاب الالف ط من الادب وغيرها-باب النهي من سب الدهر برقم (٢٢٤٦) واخرجه احمد(٢٧٢٢١٣٨/٢) وابوداود برقم : (٥٢٧٤)وصححه الشيخ الألباني في صحيح الجامع (٤٣٤٣)وارجع السلسلة الصحيحة (٥٣١) وأخرجه النسائي كتاب تفسيراحلام (١١٦٨٧).

دەفەرموویت: ((وانا الدهر) واتە: من دروست كاری كاتەكانم و دروست كاری هەموو روو داوەكانیشم كەتیایدا روو دەدات هەربۆیە خودا دەفەرموویت ((بیدی الامر ))هەموو كارەكان لەدەستەكانی مندایە كەئەوان دەیدەنەپاڵ كات وسات ورۆژگاروو هتد...

هەربۆیەش قسەو ووتە وجنێوی ناشرین دەدەن بەكاتەكان خودا دەفەرموویت من خۆم هێناو مەتەدی بەدەسەلآت و توانایی و لێهاتویی خۆم ، نەرۆژگار نەكات و ساتەكان هیچ رۆڵ وكاری گەری یەكیان نی یە لەهیچ شتێكدا (اقلب اللیل والنهار) .

واتە:- ((رووداوەكانی تیادا دەبەم ودەهێنم وجێ گۆڕكێ ی پێ دەكەم لەسات وكاتەكانی شەوو رۆژدا)).

كاتێ مرۆڤ رقی لەرۆژگار هەڵ دەستێ قسە دەڵێت و واگومان دەبات كەرۆڵ و كاریگەری یان هەبێت لەروودانی كارەساتەكان هەربۆیەش خۆی ناگرێت و قسەیان پێ دەڵێت .ئەم جنێوو قسەپێ ووتنە لەراستیدا بۆخودا دەگەڕێتەوە ، چونكە بەراستی ئەوەی كەهەموو شتێكی بەدەستەو بەجێ دەهێنی تەنها خودایە ، رۆژوشەو سات و كاتەكان جێگەو شوێنن بۆئەم جۆرەو بۆهەموو جۆرە روو داوەكانی تریش .

## ((كەوانە بەكورتی وبەكوردی))

خودا بەهەمووشێوەو شیوازێك هەڵسو ڕێنەری كات و رووداوەكانە : ((بەكورترین ووشەو بەواتاترین واتا)) .

ئەم فەرموودەیە بۆیەهاتووە بۆئەوەی ئێمە بیرو بارەڕی خۆمان راست بكەینەوە ئەگەر ئەم جۆرە هەلآنەمان كردبێت یان هەبێت ئەمەش لەوپەڕی رێزدایە لەبەكار هێنانی ووشەكان ودەربڕینەكان چونكە خەڵكانێك گۆمانی وادەبەن بەسەر چوونی شەوان و رۆژان رۆڵ وكاریگەریان هەیە بۆ روودانی كارەساتەكان لەمردن و هەژاری وهەر ناخۆشیەكی تر،هەمووبەسەرهاتەكان دەدەنەوە پاڵ رۆژگار ئیتر بەشیعرو

شانامە وپەخشان وستران و حەیران دەری دەبڕن ورەنگی داوەتەوە لەسەر بیروباوەڕیان .

بەڵام لەراستیدا تەنها خودایە هەموو شتێکی بەدەستە لەهەموو کارەساتێکی دڵتەزێن وکارێکی دڵ رەقێن رۆژگار تەنها جێ ی لەناو لێ بەسەر هاتە ،بۆیە قسەکردن و ووتن بەم کات وشوێنانە لەراستیدا قسەیە بەخودا دەوترێت

چونکە بەراستی بۆیە مرۆڤ دێتە دونیاوە خۆشی وناخۆشی ببینێ ئینجا هەرکەس لەکاتی ناخۆشی دان بەخۆیدا بگرێت خودا ئەوپەڕی پاداشتی بۆدادەنێت بەڵام ئەوەی دان بەخۆیدا نەگرێت قسە بڵێت و نارازی دەربڕێت هیچ لەوکارەساتانەی لەسەر ئاسانابێت ، بەڵکو ڕەنجەرۆی دوا رۆژیش دەبێت تۆڵەی نارازی بوونەکەی لێ دەگرێتەوە پاداشتی ناخۆشی یە کانیش نادرێتەوە.

### ((گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند ونامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*))

١) خودای گەورە دروست کاری خێرو شەڕە .بەڵام داوای خێردەکات لەبەندەکانی ، نەفرین لەشەریش دەکات .

٢) هەرکەس لە خێردا سوپاسی خودابکات پاداشتی دەداتەوە هەرکەس لەکاتی ناخۆشیەکاندا نارازی بێت هەر خۆی زەرەر مەند دەبێت .

٣) رۆژگار لەشەوان ورۆژان و کاتەکانی ترو رێ وشوێنە کان هیچ کاریگەری دروست کارنین نە بۆخۆشی نە بۆ ناخۆشی

٤) خودای گەورە لەسەر خۆیە لەسەر ئەوکەسانەی کەقسەو جنێو دەدەن بەخودا بەڵام تۆڵەی سەختی بۆدانا وون ئەگەر ئەوان تەوبەو پەشیمان نەبنەوە.

٥) بۆئەوەی ئێمە هەڵە نەکەین لەرۆژانەی ژیانماندا ، ئەگەر هەڵەشمان هەبێت بازۆر زوو فریای خۆمان بکەوین بۆراست کردنەوەی هەڵەکان ، خودالێمان وەردەگرێت بەجوانترین شێواز لەوەرگرتن و پەسەند کردندا.

٦) ئەم جۆرە بیروباوەرە لەدێر زەمانەوە هەیە هەرکات وماوەیەك بەشێوەیەك خۆیان نیشان دەدەن لەکاتی ئێستاماندابە((وجودی))خۆیان پیشان ونیشانی خەڵکی دەدەن ئەمانیش هەمان بیروڕای دوور لە ئایینی یە ورەوشتی یە کۆنە.

٧) خودای گەورە ئێمەی دروست کردووە بۆئەوەی لەسەر چاکە کردن و گوێڕایەڵی پاداشت وەر گرین، لەسەربێ رەوشتی و بێ عەقیدەیی وبێ دان بەخۆدا گرتن تۆڵە و سزا و خودای گەورە توندە .

**چۆن لەگەشبینی تێبگەین؟**

گەشبینی ئەبێ پاڵدەرت بێت بۆپشت بەخودا بەستن و لە پاشاندا کارگێڕو کاراترت بکات (نووسەر)

## (حكم النوء في الاسلام)

٤- عن زيد بن خاليد الجهني-رضى الله عنه –قال:مطرالناس على عهد النبى -(صلى الله عليه وسلم)-فقال (صلى الله عليه وسلم): ((الم تسمعوا ماذا قال ربكم الليلة ؟ قال : مانعمت على عبادى من نعمة الا اصبح طائفة منهم بها كافرين يقولون : مطرنا بنوء كذا ، وكذا ،فأمامن آمن بى ، حمدني على سقياى فذالك الذى آمن بى ، وكفر بالكوكب )) رواه البخاري في صحيحه (١)

## (ئایا دروستە بڵێیت بە هۆی جوڵانی ئەستێرەوە باران باری)

٤- لەزەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی-رەزای خودای لەسەربێ -. کەدەڵێت// لەسەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) باران بارینێکی باش باری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی بەخەڵکەکەئایا گوێتان لە خوداتان نەبووەچی فەرمووە ئەم شەو کەبارانەکە باریوە؟ فەرمووی ((ما انعمت على عبادي من نعمة الا أصبح طائفة منهم بها كافرين)) واتە:- هەر بەهەرەو خۆشی یەکی خۆم بەسەرخەڵکدا برژێنم هەندێك لە و خەڵکانە پێ ی کافروبێ بروا دەبن !

((يقولون: مطرنا بنوء كذا وكذا)) دەڵێن ئێمەبەکاری گەری ئەستێرەی ناوبرا وئەستێرەکەی تر بارانمان بۆباری ئەم جۆرە کەسانە بەم قسەو باسەیان کافرو بێ بڕوادەبن بەخوداچونکە گومانی وادەبەن کەئەستێرە بارانی بۆ باراندون.

---

(١) اخرجه الامام البخارى في صحيحه من ابواب الاستسقاء باب:قول الله تعالى ((وتجعلون رزقكم انكم تكذبون)). واخرجه البخارى ايضاً في كتاب الاذان –باب :يستقبل الامامالناس اذاسلم .

واخرجه مسلم في كتاب الايمان –باب :بيان كفرمن قال :مطرنا بالنوء برقم (١٢٥-٧١).

واخرجه الامام ماللك في الموطأ-كتاب –الاستسقاء-باب الاستمطار-بالنجوم.

واخرجه الامام احمد في المسند ، وابوداود في سننه وابن ماجه في سننه .

واخرجه النسائي في سننه –كتاب الاستسقاء-باب :كراهية الاستمطار- بالكواكب : من حديث ابي هريرة- رضى الله عنه- برقم (١٥٢٣) وحديث زيد بن خالد الجهني برقم : (١٥٢٤) .

((فأما آمن بي )) بەلاَم ئەوەی باوەڕی بەمن هێناوە کە بارانم بۆباراندووە ((وحمدني علی سقياي فذلك الذي آمن بيّ ))سوپاس بژێری من دەكات لەسەر باران بارینەكەم بۆیان ئەوە ئەوكەسەیە كەباوەڕی بە من هێناوە و ((وكفر بالكواكب))بیّ بڕوا بووە بەئەستێرە کە باران ببارێنیّ.

## ((واتای فەرموودەکەی خودا بەگشتی ))

ئەم فەرموودەیە ئەولایە ئەروون دەكاتەوە كاتێك هەندێك مرۆڤ بە نەزانی بێت یان بەئەنقەست بەواتای ئەوەی خۆی ئەوەی دەویّ لەكاتیّ باران دەباریّ دەڵێن ئەگەر ئەستێرەئەجوولاّیە لەجیّ ی خۆی ئەوا باران نەدەباریّ كەواتە ئەستێرە بارانی بۆباراندین ئەم جۆرە ووتەو بیروباوەڕە مرۆڤ لەبازنەی باوەڕداری دەردەخات چونكە ئەستێرەش خۆی دروست كراوە و هیچی لەدەستانی یە بەڵكو بەوویست وفەرمانی خودا دەسوڕیّ و لەجیّ ی خۆی . بەلاَم لەبەرامبەر ئەم جۆرەكەسانەدا كەسانێكی تر هەن دەڵێن خودا خۆی حەزی لیّ بوو بارانمان بۆببارێنیّ ئەویش بەفەرمانی خودا وكەهۆكاری بەهۆكارگرتنەوە بوو بارانمان بۆببارێنیّ ئەویش بەفەرمانی خودا وكەهۆكاری بەهۆكارگرتنەوە بەستووە ئەمەش هەرلەمیهرەبانی خودایە رژانی بەهەرەو خۆشی یە بەسەر دروست كراوەكاندا ئەم جۆرەكەسانە باوەڕداربن چونكە بڕواو باوەڕیان وایە كەهیچ شتێك لەم بوونەوەرەدایە خۆی بەخۆی سەربەخۆی روونادا بەڵكو ئەبێت بەوویست وزانین وهێزی خوداوە روودەدات ودروست دەكرێت .

## ((گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان))

١) زۆر ووتەیەك كەئێمە بەكەم وبیّ نرخی دەزانین لەوانەیە لەلاّی خودا زۆرگەورەبێت .

٢) ووتەی واهەیە كەئاینەدەی مرۆڤی پیّ لەق دەبێت یان پیّ مسۆگەردەبێت .

۳) هەر ووتەو بیرباوەڕێك ئەگەر هەڵە بوو پێویستە زۆر زوو فریای خۆت بکەوی بۆراست کردنەوەی .

٤) میهرەبانی خودالەوەدایە کە یەکسەر تۆڵە ناکاتەوە لەوکەسانەی کەکافردەبن بەڵکو دەرفەتیان دەداتێ بۆ تەوبەکردن یان سزادانیان هەڵ دەگرێت بۆ رۆژی دوایی

٥) .ئەوەی کەبێ بڕوابێ مەرج نی یە هەرلەسەر بێ بڕوایی بمێنێتەوە بەهەمان شێوەش بۆباوەڕدار، ئەبێتباوەڕدارِ کێشان وپێوەر دابنێت بۆووتەوکارو بڕواکانی یەوە بەخۆی نەنازێ

٦) کەباوەڕ دارێکی چاکە دەر ئەنجامی مرۆڤ بەدواین وکۆتایی کارو ووتەو باوەڕ یەوە .

٧) هەرکەس گومانی وابێت هەرج شتێك لەم بوونەوەرەدا خۆی بەخۆی خاوەن خۆیەتی بەسروشتی دروست بووە ، نەیگێڕێتەوە بۆلای خودا ئەوا کافرە بەم کارەی ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە .

٨) ئێمە ناتوانین دەست نیشانی کەس بکەین بە موسوڵمان یان کافر، بەڵکو دەڵێین هەر کەسێ کارێك بکات خودا بەکافر بوونی لە پێنووس دابێ ئێمەش دەڵێین ئەو جۆرە کارە کافربوونە بەڵام بەبێ دیاری کردنی هیچ کەسێك ناوهێنانی.

٩) ' ئەم جۆرە کوفروکارە کافربوونیەمانای ئەوە ناگەیەنێ خوێنی و ماڵی حەڵاڵ بکرێت.

١٠) ئە گەر پێت کرا ئامۆژگاری بکە، ئە گەر پێت نەکرا ئەوا خودا خۆی خاوەن تۆڵەو داد پەروەریە.

**چۆن لەکامەران وشادومانی راستەقینە تێبگەین؟**

((بزانن کامەران وشادومانی راستەقینە ئەو کەسەیە دوا رۆژی هەردەم ماوە: لە خۆشی وبەهرەکانی پێش خۆشی یەکانی کاتی و دوابڕاوەی ئەم دونیایە بدات کە هەر دەم ناخۆشی وکاردساتی دڵتەزێنی نەبڕاوەیە)) ((ووتە پێش ئێمە))

## ( الناس الذين يكذبون الله ويشتمونه)

ـ عن ابى هريرة- رضى لله عنه – عن النبي-صلى لله عليه وسلم –قال ((قال الله تعالى: كذبني ابن آدم ، ولم يكن له ذلك ،فأما تكذيبه اياي ، فقولهُ : لن يعيدني كما بدأني ، وليس اول الخلق بأهون على من اعادته ، واماشتمه اياي فقولهُ : اتخذالله ولداً وانا الاحد الصمد ، لم الد ولم أولد،ولم يكن لي كفواً أحد) رواه البخارى في صحيحه(١)

## ( ئەوكەسانە ی كە خودا بە درۆ دەخەنەوەو جنێو بە خودای گەورە دەدەن)

لەباوكی هورەیرەوە رەزای خودای لێ بێ ولەپێغەمبەرەوە :( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی : خودای گەورە فەرموویەتی نەوەی ئادەم بەدرۆم دەخاتەوەو ئەوەش لەسنوورو شیاوی ئەو نی یە ، بەقسەی خراپ جنێوم پێ دەدات وئەمەشی بۆ نی یە ((فاما تكذيبه اياي ،فقوله لن يعيدني كما بدأني)) درۆخستنەوەكەی ئەوبۆ من ، ئەوەیە كەدەڵێت خودا ناتوانێ زیندووم كاتەوە لەپاش مردن وەك چۆن بۆیەكەم جاردروستی كردم . ((وليس اول الخلق بأهون علي من اعادته)) خوداش دەفەرمووێت ((یەكەم دروست كردنم ئاسانترنی یە لەوەی كەمن دووبارە بیگێڕمەوە )) مەبەس ئەوەیە گێڕانەوەی ژیان ئاسانترە لەوەی كەلەبنەڕەتدا بەبێ هیچ ولەسەر هیچ دروست بكرێت (( واما شتمه اياى )) قسەپێوتنەكەی بەمن ((فقوله :اتخدالله ولداً)) ئەو ووتنەیەتی كەدەڵێت كەخودا كوڕی بۆخۆی داناوەو دەوێت ((وانا الاحد الصمد)) من

---

١) أخرجه الامام البخارى في صحيحه في كتاب التوحيد –باب:ماينكر في الذات ، والنعوت ، وأسامى الله. وأيضاً في كتاب التوحيد-باب :ولقد سبقت كلمتنا لعبادنا المرسلين. وايضاً في كتاب بدء الخلق – باب ماجاء في قول الله تعالى وهوالذى يبدأ الخلق ثم يعيده) واخرجه مسلم في كتاب التوبة-باب :في سعة رحمة الله تعالى برقم ((١٤(٢٧٥١) واخرجه النسائي في كتاب الغوت –باب لرحمة والعضب برقم ((٧٧٥٠)) واخرجه الترمذي في ايواب الدعوات-باب :خلق الله مأة رحمة رقم ((٣٥٥٤٣)).

تاك وتەنها بەجێ هێنەری هەموو داواكاریەكی خەڵكیم ((لم الد)) خۆم نەبووم لەهیچ كەس ((ولم أولد)) كەسیشم لێ نابێ ونەبووە ؛ ((ولم یكن لی كفواً احد)) هیچ هاو وێنەو هاوشێوازم نی یە ونەبووە ونابێ ))

## (گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)

(١) گەورەترین تاوانە ئەگەر كەسێك واگومان ببات خودا ی گەورە زیندوو كردنەوە وگەڕانەوەی دروونەكانلە پاش مردنیان كارێكی سەخت وزەحمەتە بەلای خوداوە ئەم كارەش وەك ئەوەوایە كەبڵێت خودا درۆدەكات كاتێ كەدەفەرمووێت من دەتوانم وئاسانترە گەڕانەوەو زیندوو بوونەوە لەوەی كە یەكەم جار دروستم كردوون.

(٢) گەی ورەترین قسەپێوتن وجنێودانە كاتێ بووترێت خودا كوڕی هەیە پەنابەخودا وەك ئەوەوایە ئاسمان پارچە پارچەبێت لەگەورەیی ئەوجۆرە تاوانە وەك لە قورئان دە فە رمووێت: (( {تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا }٩٠ {أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا {91}وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا }٩٢ { إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا }٩٣ {لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا }٩٤ {وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا }٩٥{ )سورة مريم الآية

(٣) گەرەترین سیفەت بۆخودای گەورە كەبۆخۆی هەڵی بژاردووە تاك وتەنهایی وبێ وێنەوبێ هاوشێوە وبێ هاوسەری یەئەمەش ئەوپەڕی خودایەتی خودادەگەیەنێ كەپێوستی بەهیچ یەك لەمانەنی یە بەڵكو هەموو بوونەوەرو دروست كراوەكان پێویستیان بەخودا هەیە .

(٤) داهێنان ئەگەر زەحمەت نە بێ بەلای خوداوە دووبارە دروست كردنەوە ئاسانترە ، بەلاَم خودای گەورە وەك نمونە بۆمرۆڤی دەهێنێتەوە بۆئەوەی دیاربێت و

بسەلێنێت کەگەڕانەوە زۆر ئاسانترە لەداهێنان بەڵام بۆخودا هەمووشتێك تەنها ووشەی ((كن)) ی دەوێ لەلایەن خوداوە یەكسەر دەبێ ((فیكون)). وەك لەقورئاندا هاتوو ((**إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ** ٨٢ سورة:يس)) الاية (٨٢).

(٥) ئەوانەی دەڵێن خودا خێزانی هەیە باوكی (عیسا)یان (عوزەیرە) هەموو دوای كڵاوی با بردوو كەوتوون خودا زۆر لەوە زیاترە كەپێویستی بەم جۆرە شتانە بێت.

(٦) خودا هەردەم زیندووە قەت مردنی بەسەر دانایەت .

(٧) هیچ خەوو وەنەوسە نایباتەوە سەرماو گەرماو وبرسێتی روو لەخودا ناكات .

(٨) هەرشتێك مرۆڤ گومانی بۆبروات كەهەوڵی ئەوەبدات وێنەی خودابكێشێ ئەوا هەڵەی كردووە چونكە خودا دەفەرمووێت :(( **لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ** ]١١[الشورى

خودا هیچ هاو وێنەی نی یە و خودا بیسەرەبەسە هەموو شتێكدا زانا ترینیشە بەسەر هەموو زانستەكاندا .

(٩) ئەگەر ئەتەوێ خودات لێ رازی بێ بەكورترین رێگە بگەیت بەرازی بوونی ئەوا ئەوەی خودا بۆخۆی داناوە وپێ ی خۆشە ئەوەی بۆ دابنێ ، ئەوەی خودا پێی ناخۆشە دووربە لێ ی ئینجا ئەم شتانە تەنها لەقورئان و لەپاشان بەروون كردنەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەبێت .

(١٠)ئەم سیفەتانە كەلەم فەرموودەی خودا دایە هەمان سیفەت سورەتی ئیخلاسە كە گەورەترین سورەتە لەقورئان لە وانە: ((خودا تەنهایە،لەكەس نەبوە،كەسیش لەئەونەبوە ونابێ،بەجێهێنەری هەموو ئاواتێكە،پێویستی بە كەس نیە هەموو كەس پێویستی بەئەو هەیە،هیچ هاوشێوەی نیە لە جوانی وتەواوی هێزو زانست گشت سیفەتەكانی تری خودای گەورە كە خودا خۆی بۆخۆی دایناوە یان لەسەرزمانی پێغەمبەر بەفەرموودەی راست بەئێمە گەیشتووە .

(١١)بەجێهێنانی سیفەتی الصبور بەرامبەر ئەوكەسانەی كەقسەو جنێو بەخودا دەدەن خودای گەورە بەدرۆدەخەنەوە بەڵام خودای هەردەرفەتیان دەدات.

> كێن كامەران وشادومانی راستەقینەنو وەك نەوە ی خاوەن هەموو دوونیابن؟
> ((هەر كەس لە ماڵی خۆی دڵنیا بێ لەلەش ولاری ساغ وپارێزراو بێت، خواردنی رۆژی هەبێت، وەك ئەوەی هەموو دونیای بە چوار چمك بە دەست گرتبێ وایە)) فەرموودەیە.

## ((ما جاءفي حسن الظن بالله تعالى))

عن ابي هريرة- رضي لله عنه-قال :قال النبي -(صلى الله عليه وسلم) (يقول الله تعالى : أنا عند ظن عبدي بي . وانا معه اذا ذكرني فان ذكرني في نفسه ، ذكرته في نفسي ،ان ذكرني في ملاء ذكرته في ملاء خير منهم وان تقرب الي بشبر تقربت اليه ذراعاً ، وان تقرب الي ذراعاً تقربتُ اليه باعاً وان اتاني يمشي ، أتيتهُ هرولة) . رواه البخاري (١)

**((ئەوفەرموودەیەی کەدەربارەی گومانی باش وچاك بەخودای گەورەبردن هاتووە))**

**٦)لەباوکی هوریرەوە -خودا لێ ی رازی بێ —دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی خودا دەفەرمووێت (انا عند ظن عبدي بي )من لە جێ ی گومانی بەندەکەم : ئەگەرگومانی باشم پێ ببات کە پەرستنەکاتی لێ وەردەگرم پاداشتی بەوپەڕی چاکەدەدەمەوە ولەتاوانی خۆش دەبم ، من لەجێی ئەوگومانە باشەی ئەودەبم ، بەڵام ئەگەر گومان وابیات کەلێ ی خۆش نابم وپەرستنەکانی لێ وەرناگرم ئەوامنیش بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەم ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تیادایە کەمرۆڤ لایەنی هیوای زیاتربێت لەسەر لایەنی ترسی لەخودای گەورە .هەندێ زانایان دەڵێن ئەم لایەنی گومان باشی یە بەوەی خودا لێت خۆش دەبێ تایبەتەبەکاتی نەخۆش و بەرەو دوا رۆژ چوون بێت .بەڵام پێش ئەوەی مرۆڤ نەخۆش بێ و لەکاتی لەش ساغی و تواناییدا ئەبێت مرۆڤ مام ناوەند بێت کردەوەی باش ئەنجام بدات و بپارێتەوە کەخودا بەخێری خۆی لێ ی وەرگرێت. بەڵام دەست بکات بەخراپە وخراپەکاری وبڵێت خودا لێ خۆشبووە بەردەوام بێت لەسەری ئەمەهیچ گومانی باش بەخودا بردن نی یە ((وانا معه اذا ذكرني))خودا دەفەرمووێت من لەگەڵی دەبم کاتێ کەیادم بکات(فاذا ذكرني في نفسه)**

---

**١-اخرجةالبخاري في كتاب التوحيد باب :مايذكرفي الذات والنعوت ، واسامى الله تعالى واخرجه مسلم في كتاب الذكروالدعاء والتوبة والااستغفار باب-الحديث على ذكر لله تعالى برقم :٢-(٧٥-٢٦)واخرجه امام احمد(٣٥٤/٢٥١/٢) واخرجه الترمذي وابن ماجة (٣٨٢٢) وغيرهم.**

ئەگەرلەدەروونی خۆیدا باسم بکات ویادم بکات ، منیش لە دەروونی خۆمدا یادی وباسی دەکەم .

((ان ذكرني في ملاء)) ئەگەر لەنا کۆڕو کۆمەڵگادا باسم بکات (ذكرته في ملاء خيرمنهم)ئەوایادی دەکەم لەکۆڕێك زۆر چاکتر وباشتر لەکۆڕی ئەو کەباسی منی لێ کردووە . (وان تقرب الي بشبر) ئەگەرخۆی لەمن نزیك بکاتەوە بەبستێك (تقربت اليه ذراعاً) ئەوا من بەباڵێك خۆم لەئەو نزیك دەکەمەوە (وان تقرب الى ذراعاً) ئەگەربەنیو باڵێك خۆی لەمن نزیك بکاتەوە (تقربت اليه باعاً)ئەوا من خۆمی لێ نزیك دەکەمەوە بەباڵێکی تەواوبە شانەوەدەگرێتەوە (وان اتاني يمشي)

ئەگەر بەرەومن بێت بەرۆیشتن (أتيته هرولة) ئەوامن بەهەنگاوی خێراتر بەرەو ئەودەچم )

## ((وتە و لێکدانەوەی زاناکان بۆئەم فەرموودەیە))

(وانا معه اذا ذكرني) ئەم شێوە لەگەڵ بوونە تایبەتی یە بەوکەسانەی کەپیاوو کەسی خودان ، بەواتا ئەوەی کەخودا دەفەرموێت من لەگەڵیم بەمیهرەبانی وکۆمەکی وسەرخستنی ورێنموویی وچاودێری وسەرپەرشتی ئەم لەگەڵ بوونە جیایە لەو لەگەڵ بوونە کە دەفەرموێت :((وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ))سورة الحديد:٤)

لێرەدا مەبەست بەم ((لەگەڵ بوونە)) بەزانینی وئەوەی کەهیچ لەکارو ووتەکانی مرۆڤەکان لەخودا وون نابێ .

((فان ذكرني))باسم بکات پیاما بڵێت ، وبەپاك و بێگەردیم وپیرۆزیم دانیان پیادابنێ بە نهێنی وکەس پێ ی نەزانێ (في نفسه) لەدڵ ودەروون وویژدانی خۆی منیش باسی ئەو دەکەم پاداشتی گەورە وتەواوی بەبەش دەکەم (في نفسي)لەدەروونی خۆما باسی دەکەم کەس لەم پەیوەندیەمان ئاگادار ناکەمەوە (وان ذكرني في ملا) ئەگەر لەناوخەڵکیدا باسم بکات ویادم بکات ولەگەورەییم بدوێ (ذكرته)پاداشتی دەدەمەوە وباسی دەکەم ولێی رازیبم (في ملاء منهم) لەناوکۆڕێك کەباشترە لەوکۆڕەی کەئەومنی تیادا باسکردووە کۆڕی فریشتەکانن کەلەمن نزیکن کەکۆڕێکە خودای گەورە لەگەڵەبێ

گومان هەرکۆڕێك خودای لەگەڵ بێ لەهەمووکۆڕەکانی تر باشترە لەبنەڕەتدا هەربەراوودی ناکرێت . ئەمەتائێرە ووتەی ((ابن حجر العسقلانی یە))

(وان تقرب الی بشبر) بە ئەوەندەو ئەندازەی بستێك بەرەولام بێت (تقربت الیە ذراعاً) ئەوامن بەئەندازەی باڵێك بەرەو ئەودێم (ذراع) لەزمانی عەرەبیدا بەباڵێك دەوترێ کەلە سەری پەنجەکانەوە دەست پێ دەکات هەتاسەرشانی .

(وان تقرب الي ذراعاً) ئەگەربەرەو من بێت بەئەندازەی باڵێك (تقربت الیە باعاً)ئەوامنیش بەئەندازەی باعێك بەرەو ئەودەڕۆم (باع) لەزمانی عەرەبیدا بەهەردوودەست دەڵێن کە هەردووشانەکانی لەگەڵ بێ بەپانایی سینگیشەوە .

(وان اتاني یمشي) ئەگەربەرەومن بێت بەرێ کردن و رۆیشتن (اتیتە هرولة) من بەراکردن وخێرای وتیژی وغاردان بەرەو ئەودەڕۆم .

واتای هەرچەندە نزیکم ببێتەوە بەچاکەکردن وگوێدانی بەفەرمانەکانم باکەمێکیش بێت ئەوامن پاداشتی زۆرو گەورەی دەدەمەوە ،بانەو بەهێواشی ولەسەرخۆیی بەرەوپەرستنەکانی من بێت بەخێرای وتیژی رۆزی وگەورەی پاداشتی نەبراوەیی دەدەمەوە .

## (( سێ تێبینی زۆر گرنگ))

**١) شێوازی نزیکبوونەوەو راکردنی خودای گەورە کەلەم فەرموودە پیرۆزەدا بۆخۆی دایناوەو فەرموویەتی** ، ئێمە بڕوامان پێ ی هەیە مادەم خودای گەورە بۆخۆی دایناوە بەلاّم دلّنیاین لەوە کەئێمە شێوازی نزیکبوون وڕاکردنی خودای گەورە بۆهیچ کەسێك نی یە بتوانێ وێنەی بکێشێ یان شێوەو شێوازو چۆنیەتی یەکەی دیاری بکات چونکە خودا بۆخۆی دیاری نەکردووە، بۆباوەڕداریش واباشە کەنەیباتە سەر هیچ شێوەو شێوازو چۆنیەتی یەك .

**٢) خودا ووشە (نفسی) بۆخۆی دانا هەرلەم فەرموودەدا خودا ئاشنامان دەکات بەسیفەتێك لەسیفەتەکانی ئەویش نەفسی خودایە** مادەم خودا خۆی بەخۆی بۆخۆی داناوە

ئێمەش بۆمان هەیەئەم سیفەتەی بۆدابنێین ((نفسي)) خودی خودا خۆی دەگرێتەوە زۆرئایەت فەرمووده ئەم لایەنە دووباره دەکەنەوە دەیسەلێنن خودا لەقورئاندا دەفەرمووێت : (**وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ** ]٢٨[)ال عمران (٢٩-٣٠)

بەلأم هاوشێوازو چۆن یەتی هیچ دروستکراوێکی ترنی یە وەك خودا دەفەرمووێت :(( لَيسَ كَمِثلِهِ شَيءٌوَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ ]١١[الشورى

**٣) سێ یەم تێ بینی: زانایانی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەم سیفەتانەی خودا. چۆن باس دەکەن ؟**

زانای بەناوبانگی ئەهلی ((سوننە وجەماعە)) ئیبن ئەلخوزەیمە- دەڵێ: لەپەڕتووکی ((كتاب التوحيد واثبات صفات الرب عزوجل)) :یەکەم کارێ کەدەستی پێ بکەین لەدەست پێکمان لەم پەڕتووکەماندا کەباس لەسیفەتەکانی خودامان دەکات باس کردنی (نفسهٰ) کەخودای گەورە بۆخۆی دایناوە (گەورەیی وبێ گەردی و بێ وێنەیی بۆخودامان لەوەی ئەگەر بەهیچ کەسێکی تر بچێت —لەکاتێکا کە لەوەش گەورەترە کەخۆی نەبێ وبێ نەفس بێ ... لەپاشاندا ئیمامی کوڕی خوزەیمە لەپەڕتووکەکەی (كتاب التوحيد واثبات صفات الرب) دا کۆمەڵە بەڵگەیەك لەقورئان وفەرموودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەهێنێتەوە بۆسەلماندنی ئەوەی کەخودا خاوەن (نفس) و بۆخۆی دایناوە وفەرمۆودەکانی پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) دووپاتی دەکاتەوە لەپاشاندا ((ابوبكر کوڕی خوزەیمە)) دەڵێت : خودای گەورە وپاك و بێگەرد سیفەتی (نفس)ە ی خۆی بۆخۆی داناوە لەزۆر لە ئایەتەکاندا ، بەهەمان شێوەش لەسەر زمانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەم سیفەتە دووپات دەکاتەوە لە چەندەها فەرموودەی جیاجیادا کەخودا خاوەن (نفسه)وەك چۆن خودا بۆخۆی داناوە لەقورئاندا ،بەڵام هەندێ گرۆو تاقم هەن بڕوایان بەم سیفەتە نی یە کەلەم ئایەتانە و فەرموودانا هاتووە لەو تاقمانە (پێ یان دەڵێن (جەهمیەکان) هەندێ لەنەزان ونەفامەکانیان واگومان دەبەن کەخودای گەورە- کاتێ ئەم وشەی ((نەفسە)) دەداتە پاڵی خۆی مەبەست وماناکەی بۆ دانە پاڵی خەڵکی یە ،واگومان دەبەن کەمەبەستی (نفسه) مەبەستی پێ ی

دەروون و نەفسی دروست کراوەکانە بێجگەلەخودا .. وەك چۆن دروست کراوەکانی تری دروست کردووە ((ئەبوو بەکری کوڕی خوزمیمە)) بۆ پەرچ دانەوەی ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە دەڵێت ئەم جۆرە باوەڕانە هیچ خاوەن هۆش وزانستێك هەرگومانیشی بۆناچێ : ج جاو چۆن بۆی هەیە دەری دەبڕێت . خودا ئێمەی فێرکردووە لەقورئانی پیرۆزدا (كَتَبَ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ) سوره الانعام :الایه (١١)

واتە:- خودا خۆی لەسەر خۆی میهرەبانی وسۆزی بەرامبەر دروست کراوەکانی بەپێویست لەسەر خۆی کردووە ، ئایا هیچ موسڵمانێك هەیە گومانی بۆئەوەبچێت کەخودا میهرەبانی لەسەر بێجگە لە خۆی فەرزو واجب کردووە بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ هەڵبژاردنیان هەبێت ؟. وەیان ئایەتی: ((وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ال عمران (٢٩-٣٠)واتە:- ((ئەی بەندەکان خودالەخۆیتان دەترسێنێ و ئاگادارتان دەکاتەوە لەوەی کەئێوە سەر پێچی ئەو بکەن لەهەرفەرمانێك کەبەسەری دا داوون)) ، ئایا رەواو دروستە بۆهیچ موسڵمانێك بڵێت : خودا مەبەستی لەم ئایەتە ئەوەیە خەڵکی دەترسێنێ بەبێجگە لەخۆی ؟ یان ووتەی خودای گەورە بگۆڕێ ولەجێ ی خۆی لایدا کاتێ خودای گەورە بە(موسی) دەفەرموێت (صلی الله علیه وسلم) ((وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي٤١) سورة طه الاية(٤١)

واتە: تۆم بۆخۆم دروست کردووە کەپەیامەکەم و وشەی من بەخەڵکی بگەیەنێ.ئەمە بگۆڕیت و بڵێت : ماناو واتاکەی ئەوەیە تۆم بۆخەڵکی تر دروست کردووە بۆئەوەی پەیام و ووشەی خەڵکی بگەیەنی .

یان دەکرێ بووترێ کاتێ خودا دەفەرمووێت بە (عیسا) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کاتێ دەفەرمووێت: (تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ)سوره المائده الایه (١١٦)

واتە: ئەی خودایە من نازانم چی لەتۆ دایە ، بگۆڕری و بووترێ مەبەستی: ئەوەیە نازانم چی لەخەڵکیدایە ؟ لەکاتێکا کە خودا خۆی ئاگاداری (عیسا)کردبووەوە لەوەی کەئەوان چی دەکەن چی ناکەن . !؟

بێ گومان ئەم بیرو باوەڕە هیچ موسڵمانێك بۆی ناچێت ، هەرکەسێکیش ئەم جۆرە بڕوایەی هەبێ ئەوا دارمێنەری سیفەتەکانی خودایە بۆیە پێ ی کافردەبێت ئەگەر تەوبەنەکات . (ووتەی ابن خزیمە )

ئەم فەرمووده قودسیەو زۆرەها فەرموودەی تری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)و چەندەها ئایەت، سیفەتەکان بۆ خودا دادەنێن ، فەرموودەی راست و ڕەوان کەبەپەسەندیان زانیوە زانایانی وەك ئیمامی ((بوخاری وموسلم مالك وشافیعی وئەحمد)) و هتد....

کەپێویستە لەسەرئێمەی باوەڕدارو موسڵمان باوەڕی پێ بهێنین ، بەئەوەش کەپێ ی هاتووە و تیایدایەتی ، بەڵام ئەوەی جێی ئاماژە وسەرنجە ئەوەیە مرۆڤ نابێ لەخەیاڵی خۆیدا وێنەو هاوشێوە بۆ هیچ سیفەتێك دابنێ ونەشڵێ چۆن ؟

ئابەم شێوە بیروباوەڕی یاوەران وشوێن کەوتوان وزانایانی ئەم ئومەتە لەسەری چوون وەك سوفیانی کوڕی عویەیینە و عەبدوالله کوڕی موبارك وسەرجەم زانایانی تری ئەم بوارە ، کەهەموویان دەفەرموون بۆئەم فەرموودەو ئایەتانە ((وەك خۆی بیڕوێنن وبەسەری دابچن بەبێ ئەوەی بڵێن چۆن وبۆچی ، بەهەمان شێوە کەسانی تری سوننەوجەماعەت هەمان باوەڕ باوەڕیان بووە ، وەك چۆن پێویستە قسەکار و ووتە بێژو ووتار خوێن بەهیچ شێوەیەك ئاماژەو پەنجەنەکێشێ بۆ (چاو ودەست وپێ )و سیفەتەکانی تری خودای گەورە کاتێ لێیان دەدوێتن و روونیان دەکاتەوە بۆخەڵکی ، چونکە ئەم ئاماژەو پەنجە بۆ راکێشانە حەرامەو قەدەغەیە .

وتەی (محمود توفیق الحکیم )

***((گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان))***

١) خودای گەورە فێرمان دەکات هەردەم بەهیواو گەش بین بین بەرامبەر خودای گەورە کاتێك پەرستێك ئەنجام دەدەین پێویستە زۆربەرێکو پێکی ئەنجامی بدەین ودڵنیابین لەوەی خودا لێمان وەردەگرێت وزۆر بەباشتریش پاداشتمان دەداتەوە .

٢) ئەگەر حەزئەکەیت خودا هەردەم تۆی لەیاد بێت و پشت وپەنات بگرێت هەردەم لەیادی خودا دابە .

٣) ئەگەر باوەڕدار دەیەوێ خودا بەفریشتەکانی بناسێنێ وبەتایبەت بەجبریل. بەمیکال وئیسرافیل ئەوا لەناو کورو کۆمەڵدا باس لەیادو گەورەیی ومیهرەبانی و سۆزی خودابکات .

٤) بچوکترین کاری ووتەی خێر لای خودا ووتا نابێت .

٥)با ئێمەچاکەمان کەمێکیش بێت خودا بۆمان زۆردەکات،پاداشتیزۆرگەورەتریشمان لەو کارەی خۆمان زیاتر دەدداتەوە .

٦) بەئاسانترین وگەورەترین کار کەبتەوێ پێ ی بگەیت بەخوا پەرستنەکانیەتی وبەتایبەت یادو زیکریەتی .

٧) خودا لەهەمووکەس نزیك دەبێتەوە بەپێ ی پەرستنەکانی ... نەك لەبەر ئەوەی کوڕی کێ یە یان کچی کێ یە یان دەوڵەمەندە یان جوانە هتد ..

٨) بڕوابەهەرسیفەتێك بهێنی کەخودا بۆخۆی داناوە پێ ی ئاشناببەو لەخودای گەورە بپارێرەوە بەوسیفەتانە کەناوی جوان وسیفەتی بەرزی بێ وێنەی خودان .

٩) بیروباوەڕی پێغەمبەر ویاران وشوێن کەوتوان و زانایان :ئەوەیە باوەڕ بەهەمووسیفەتێك بهێنێ کەخوداو پێغەمبەر(صلی الله علیەوسلم) دووپاتیان کردووەتەوە .

١٠) بێ هۆكار نیە خودا ئاشنامان دەكات بەناوو سیفەتەكانی بەڵكو ئەوپەڕی ڕەزامەندی خودای تیادایە .

١١) بەلاَم سیفەت وناوەكانی خودا نەخەینە بەر هۆش وهزر چونكە هۆش وهزرو زانستی مرۆڤ سنورداره بەلاَم هەرسیفەتێكی خودا بێ سنووره .

١٢) چۆنیەتی لەسیفەتەكانی خودا ئێمە وهیچ كەسێكیتر دەركی پێ ناكەین وەك دەفەرموێت :(( {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ ١٠٣} سورة الانعام الايه١٠٣

واتە(( له توانای هیچ چاوانێكدا نیە بتوانێ خودای گەوره ببینێ)).

١٣) ئەگەر ئێمە بڕوا بە سیفەتەكانی خودای گەوره بهێنین بەبێ چەندو چۆن ئەوا بەدڵنیاییەوه دەڵێم:

( لەبەهەشتا گەوره ترین خۆشیمان شادبوونمانە بە پەروەرگارمان) .

كێن كامەران وشادومانی ڕاستەقینەو خاوەن هەردوو ژیانن؟!

( ئەوانەن لەبەهەشتدا خۆشی وشادبوونمانی هەره گەوره بەبە بەهرەی بێ وێنە سەرفەراز دەبن ؛ كەئەویش ڕوانینە و لەزەت وەگرتنە لە گەورەیی و جوانی و تەواوی خودای گەورەی پەروەرگارمان) .

(عقوبة من يعادي اولياء الله ، وحب الله لاوليائه ، وافضل مايتقرب به)

عن ابى هريره رضى الله قال قال رسوالله -(صلى الله عليه وسلم) : (ان الله -عزوجل-قال : من عادى لي ولياً ، فقد آذنته بالحرب ، وماتقرب الى عبدي بشيء أحب الى مما افترضته عليه ، وما يزال عبدي يتقرب الى بالنوافل حتى أحبه فاذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به وبصره الذي يبصربه ، ويده التي يبطش بها ورجله التي يمشي بها ،وان سئالني لاعطينه ، ولئن استعاذني لاعيذنه ، وما ترددت عن شيء انافاعله ترددي عن نفس عبدي المؤمن ،يكره الموت ،وانا اكره مساء ته )) رواه البخاري في صحيحه (١)

دەروازەی((باس لەتۆڵەی خودا دەكات بۆكەسانێك كەدژایەتی پیاوان وكەسانی بۆخودا جۆر بوو دەكەن بۆبەندە لەبۆنەوجۆر بوو : باس لەوەش دەكات باشترین پەرستن چی یە تۆخۆتی لەخودایێ نزیك بكەیتەوە ))

لەباوكی هوریرەوە خوداێ رازی بێ دەڵێت :پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی خودای گەورە فەرموویەتی ((من عادى لي ولياً)) هەركەسێ دووژمنایەتی و ئازاری كەسانی بۆمن گونجاوو جۆرو سوڵحاو بدات . ((فقد آذنته بالحرب )) ئەوا بەراستی من ڕاگەیاندن وئاشكرا كردنی جەنگی لەگەڵ بەرپادەكەم . ((وما تقرب الى عبدي بشيء أحب الى مما افتر ضته عليه )) بەهیچ شتێك بەندەكەم لەمن نزیك نابێتەوە خۆشتر بێت لام وەك ئەوەی كەلەسەر ئەوم فەرز كردووە . ((ومايزال عبد يتقرب الى بالنوافل حتى احبه )) بەردەوام بەندەكەم لێم نزیك دەبێتەوە بەئەنجام دانی كارە سونتەتەكان هەتا وای لێ دێت دەبێتە خۆشەویستم ، ((فاذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به))

---

(١) أخرجه البخاري في كتاب الرفق-باب التواضع ج٨ ص١٠٥ من باب التواضع وغيره وانظر السلسلة الاحاديث لصمدية للشيخ الالبانى برقم (١٦٤٠) وينظر ايضاً صحيح الجامع لصخير (١٧٨٢) وقبله في كتاب الاسماء والصفات اص ١٤١٩)

ئەگەرگەیشتەئەوئاستەی کەخۆشم بوێ خۆم دەبمە ئەو گوێ یەی کەپێ ی دەبیستێ ((وبصره الذی یبصربه))خۆم دەبمە ئەو چاوە کەپێ ی دەبینێ ((ویده التی یبطش به)) خۆم دەبمە ئەو دەستەی کە شتەکانی پێ لەئامێزدەگرێ ((ورجله التي یمشي بها)) ئەوپێ یەش کەهەنگاوی پێ هەڵ ئەنێ((وان سألني لاعطینه)) ئەگەر لێم بپاڕێتەوە بەدڵنیایی وە پێ ی دەبەخشم ((ولئن إستعاذني لاعیذنه))ئەگەر پەنام پێ ببات بەدڵنیاییەوە پەنادەری دەبم ((وما ترددت عن شیء انافاعله))بۆهیچ شتێك کەکردبێتم وبیکەم((ترددی عن نفس عبدي الموءمن))لە هیچ شتێك فەرمانم نیە بەشتێك کە ئەنجام بدرێت لەهەمان کاتدا حەزنەکەم ئەوکارە بەجێبهێنرێت وەك ئەوەی لەرۆح کێشانی بەندەی باوەڕدارم)) ((یکره الموت)) چونکە ئەو مردنی پێ خۆش نی یە ((وانا اکره مساء ته )) منیش نامەوێ دڵی ئەو ناخۆش کەم .

## ((لێکدانەوەی زاناکان))

((من عادی لی ولیا))واتای (**ولی**) **بە**((**فعیل**)) **هاتووە بەواتای** ((**مەفعول**)) دێت واتابەکەسێك دەوترێ کەخۆی وفەرمانەکانی هەمووی بەتێکرا بداتە دەستی خودا هەمووهیواو ئاوات ومەبەستی تەنهاخودابێ: هەرکەس ئەمەزمان حاڵی بێ ئەوا بادڵنیابێ کەخودا پشت وپەنادەریەتی وەك خودا دەفەرموویێت :((**وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ** ﴿١٩٦﴾)) (الاعراف:١٩٦)

واتە :- ((خوداپشت وپەنای مرۆڤی چاك دەگرێت )).

تەنانەت بۆچرکەیەکیش بێت خودا نایداتەوە دەستی خۆی ، بەڵکو خودای گەورە خۆی بەخودی خۆی چاودێری دەکات ((ئەمە واتای یەکەم)) .

**واتای دووەم**: ((**فعیلة**)) بەواتای لەزۆر وپرکارەوە دێت کەخودای گەورەیە کەواتە واتاکەی بەوەدێت خودا خۆی بەخۆی دەبێتە پشت وپەنادەر بۆکەسانی خوداویست لەپەرستنەکانی وگوێرایەڵی کردنی ، بەم شێوەیەبێت هەردەم فەرمان رەوای خودای گەورە دەبێت وپچڕانی تیادانابێت وبەردەوام دەبێت .

بەپێ ی هەردوو واتاکەی کەپێویست بوونە بۆئەوەی بەندە ببێتە کەس گونجاو وسوڵحاو بۆ خودا بەپێ ی ئەنجام دان و هەستانی بەئەو پێویستیانەی کەلەسەریەتی لەلایەن خوداوە کەبەردەوام وبێ بچڕان دەمێنێتەوە لەسەری ، بەهەمان شێوەش خودا ئەودەپارێزی لەخراپە کردنی لەخۆشی و ناخۆشیدا .

## ((مەرجەکانی پیاوو و کەسانی گونجاوو جوراو بۆخودا))

**یەکەم**:- خودای گەورە لە سەرخۆی فەرز کردووە نموونەیان بپارێزێ و هەردەم لەناوخەڵك دابمێنن بۆ ئەوەی خەڵکانی تر چاویان لێ بکەن بۆکردەوەو ووتەی چاك.وەك پێغەمبەران و (صلی الله علیهم وسلم )وشوێن کەوتوانی وپیاوچاکان.

**دووەم** :- ئەبێت خودا ناس بێت لەخۆشی و ناخۆشیدا بەردەوام بێت لەسەر رێگەی راست وەك چۆن پێغەمبەران پارێزراوون لەتاوان وبێ هەڵەن ئەوانیش لایەنی نزیك بوونەوەو لەخودا ترسیان زیاترە .

ئیمامی( قوشەیری) دەڵێت : مەبەست لەپاراستنی کەسانی بۆخودا سوڵحاوو گونجاو ئەوەیە کەخودا دەیان پارێزێ لەوەی کە بەردەوام نابێت لەسەر هیچ گوناهو تاوانێك کاتێ هەڵەیەك دەکەن هەرزوو خێرا خودا پەشیمان بوونەوەی دەخاتە دڵی یەوەو دەگەڕێتەوە بۆیە ئەم جۆرە هەڵەیە ئەگەر هەیە لەکەسانی خودا ویست بۆئەوەی جیاببنەوە پێغەمبەران (صلی الله علیە وسلم) چونکەتەنها ئەوان پارێزراوون ((فقد آذنته)) (هەمزە)و (ئەلفەك)ە درێژە لەسەر (ذال)ەکەش (فەتحە) هەیە بەلاَم (نوون)ەکە (سکون) دارە بەواتا ئەوەدێت کەخودا ئاگاداری دەکاتەوە لەشەڕ کردن لەگەڵی کەواتە دووژمن چی بەدوژمن بهێنێ لەئازارو زەرەر گەیاندن هتد مەبەست ئەوەیە ئەو پەڕی ترسی دەخاتە دڵ چاوەڕوانی هەموو ناخۆشی یەك بێت لەهەرکەوێ هەبێ خودا لەرەسەدی گرتووە بێ هەرکەسێك خودا لەرەسەدو تیری بگرێت بەدڵنیاییەوە لەناوبردن و لەناو چوونی مسۆگەرە لەهەرکوێ هەبێ .((زانا ئەلفاکهانی)) دەڵێت : ئەمە ئەوپەڕی

رەوانبێژی یە ، چونکە هەرکەسێ رقی لەکەسێك ببێتەوە کەخودا خۆشی بوێت خودالێ ی لەسەری بەوەلاّم دێت هەرکەسێکیش خودا لەسەری بەوەلاّم بێت ئەوا بێ گۆمان خودا دژایەتی کردن دوژمنانی دۆستانی خۆی دەکات ، هەرکەسێکی خودا دوژمنایەتی بکات ئەوا بە دڵنیایی یەوە تێك وپێکی دەشکێنێت بەهیچ شێوەیەك دەرباز بوون ورزگاربوونی نیە.

ئەگەر سەڵمێنرا بۆئەوکەسەی کەدژایەتی و ئازاری دۆستانی خودا دەدات ، بەپێچەوانەش دەسەلمێنرێ کەئەویش ئەوەیە هەرکەسێ دۆستان وکەسانی بۆخودا سوڵحاوو گونجاوی خۆش بوێ ئەوابێ گۆمان خودایش رێز لەئەودەنێت بەهۆی خۆش ویستن و رێزلێنانی بۆوەلی یەکان وکەسانی گونجاو بۆخودا ی گەورە.

((ووتەی ئەلفاکهانی))

((وما يتقرب الى عبدي بشيء أحب الى مما افترضته عليه )) بەهیچ شتێك لام خۆشترنی یە لەوەی کەبەندە خۆی لەمن نزیك بکاتەوە بەو ئەرك و پێویستانەی کەلەسەرم پێوست و بەئەرك خستووە لەسەری وەك ووتنی هەردوو شەهادە ونوێژ کردن و رۆژوو گرتن حەج کردنی ماڵی خودا وپەرستنەکانی تر . خودای گەورە زۆری پێ خۆشە کەبەندەکانی لەپەرستنە فەرزەکان ئامادەباش بن تەنانەت هیچ شتێك لەوە خۆشترنی یە بەلای خوداوە لەپاش ئەوەی کەمرۆڤ بەنزیکترین پەرستنەکانی فەرزەکان لەخودا نزیك دەبێتەوە، نۆبەی پەرستنەسونتەکان دێت کاریگەریان بۆوەدەست هێنانی خۆشەویستی خودا.((وما يزال عبدي يتقرب الى بالنوافل حتى احبه)) واتە، بەردەوامی بەندە لەمن نزیك دەبێتەوە هەتاوای لێ دێت دەبێتە خۆشەویستی من و خۆشم بوێ ئەمەش بەهۆی ئەنجام دانی و هەستانی و کردنی بۆهەر سونتەتێك بێجگەلەفەرزەکان کەواتەپردی پەیوەندی نێوان خوداو بەندە بەجێ بەجێ کردنی هەرسونەتێك کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێ ی هاتووە توند وتۆڵ ونەپساوە تربێت . تەنانەت ئەوەندە پەیوەندیەکە بەهێزدەبێت هەتاوای لێ دێت ئاشنایی تەواو دەکەوێتە نێوان بەندەو خودای گەورە ئاشنایی کەی وای لێ دێت کەخۆشەویستی دەکەوێتە نێوانیان ئەم

حاڵەت وکاتە ئەوپەڕی پەیوەندی نێوان بەندەو دروست کاریەتی لەپاشان هەمووخۆشیەکان روو لەمرۆڤ دەکات تەنانەت هەرناخۆشیەکیش رووبدات لەبەندە هەرقوبووڵی دەکات زۆربەخۆش حاڵی یە وە پێ ی پەسەندە چونکە شیرینی خۆشەویستی خوداو رەزامەندی ئەوی چەشتووە وناسیوە ئەمەلەلایەی کارگەریەکانی بۆمرۆڤ . بەڵام خۆشەویستی یەکە لەلایەن خوداوە بۆبەندە دەگاتە ئەوپایەی کەئەندامەکانی بەندە هەموو بەچاودێری و سەرپەرشتی و پشت گرتنی و سەرکەوتنی لە هەمووکاتێك وشوێنێکدا قەت وهەرگیز پشتی بەرناداو نایداتە دەستی خۆی تەناتەت پەیوەندی کەیەکسەروبێ نێوان دەبێت لەنێوان خوداوبەندە دا بەوەی ((وان سألني لا عطینە)) ئەگەرداوایەك بکات پێی دەبەخشم ((ولئن استعاذني لاعيدنە)) ئەگەر پەنایشم بۆ بێنێت یەکسەر ولەجێ پەنای دەدەم.

لەمانەش هەمووزیاتر وباشتر خودا خۆشی بەخۆشی یەکانی بەندەدێت هەرخۆشی یەك کە(بەندە)لای ئەوخۆش بێت بەلای خوداشەوە خۆش دەبێت هەرشتیك بەلای (بەندە)وە باش نە بێت ئەوا بەلای خودای گەورە وەناخۆش دەبێ تەنانەت کەمردن بەسەر دڵی بەندەوە ناخۆشە خودایش نایەوێ دڵی بەندەکەی بشکێنێ بۆیە خودا دەفەرمووێت ((وما ترددت عن شيء انا فاعلە ترددی عن نفس عبدی المؤمن)) واتە: من لەهیچ شتێ هەنگاو هەڵ نانێم بۆهەر کارێك ووتم وفەرمانم بۆهەر شتێك دابێ بیرلەدەرئەنجامی ناکەمەوە وەك ئەوەی بیر لەفەرمانی رۆح کێشانی (بەندە)کەم دەکەمەوە ((یکرە الموت)) چونکە ئەوحەزی بەمردن نی یە حەزدەکات بژی بۆئەنجامدانی کاری باش وچاك بۆزیاتر رازیبونی من ، خۆش ویستنی بۆ خۆشیەکانی دونیا کە بۆئەووم حەڵاڵ کردووە ((وانا اکرە مساء تە)) واتە خودا دەفەرمووێت حەزناکەم دڵی بشکێنم و رۆحی بشکێنم ((وما ترددت عن شيء انا فاعلە ، عن نفس المؤمن)) مە بەست لەومیەکاتێ خودا فریشتەی بەرپرس لەمردن دەنێرێ بۆرۆح کێشانی (بەندە)یەك لە(بەندە) باوەڕدارەکانی خودا مردنی (بەندە) پەڕینەوە لەپردێك و چارەسەری کاتی داناوە بۆگەیشتنی باوەڕداربە بەهەشت ورازی بوونی گەورەترە بەڵام

لەهەمان کاتدا (کەسە)باوەڕدارەکە حەزی بەمردن نایە چونکەسروشتی مرۆڤ وایە حەزی لەژیانە نەك لەمردن خودا ئەم حەزبوونەی باوەڕداری لاگرنگە وانایەوێ دڵی بشکێنێ: بۆیە خودای گەورە لەنێوان ئەوەی کەخۆی نووسیویەتی کەهەمووکەس ئەبێ مردنی بەسەربێت ومردن بچێژێ: ((١٨٤ {كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ ))سورةال عمران.

لەنێوان ئەوەی کەنووسیویەتی مرۆڤی باوەڕداری خۆش بوێ بەهۆی ئەنجام دانی سوننەتەکان وکاتێکیش (باوەڕدار) گەیشتە ئاستی ئەم خۆشەویستی یە خودای گەورە لە هیچ شتێك حەزناکات دڵی باوەڕدار بشکێنێ بۆیەخودای گەورە لەم نێوانە فەرمانێك دەدات بەرۆح کێشان و فەرمانێکیش دەدات بەدڵراگرتن ودڵ نەئێشانی مرۆڤی باوەڕدار بۆیە فریشتەی بەرپرس بەرۆح کێشان نازانێ کام فەرمانی خودای گەورە بەجێ بهێنێ ئەوەی کەهەموو کەس ئەبێت بمرێت ؟! یان ئەوەی کە نابێ دڵ ئێشان وئازاری دڵی (باوەڕدار) بدرێ لەبۆ رۆح کێشانی چونکە بە هەمان شێوە فەرمانی خودا ی گەورە هەیە بەراگرتنی دڵی (باوەڕدار) نموونەی ئەمەش زۆر چاك وجوان دیارە کاتێ پێغەمبەران (صلى الله عليهم وسلم) مردن دەخرێتە بەر ئیختیاری خۆیان )) چونکە خودا ی گەورە نایەوێ دڵیان رانەگیرێ بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت ((عبد من العباد خيربين الموت والحياة فاختار ماعند الله)) واتە((بەندەیەك لەبەندەکانی خودا مردن خرایە سەر ئیختیاری خۆی لەنێوان مردن ونەوەی لای خودا ی گەورە هەیە ئەوەی هەڵبژاردووە بەسەرمان و نەمردنی کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم فەرموودەیە فەرموو ((ئەبووبەکری- صدیق-))کە گوێ ی لێ بووباش تێگەیشت لەمەبەست پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)کە خۆیەتی بۆیە دەستی بە گریان کردوو ووتی بەدایك وباوکەوە بەقوربانت دەبین.

یارانی تربەلایانەوە سەیر بوو (ئەبووبەکر) بۆچی وادەڵێت بۆیە خۆیان دەڵێن ((ئەبووبەکر)) لەئێمە شارەزا تربوو لەتێگەیشتنی بۆفەرموودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بۆیە لەکاتی نەخۆشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دا کەنەخۆشی

مردن ومالّ ئاوایی وكۆچ كردنی بوو فەرمووی ((الى الرفيق الاعلى ، الى الرفيق ألأعلى ))
(١) واتە:- ((بۆلای خودا بۆلای خودا)) كۆچی دووایی كرد. یان كاتێ فریشتەی بەرپرس
لەمردنی پێغەمبەر (موسا) .صلى الله عليه وسلم هاتە خزمەتی، لێ ی پرسی تۆكێی ؟
ووتی من بۆرۆح كێشانی تۆهاتووم (موسا)ش (مستێك)ی لە(چاو)ی داو بۆیە (فریشتە)
سكالأی بردووە بۆلای (خودا) ووتی ئەی خودایە تۆمن دەنێری بۆلای كەسێك كەمردنی
ناوێ !؛ چونكە ئەم فریشتە ئاگاداری فەرمانی خودایە كە مردنی پێغەمبەران (صلى الله
عليه وسلم) لەئیختیاری خۆیانە یان رۆح كێشانی بەفەرمانی خودایە، دلّ نەئێشانی
پێغەمبەرانیش هەرفەرمانی خودایە بۆیە خودا جارێكی تر
ناردی یەوە بۆئەوەی چەندی دەوێ لەژیان بۆخۆی هەڵی بژێرێ بۆیە (موساش)
فەرمووی ئەی دوا ئەو هەڵبژاردنە چی دێت ووتی هەر مردن دێت بۆیە
(موسا)پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ((دەباهەر ئێستابێت ئەمردنە كە
ئەبێت هەمووومان بیچێژین)) . (٢)

تێبینیەكی زۆر گرنگ : كاتێ خودا ی گەورە دەفەرموێت ((كاتێ خۆشم ویست
دەبمە ئەوگوێیەی كەپێ ی دەبیستێ و ئەوچاوەی كەپێ ی دەبینێ ، ئەودەستەی پێ ی
دەست دەكێشێ ئەوپێ یەی كەهەنگاوی پێ هەلّ ئەنێ)) واتای ئەوە دەگرێتەوە كەئەو
خۆشەویستەم چاودێری دەكەم كەتەنهابیستنی لەووتەی من بێت، كەئەو خۆشەویستەم
چاودێری دەكەم كەتەنهابیستنی لەووتەی من بێت، لەزەت وتام تەنها لەخوێندنەوەی
ووتەی من دەكات، ئاشت بوونی تەنها بەچرپە وسكالأو نوزانەوە دەربڕینی حالّی دێت
بۆمن ، تێ روانینە كانی تەنها لەدەسەلأت وشوێنە واریەكانی من دێت سوودوپەندی لێ

---

(١) صحيح البخارى ، باب : ((مرض النبي (صلى الله عليه وسلم).

٢) اخرجه البخارى في كتاب احاديث الانبياء –باب : (واذ قال موسى لقومه ان الله يأمركم ان تذبحوا بقرة...)) الاية سورة البقرة. واخرجه مسلم في كتاب الفضائل –باب :من فضائل موسى (صلى الله عليه وسلم) برقم (١٥٧-٢٣٧٢). واخرجه احمد (٢-٢٦٩). والنسائى في الصغر في كتاب الجنائز –باب :في القرية :برقم (٢٠٨٩)

وەردەگرێت دەست کێشان ودەست درێژی کردنەکەی تەنها بۆ شتێك دەبێ کەمن پێ ی رازی بم ، بەهەمان شێوەیە پێ یەکانی هەنگاوهەڵ نانێ ئەگەربۆ شتێك نەبێ کەرازی بوونی منی تیادابێ. ((ئەمە هەمووی ووتەی فاکهانی )) یە .

((شێخ عەللامە قوتبەدین ئەل قەستەلانی)) پەرتووکێکی خۆشی هەیە بۆپەرچ دانەوەی ئەو جۆرە کەسانەی کەوا گومان دەبەن خودا تێکەڵ (بەندە)و دروست کراوەکانی دەبێت و ئەبێت کەلەو پەرتووکەدا ئەوە روون دەکاتەوە ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە هەڵەن و ناگونجێ کەمرۆڤ لەسەر ئەوجۆر بیرو باوەڕانە بێت .

***((بە بۆچوونی منیش ئامادەکاری پێویست بەمیهرەبانی و چاودێری خودا لەهەموو کاتێکدا دەڵێم)):-***

لەوانەیە: خودا ئەوەندە خۆشەویستی یەکەی بکەوێتە نێوان ئەو خۆشەویستەکەی کەئەگەر هەڵەش بکات خودا لێ ی دەپۆشێ لەبەر ئەوەی ئەوەندەی چاکەوپەرستن هەیە نووقمی هەر جۆرە خراپەو لادانێك کەبە هۆی ئەندامێك لەئەندامەکانی بکات یەکسەرخودای گەورە بیشارێتەوە لەبەراووردی چاکەکانی تر **بەڵگەشم دووبەڵگەیە** :

**بەڵگەی یەکەم** :- کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت ((لەوانەیە خودای گەورە بەکسانی (بەدر)ی فەرمووبێت: ((اعملو ماشئتم قد غفرت لكم )) (١) ((ئێوە چی دەکەن دەکەن من لێتان خۆش بووم )) با ئەمە تایبەتیش بێت بە( بەدر)ی یەکان چ بەربەستێك هەیە لەوەی لە مرۆڤ ئەگەر چاکەی زۆر بێت خواد لە گوناهەکانی خۆش بێت کە دەفەرموێت :((إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ{114} )) . سورة هود الآية ( )

---

(١) اخرجه البخاري في صحيحه كتاب المغازي ابواب ((فيمن شهر بدراً))

**بەڵگەی دووەم** : ئەو فەرموودەی پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت مرۆڤ هەر لە چاکە کردندا دەبێت هەتا دڵی وەك وەك کەرستەیەکی خاوێنی لێ دێ لە هیچ تاوانێك ڕێی خۆی نادۆزێتەوە بۆ دڵی و هیچ تاوانێك زیان بە دڵی ناگەیەنێ.
(يكره الموت) مردنی پێ ناخۆشە چونکە ئازاری زۆر قورسی تێدایە (وانا اكره مساء ته) منیش پێم ناخۆشە دڵی بشکێنم ((جونەیدی بەغدادی)) دەڵێت ناخۆش و حەزنەبوونی خودا لە مردنی باوەڕدار ئەوەیە چونکە ئازاری قورسە ، واتای ئەوە نی یە کە خودا مردنی بۆ ئەوی پێ ناخۆشە ، چونکە هەربە ئەو مردنەیە مرۆڤی باوەڕدار دەگاتە ئەوپەڕی میهرەبانی و لێ خۆشبوویی بەهەشت و شادبوون بە بینیی خودا .هەندێ زانای تر دەڵێن چونکە مردن لە کاتی جیا بوونەوەی ڕۆح بۆ لاشە نابێت و ڕوونادات ئەگەر بە ئازار و ئێشێکی زۆر گران و زەحمەت نەبێت وە خودایش پێی ناخۆشە ئازاری موسووڵمانان بدرێت _ بۆیە ناو دەبرێ بە پێ ناخۆش بوون (الكراهة) . یان ڕێی تێ دەچێت پێ ناخۆش بوونەکە بەرامبەر بە بەندەکە ئەوە بێت کە بە درێژی ژیان بێت ، چونکە مرۆڤی پێ دەچێتە ژیانی ڕەزالەت ، بار گرانی لێ دەوەشێتەوە مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ پەرشی ژیانی ناخۆش؛ ((لە مەشدا ئەوە دەگەیەنێ)) کە گەورەیی و پیرۆزی کەسانی بۆ خودا جۆر بوو چەند پلەو پایەیان بەرزە لە لای خودا هەتا ئەگەر بەوەش بێت کە خودا ئازاریان نەدات ونەیانمرێنێت کە لەسەر هەموو کەسێ نووسراوە ، بە کورتی ئەمەش خودای گەورە بەوشێوەیە قسە دەکات لەگەڵ مرۆڤ کەنزیکی هۆش وهزری بکات و تێی بگات کەخودای ی گەورە ڕێزی لەئەو باوەڕدارانە ناوە . (1)

---

(١) شيخ الإسلام إبن تيميه لە پەڕتووکەکەیدا مجموع الفتاوى (( ١٨ / ١٢٩ / ١٣١ )) دەڵێت: ئەم فەرمووده پیرۆزە ....... هەتا کۆتایی باسەکە و لێکدانەوەیەکی تێرو تەسەل دەکات لە بارەی ئەم فەرموودەیە پەرچی ئەو کەسانەش دەداتەوە کە هۆشی تە سکیان ئەم فەرموودەنابڕێت ؟ابڕوانە لاپەڕە ( ١٠ / ٥٨ / ٥٩ ) بە درێژی هاتووە و دووبارە بڕوانە (السلسلة الصحيحة ) وتەی محمود توفيق الحليم لاپەڕە (٩٤) لە کتێبی الحديث القدسي

**گرنکترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی کە *لەم فەرمووده پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)***

١) کەسانێك هەن بۆ خودا جۆراوون . لە هەموو هەڵسووکەوتێکدا .

٢) هەر کەسێك دژایەتی و ئازاری کەسانی بۆ خودا جۆر و سو لحا و ئەوا خودا شەڕ کردنی ئەوان ڕادەگەیەنێت

٣) هەر کەسێکیش خودا شەڕی ئەو ڕاگەیەنێ بە دڵنیایی‌یەوە ئەو تێك شکاو و دۆڕاو دەبیت مسۆرگەربایەخی خۆ کوشتنی بە دەستی خۆی هەڵ کردووە .

٤) باشترین پەرستن کە خودا حەز دەکات مرۆڤی تیادا ببینێ هەڵسانیەتی بەرایەڕاندنی کردووە پێویست بووەکان لە سوری الواجبات ( الفرائج )

گەورەترین کار کە مرۆڤ لە خودا نزیك ببێتەوە ئەویە کە مرۆڤ خۆی نزیك بکاتەوە لە خودای گەورە بە پەرستنەکانی پێویست .

5)گەورەترین کار کە مرۆڤ لە خودا نزیك ببێتەوە ئەویە کە مرۆڤ خۆی نزیك بکاتەوە لە خودای گەورە بە پەرستنەکانی پێویست .

٥) مرۆڤ بە بەردەوام بوونی لە سەر ئەنجام دانی کردەوە و سوونەتەکان لە خودا نزیك دەبێتەوە .

٦) بە بەردەوام بوونی لە سەر سوونەتەکان مرۆڤ دەبێتە خۆشەویستی خودا <

٧) ئەگەر مرۆڤ گەیشتە ئەم خۆشەویستی‌یە خودا چاودێری دەکات بە هەموو شێوەك .

٨) ئەندامەکانی مرۆڤ خودا بەرەو خۆیی و ڕازی بوونی خۆی دەیبات .

٩) ودای گەورە هەستی دەروونی باوەڕدار ڕادەگرێت.

١٠) مردنی باوەڕ بۆیە پێویستە چونکە بەرەو باشتری دەبات کە ئەویش ڕازی بوون و چوونە ناو بەهەشتە و شاد بوونە بە بینینی خودای گەورە .

١١) باوەڕداریش گومانی باش بە خودا دەبات لە وەرگرتنی پەرستنەکانی داپۆشینی تاوانەکانی و لێبووردنی .

١٢) هەرکەسێك باوەڕدارو کەسانی بۆخودا سوڵحاوو جۆراوی خۆش بویَ وپشت وپەنای بگرێت خودایش ئەو فەرامۆش ناکات لەدونیاو لەقیامەتدا .

١٣) مرۆڤی باوەڕدار نازی هەیە لای خودای گەورە هەر داوایەکی هەبێت خودا پێی دەبەخشیَ ئەگەر ترسی لە هەر شتێك هەبێت خودا لێی دڵنیا و ئاسایی دەکاتەوە و پەنا دەدات لە ناخۆشیەکان .

ئەگەر خۆت بەهێز کرد ئەوا بۆ لە خودا ترسین خۆت بەهێز بکە : ئەگەر لاواز بووی خۆت لەسەر پێچی کردنی خودا لاواز بە ﴿ ئیمامی عەلی ﴾

## ((محبة الله تعالى للعبد واثرها في محبة الخلق ))

**عن أبي هريرة- رضي الله عنه- عن النبي( صلى الله عليه وسلم) قال : (( إذا أحب الله العبد , نادى جبريل : ان الله يحب فلاناً فأحبه , فيحبه فينادى جبريل في أهل السماء : ان الله يحب فلاناً فأحبه , فيحبه أهل السماء , ثم يوضع له القبول في الارض )) رواه البخاري في صحيحه (١)**

## ((خۆشەویستی خودا گەورەو کاریگەرییەکانی لەسەر خۆشەویستی دروست کراوە کانی تر))

**لە باوکی هورەیرەوە (خوا لێ ی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (( إذا أحب الله العبد))واتە: ئەگەر خوای گەورە هەر بەندەیەکی خۆش، نادى جبريل )) بانگی جبرایل دەکات ،(( إن الله يحب فلاناً فأحبه )) و پێی ڕادەگەیەنێت کە خودا فلانی کەسی خۆش دەوێ؛تۆش خۆشتبوێ .**

**((فينادي جبرايل فياهل السماء إن الله يحب فلاناً فأحبوة؛فيحبة اهل السماء)) بانگەواز دەکات لەئاسمان کەخودای گەورە فلان کەسی خۆش دەوێ؛ ئێوەش خۆشتان بوێ .بۆیە خەڵکانی ئاسمان خۆشیان .**

**((ثم يوضع له القبول في الارض)) لە پاشان پەسەندبوونی دەبێ و خۆشەویست دەبێ لەسەر زەویش .**

---

**(١) اخرجه البخاري في كتاب بدء الخلق _ باب ذكر الملائكة جـ ٤ ص ١١ واخرجه البخاري ايضاً في الكتاب التوحيد _ باب (( الكلام الرب مع الجبريل , ونداء الملائكةجـ ٩ ص ١٤٢ واخرجه مسلم في كتاب البر والصلة والأدب _ باب : إذا أحب الله عبداً حببه إلى عباده برقم ١٥٧ _ (٢٦٣٧) , واخرجه مالك في الموطأ _ الكتاب الشعر _ باب في المتحابين في الله برقم : (١٥) . واخرجه الترمذي في أبواب التفسير _ تفسير سورة مريم برقم : ((٣٥٤٢)) .**

## لێکدانەوەی زاناکان بۆ فەرموودەکە

((ئیمامی نەوەوی)) دەڵێت: ((زاناکان دەڵێن ))خۆشەویستی خودا بۆ بەندەکەی ئەوەیە _ کە خودا خێری ئەوی دەوێ و ڕێنموویی و بەهرەکان و شتە باشەکان دەڕژێنێ بەسەریدا و میهرەبانی وسۆزی تەواوی بۆ دەبێت .

((**منیش دەڵێم بەندەی پێویست بوو بە چاودێری خودای گەورە لە هەموو کاتێکدا**)) : ئەمانە هەموو شوێنەواری خۆشەویستی خودایە بۆ بەندە ، ئێمە مادەم خودا خۆی دەفەرموێت خۆشی دەوێ بڕوای پێ دێنین کە خۆشی دەوێ بەڵام خۆشەویستی خودا جیاوازە لەگەڵ خۆشەویستیە، کە لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە چۆنیەتیەکەی تەنها خودا دەزانێت ئێمە دەرکی تەواوی پێنابەین بەڵام ئەگەر خودا چاودێری مرۆڤی کرد بۆ بەرەو خودا چوون و شارەزای کرد لە ئایینەکەی وخەڵك خۆشیان ویست بەبێ هیچ بەرژەوەندیەکی دونیایی ئەوا ئەمانە هەموو ئەو ڕاستێتی یە دەسەلمێنن کەخودا ئەو کەسەی خۆش دەوێ . ( کۆتایی هات)

(نەوەوی) (ڕەحمەتی خودای لێبێ ) دەڵێت: (ڕق لێ بوونی خودا ئەوەیە تۆڵەو ئازار و زیانی لێ تاڵ دەکات) . هەر (نەوەوی ) (ڕەحمەتی خودای لێبێ )دەڵێت: خۆشەویستی جبریل و فریشتەکانی ئاسمان بۆ بەندە پاڕاندنەوە وسکاڵا بۆ لای خودا بردنە کە لە فلان کەس خۆش بوێ، باسکردنی فریشتەکانە بەباشی پیاهەڵدانی ئەمەیان( **یەکەم** )**جۆر و شێوازی خۆشەویستی بوو** .

**دووەم جۆر و شێوازی خۆشەویستی بوو** . : ((کە ئەویش بە هەمان شێوە ڕێی تێ دەچێ ئەوەیە لەوانەیە خۆشەویستی فریشتەکانیش هەروەك خۆشەویستی مرۆڤەکان وا بێت بۆ یەکتری لەوەی کە دڵی بەلایدا دەچێت حەز بە بینینی دەکات ، هۆکاری خۆش

ویستنی ئەوانیش بۆ بەندە ئەوەیە کە ئەو گوێ ڕایەڵی خودایە و خودایش خۆشی دەوێ .((کۆتایی هات ووتەی نەوەوی )) .

واتای: ((یوضع له القبول في الأرض )) واتە خۆشەویستی ئەوکەسە دەخرێتە ناو دڵی خەڵکیەوە لەسەر زەوی خەڵکی لێی ڕازی دەبن دڵیان بەلایدا دەچێت بەبێ هیچ پەیوەندی بوونێك بە بەرژەوەندی دونیاییەوە . ((ئەمەش هەر ووتەی نەوەوی بوو لە لێکدانەوەکەیدا بۆسەحیحی موسلیم )).

(( **چیرۆکێك** ))

(سوهەیلی کوڕی باوکی صالح) دەگێڕێتەوە کە دەڵێت( ئێمە لە کێوی عەررەفەدا ڕاوەستابووین ، خەلیفە (عومەری کوڕی عبدالعزیز) تێپەڕبوو بەلاماندا کە کاتی (حەج)کردنمان بوو ، خەڵکی هەستان بۆ سەیرکردنی و خۆشیان دەویست و (دوعا)یان بۆ دەکرد ، سوهەیل دەڵێت من بە باوکم ووت ئەی باوکە من وا دەزانم کە (خوای گەورە) (عومەری کوڕی عبدالعزیز)ی خۆش دەوێ باوکیشم لێی پرسیم چۆن دەزانی ؟ ووتم چونکە خەڵکی خۆشیان دەوێ ، باوکم پێی ووتم پێم بڵێ تۆ ئەو فەرموودەت گێڕاوەتەوە لە باوکی هورەیرەوە؟ . لە پاشان فەرموودەکەی کە باسمان کرد گێڕایەوە . لە صحیحی موسلیمدا هاتووە .

***((گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان))***

١) خودای گەورە مرۆڤی باوەڕداری خۆش دەوێ وەك چۆن مرۆڤی بێ باوەڕ و خراپەکاری ڕق لێ دەبێ .

٢) کاریگەری خۆشەویستی خودا ڕەنگ دەداتەوە لە ناو فریشتەکان و لە پاشاندا لەسەر زەوی بە هەمان شێوە خودا ئەگەر کەسێکی ڕق لێ بوو ئەوا ڕەنگ دەداتەوەلە ئاسمان و زەویدا کە خودا ڕقی لە فلآن کەسە ئێوەش ڕقتان لێبێ .

٣) ئەگەر کەسێکت دی خاوەن ڕەوشت و دادپەروەر و ئایین پەروەر بوو هیچ بەرژەوندی دونیایی نەبوو لە نێوان ئەو و خەڵکیدا خەڵکی خۆشیان ویست ئەوا بزانە ئەو مرۆڤە خودا خۆشی دەوێ .

٤) خۆشویستن دواین پلەی گەورەلە لایەن خوداوە بۆبەندەی تایبەتی خۆی.

٥) خۆشەویستنی خودا وەك خۆشەویستی ئێمە نیە بۆ یەکتر وەك خودا دەفەرموێت :((فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ {١١})سورةالشوری الاية

٦) ئەگەر مرۆڤ نێوان ئەو و خودا ئاوەدان بێت و ڕاستگۆ بێت ئەوا خودا ڕاستگۆیی ئەو دەردەخات بۆ خەڵکی لە دەرئەنجامدا .

٧) جاری وادەبێت ئەوەی ئێمە پێمان خۆشە ؛ خودای گەورەش پێی خۆشە ؛ بەڵام گرنگ ئەوەیە خودای گەورە چی پێ خۆشە ئێمە ئەوە هەڵبژێرین.

٨) ئەوەی خودا بیەوێ ببێت هەردەبێ ببێت باهەمووخەڵکی دوونیا هەوڵی بەربەست بۆ دانانی بکەن.

| خالیدی ئەلعسرا دەڵێت (برایان ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە هەیە کە حەز نەکات و خۆشی بەوە نەیەت کە بگات بە خۆشەویستەکەی؟ بۆیە ئاگەداربن خودای خۆتان خۆشبوێت، بەرەو خودا بڕۆن بە ڕێ و شوێنێکی شیاووگونجاودا.) |
|---|

## (( ما جاء من كرم الله تعالى في مضاعفة جزاء الاعمال الصالحة )) .

عن إبن عباس- رضي الله عنهما _ عن النبي (صلى الله عليه وسلم) _ فيما يرويه عن ربه _ عزوجل _ قال ـ ((إن الله عزوجل كتب الحسنات والسيئات ، ثم بين ذلك ، فمن هم بحسنة فلم يعملها كتبها الله له عنده عشر حسنات ، إلى سبعمائة ضعف إلى اضعاف كثيرة . ومن هم بسيئة فلم يعملها ، كتبها الله له عنده حسنة كاملة ، فان هو هم بها فعملها كتبها الله سيئة واحدة )) . رواه البخاي في الصحيحه(١)

## (( باس لە سەخاوەتی خودای گەورە دەكات لە دەقات كردن و زیاتر بۆ پاداشت دانەوەی لەسەر كردەوەی چاك ))

عەبدوللای كوڕی عەباس- ڕەزای خودا لە خۆی و باوكی- دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم )ئەویش لە خودای خۆیەوە _ پاك و بێ گەردی بۆ خودایە- كە فەرموویەتی (( إن الله كتب الحسنات والسيئات )) واتە : خودای گەورە چاكەكان و خراپەكانی نووسیوە ((ثم بين ذلك )) لە پاشاندا ئەم شێوە نووسینە بۆچاكەكان و خراپەكان ڕوون كردووە . ((فمن هم بحسنه فلم يعملها كتبها الله له حسنة كاملةً )) واتە : هەركەسێ لە دڵی ئەوە هەبوو كە هەڵبستێت بە چاكە كردنێك خودا خێری ئەو چاكەی بە تەواوی بۆ دەنووسێت با ئەنجامیشی نەدابێت . (( فان هو هم بها وعملها )) واتە : ئەگەر لە دڵی بوو چاكە بكات و لە پاشان هەستا بە ئەنجامدانی چاكەكە (( كتبها الله له عنده عشر حسنات )) ئەوا خودا لای خۆی بە دە چاكە بۆی

---

(١) اخرجه البخاري في الكتاب الرقائق باب( من هم بحسنة او سيئة) جـ ٨ ص ١٠٣ وأخرجه البخاري ايضاً في كتاب التوحيد باب ((يريدون ان يبدلو كلام الله)) من حديث أبي هريرة . واخرجه مسلم في الإيمان _ باب : إذا هم العبد . بحسنة كتبت ، وإذا هم بسيئة لم تكتب برقم : ٢٠٧ _ (١٣١) . واخرجه الإمام أحمد. واخرجه ابو عوانةواخرجه ابو نعيم كلاهما عن جعفر بلفظ فيما يرويه عن ربه .

دەنووسێ (( إلى سبعمائة ضعف إلى اضعاف كثيرة )) تا (حەوت) سەد ئەوەندەش دەچێت بەڵكو زۆر لەوەش زیاتر دەچێت (( ومن هم بسيئه فلم يعملها )) ئەگەر کەسێك لە دڵیدا بێت خراپەیەك بکات بەڵام ئەنجامی نەدا (( كتبها الله عنده حسنه كاملة )) ئەوا مادام خراپەکەی نەکرد خودا بە خێرێکی گەورە لای خۆی دەینووسێ (( فان هو هم بها فعملها )) ئەگەر لە دڵی ئەوە بوو خراپەیەك بکات لە پاشاندا هەستا بە ئەنجامدانی خراپەکە (( كتبها الله سيئة واحدة )) خودا تەنها ئەو خراپەیە بۆ دەنووسێ .

## ((لێکدانەوەی زانایان بۆ فەرموودە قوودسیەکە))

فەرموودەکە (( عن النبي صلى الله علية وسلم فيما يروية عن ربه عزوجل )) مەبەست لەوە ئەوەیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە خودای خۆیەوە دەگێڕێتەوە بە بێ هیچ هۆکارێك لە نێوان خودا و پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) هەبێت تەنانەت ئەگەر بە هۆی جبریلیشەوە بێت هەر جیاوازی نییە بەڵکو خودا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم فەرموودەیە بە تایبەت فەرموودەی خۆیەتی بۆیە دەفەرمووێت لە خودای خۆیەوە دەگێڕێتەوە .

(( إن الله عزوجل كتب الحسنات والسيئات )) واتـە : خودا ئەندازەی بۆ هەر یەکێك لە چاکە یان خراپە کێشاوە بە واتا ڕوونتر ئەوەیە کە پێغەمبەر( صلى الله عليه وسلم )ڕوونی کردووەتەوە لەوەی کەفەرمانی داوە بە فریشتەکان کە بەرپرسی نووسینی کردەوە و ووتەی چاکن بنووسێت کە بە درێژی باسی لێوە دەکەین وەك دەفەرمووێت (( ثم بين ذلك )) بە ڕوونتر و درێژتر ئەم ووشەیەی ڕوون کردەوە ، وە چۆن پاداشتی مرۆڤ دەدرێتەوەلەسەر چاکەکانی و خراپەکانی (( فمن هم بحسنة )) هەرکەسێ بیەوێ چاکەیەك بکات (( فلم يعملها كتبها الله )) خودا بە چاکە بۆی لە قەڵەم و پێنووس دەدات _ یان فەرمان دەدات بە فریشتەکان بۆی بە چاکە بنووسرێ بەس ئەوەندەی کە کەوتە دڵیەوە چاکە بکات (له عنده ) لای خودای خۆی (( حسنة كاملة )) چاکەیەکی تەواو و پڕو تێر و تەسەلی بۆ دەنووسرێ با هیچ کەسێك گومانی ئەو نەبات کە خودا

چاکەیەکی تەواوی بۆ نانوسێ لەبەر ئەوەی چونکە چاکەکەی نەکردووە ، بەڵکو ئەم چاکەیەش بۆ( دە)ئەوەندە و زیاتر لە (حەوت) سەد و زیاتریش بۆ هەرکەسێ کە خودا خۆی بیەوێ بۆی زیاد بکات

چونکە بە وویستنی و حەزبوون بە خێر کردن خۆی لە خۆیدا خێرە ((فلم یعملها )) بائەنجامی چاکەکەش نەدات ئاشکرایە لەوەی کە خودا خێری بۆ دەنووسێ تەنانەت بە نەکردنیشی ، ئینجا یەکسانە ئەگەر بە هۆی بەربەستێکەوە بێت یان هیچ بەربەستێك نەبێت بە ڵکو خۆی سستی لە ئەنجامدانی بکات بێ گومان ئەگەر بەربەست هەبوو بە تایبەت ئەگەر بەربەستەکە دەرەکی بێت و کەسەکە کە دەیەوێ خێرەکە بکات هەر لە دڵیدایە و خودا بە پێی ئەو حەزبوونەی لە چاکەکردن بۆی زیاد و( دە)ئەوەندە و زیاتریش دەکات .

((فان هو هم بها )) ئەگەر کەوتە دڵی چاکە بکات (( فعملها کتبها الله له عنده )) خودا لای خۆی بۆی دەنووسێ وەکو گرنگی و بایەخ پێدانێك بۆ ئەو کەسەی کە ئەیەوێ چاکە بکات ڕێزی تایبەتی لێ دەگیرێت (عشر حسنات ) دە چاکەی بۆ دەنووسرێ ئەمەش کەمترین پلەی زیاد کردنە بۆی (( إلى سبعمائة ضعف إلى اضعاف كثيرة )) بۆی زیاد دەکات هەتا حەوت سەد ئەوەندە لە پاش ئەوەش زیاتر دەکرێ بۆ هەر کەسێ بە پێی دڵسۆزی و تایبەتی کردنی لە کارەکانی بۆ خودای گەورە و تا چەند ڕاسگۆیی تیایدا و دڵی لەسەر کردنی ئەو جۆرە چاکە و زۆری سوود گەیاندنی بە خەڵکی . (( و من هم بسيئة فلم يعملها )) هەر کەسێ بکەوێتە دڵی بۆ ئەوەی خراپەیەك بکات لە پاشاندا خراپەکە نەکات بە هۆی ترس لە خوداوە ئەوا خودا خێر و چاکەیەکی تەواو تێر تەسەلی بۆ دەنووسێ .

زانا ( القاضي الباقلاني ) و بێجگە لەویش دەڵێن( هەرکەسێ لە دڵی بیەوێ خراپە بکات تەواو خۆی بۆ ئامادە بکات لە دڵیدا ئەوا تاوانبار دەبێت) ، بەڵام ئەم بۆچوونە پێچەوانەی بۆ چوونی زانایانی فیقهی و فەرموودەیی ( (الفقهاء والمحدثين والمتكلمين ) ئەمەشپاڵپشتی ڕاستێتی ئەە گێڕاوەنەوەیە یە لە دەقی ئیمامی ((شافیعی -ڕەحمەتی

خودای لێ بێ- بەڵگەش زۆرە لەسەر ئەوەی كە خودا نایـنوسێ بەڵكو لێی خۆش دەبێ لە گێرانەوەی باوكی هورەیرە كە لە ئیمامی (مسلم) لێ ی دەگێڕنەوە كە خودا دەفەرمووێت (( فأنا اغفرها له ما لم یعملها )) من لێی خۆش دەبم مادەم كارە خراپەكەی ئەنجام نەدا .لێرە دا ئاشكرایە كە دەفەرموێت ئەنجامی نەدات خۆی لە تاوانەكە بگێڕێتەوە ((ئەمەش ووتەی زانا ماوەردی بوو))

<u>تێبینی</u> //منیش دەڵێم :(( لە حەرەمی (مەككە)دا تاوان دەنووسرێ ئەگەر تەنانەت بكەوێتە دڵیشەوە بە مەرجێك یەكسەر پەشیمان و داوای لێ خۆش بوون نەكات ، چونكە ئەوێ جێگەیەكە مرۆڤی باوەڕدار نەبێ هەمموو هزوبیری خۆی لە گەورەیی خودای گەورەئەو ماڵەدا لە بیر بێت بەبەڵگەی قورئان كەخودا دەفەرموێت: ((وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ [٢٥{()) سورة حج الایة ٢٥

واتە (هەركەسێ بییەوێ خراپەیەك بكات ئێمە سزای دەدەین- - - )فەرمووی بییەوێ واتە بائەنجامیشی نەدابێت .

(فان هم هو بها ) ئەگەر بیەوێ خراپەیەك بكات ( **فعملها كتب الله له** ) خراپەكەشی ئەنجامدا خودا تەنها یەك خراپەی بۆ دەنووسێ بە بێ ئەوەی لە سەری دووئەوەندەی زیاتر زیاد بكات لەسەری زیاد بكات ، لە ڕیوایەتی مسلم دا دەفەرمووێت (( خراپەیەكی بۆ دەنووسرێ یان ئەوەشی بۆ لێ خۆش دەبین ((**فجزاءه بمثلها أو یغفر له** ))بە هەمان شێوە لە مسلم دا هاتووە (( أو یسعها )) خودا بە كەڕەمی خۆی لەسەری ڕەش دەكاتەوە یان بە هۆی داواكردنی خراپەكار لە خودایگەورە كە لێ خۆش بێ ، یان بە ئەنجامدانی كاری باش كە خراپەكەی پێ دەسڕێتەوە وەك چۆن قورئان دەفەرمووێت : **إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ{114}))(هود : ١١٤).**

واتە:چاكە كردن خراپەكردن ڕەش دەكاتەوەو لای دەبات . یان خودا دەفەرموێت: (( { إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيمًا [٣١{()(النساء : ٣١ ).

واتە : ئەگەر ئێوە خۆتان لەناوانە گەورەکان کە خودا قەدەغەی لێ کردوون بپارێزن ئەوا ئێمەگوناهو خراپە کانتان لێ دەسڕینەوە و دەتانخەینە شوێن جێگەیەکی زۆرخۆش وڕێزتان لێدەنێین .

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان»

١) سەخاوەتی و میهرەبانی خودا دەردەکەوێت .

٢) بە لە دڵی خۆ خستن بۆ هەر کردەوەیەکی چاك خودا چاکەت بۆ دەنووسێ با ئەگەر چاکەکەش نەکرێت .

٣) خراپەکردن ئەگەر بە دڵی باوەڕداردا بێت خودا بۆی نانووسێ بەڵام ئەگەروازی لێ هێنا لەبەر هەر هۆکارێك ئەوا خودا چاککەیەکی بۆ دەنووسێ .

٤) چاکەکردن یەك بە دەیەو هەتا حەوت سەد زیاد دەکرێت بە پێی تایبەتمەندێتی تیا بوونی بۆ خودای گەورە لە پاش حەوت سەدیش زیادەکردنی تریش هەیە بە بێ ژمارە بۆ کەسێ کە خودا کەرەمی لەگەڵ دەکات .

٥) خراپەکردن یەك بە یەکە بە بێ ئەوەی لەسەری زیاد بکرێت یان خودا لێی خۆش دەبێ ئینجا بە هۆی تەوبەکردنەوە بێت یان هەر بە هۆی کەرەمی خوداوە بێت یان بە هۆی کردنی چاکە کە دەبێتە هۆی لابردنی خراپە .

٦) گەورەیی ئەم نەتەوەی ئیسلامە دەردەخات کە خودا ڕێزی لێناوە کە خودا خێری بۆ دەقات و زیاتر دەکات .بە پێچەوانەی خراپە کە یەك بە یەکەیان هەر لێی خۆش دەبێ .

٧) ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە وەك خۆیان لەفەرموودەکان تێبگەین نەك هۆش وهزری سنووورداری خۆمان بکەینە پێوەرلەفەرموودەکان و پێی تێبگەین.

٨) دڵنیاین ئەوەی خودای گەورە فەمووبێتی بەجێی دەهێنێ.

٩) خودای گەورە ستەم لە کەس ناکات هەرکەسەپاداشتی تەواوی خۆی دەداتەوە بەزیادەوە.

١٠) هەرکەس پاداشتی بۆ زیاد کرا لە (دە) بۆ(حەوت) سەدئەوەندە تەنها لەچاکەی خوداخۆیەوەیە لەماف کەسیتری کەمنەکردووەتەوە.

((بەهەشت بەهەموو خۆشی یەکانو شادی یەکان یەوە بۆ کەسێکە قسە خۆش بێت لە گەڵ ئەم ئەو خواردن وخواردنەوە بە پێوست بووان ببەخشێت، بەردەوامی یەتی هەبێ لە گرتنی رۆژوو گرتن شەو نوێژ بکات بۆ خودا کاتێ کە خەڵك لە پرخەی خەو خەوتوون وبێ ئاگان)) فەرموودەیە.

## ((صفة النبي - صلى الله عليه وسلم -في التوراة))

عن عبدالله بن عمروبن العاص رضى الله عنهما : ان هذه الآية التي في القرآن: (( {يَا أَيُّهَاالنَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا }٤٥ {وَدَاعِيًاإِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا }٤٦ {وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ اللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا }٤٧ {وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ وَدَعْ أَذَاهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا }٤٨ {

)) الاحزاب :٤٥ قال في التوراة: ((ياايهاالنبي انا ارسلناك شاهداً ومبشراً ونذيراً وحرزاً للاميين ، انت عبدي ورسولي سميتك المتوكل ليس بفظ ولا غليظ ، ولاسخاب بالاسواق ولا يدفع السيئة بالسيئة ، ولكن يعفو ويصفح ،ولن يقبضه الله حتى يقيم به الملة العوجاء ، بأن يقولوا؛ لااله الاالله ، فيفتح بها اعينا عميا واذاناصماً وقلوباغلفا)) رواه البخاري في صحيحه (١)

### ((ناونیشانی پێغەمبەر(صلى لله عليه وسلم) وباس كردنی لەتەوراتدا))

لەعبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاسەوە- رەزای خودا لەخۆی ولەباوكی — دەڵێت: ئەم ئایەتەی كەلەقورئاندا هاتووە يَا أَيُّهَاالنَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا }٤٥ { أ))الاحزاب :٤٥ واتە :( ئەی پێغەمبەر(صلى لله عليه وسلم) تۆمان ناردووە بەشاهید و مژدەر ومژدەهێنەرو بۆترساندنی خوڵكی لەخودا)؛ هەمان واتای ئایەتی تەوراتە كەدەفەرموێت ((ياايهاالناس انا ارسلناك شاهداً ومبشراً وتزيراً وحرزاً للأميين ))

:( ئەی پێغەمبەر(صلى لله عليه وسلم) تۆمان ناردووە بەشاهید و مژدەر ومژدەهێنەرو بۆترساندنی خوڵكی لەخودا)تۆمان بۆپاراستنی خەڵكی نەخوێندەوار ((مەبەست پێی

---

(١) اخرجه البخاري في كتاب التفسير —سوررة الفتح-باب ((يَا أَيُّهَاالنَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا }٤٥{)).واخرجه الامام البخاري ايضاً في صحيحه في كتاب البيوع —باب :كراهية السخب في السوق.واخرجه الامام احمد ، وروى نحوه ابن عساكر وابن الجوزي عن عبدلله بن سلام والدارمي عن كعب الاحبار واخرجه البيهقي ،عن عائشة رضى الله عنها ، مختصراً.

خاوەن پەڕتووکی ئاسمانی نەبوون))

(أنت عبدي ورسولي) تۆبەندەی نێراوی منی بۆخەلکی( سميتك المتوكل) (تۆم ناوناوه بشت بەخودا بەستوو ((ليس بفظ)) تۆ ووشك نيت ((ولاغليظ)) دلّ رەقیش نيت ((ولاسخاب بالأسواق)) هات وهارار كارنيت لەبازار بۆكاسبی كردن ((ولا يدفع السيئة بالسيئة)) پاداشتی خراپ بەخراپ نادەیتەوە وە ((ولكن يعفو ويصفح )) بەلكو بەرامبەر خراپەی خراپ كاران بەخشين ولێ بوردەت هەیە ((ولن يقبضه الله حتى يقيم به الملة العوجاء)) خودا نایباتەوە و رۆحی ناكێشێ هەتانەتەوەی خوارو خێچی پێ راست نەكاتەوە :

((بأن يقولوا: ((لااله الاالله)) بەوەی بلێن هيچ خودايەنی يە بەهەق شايەنی پەرستن بێت بێجگە لەخودا ((فيفتح به أعينا عميا)) چاوی كوێرانی پێ دەكاتەوە بەوەی كەهەق بناسێ ((واذانا صما)) گوێ ی كەڕی پێ دەكاتەوە بۆبيستنی هەق وراستی ((وقلوبا غلفا)) دلّە داخراوەكانی پێ دەكاتەوە وئاشنای هەق و راستی دەكات كە نيگای خوداو حيكمەت وسونەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەردەگرێت .

## لیكدانەوەی زاناكان بۆفەرموودەكە

كەعەبدوللای كوڕی عەمری كوڕی عاس- ردزای خودا لەخۆی ولەباوكی- شارەزای تەورات بوو چونكە خوێندەوار بوو بۆيە لێيان پرسی شێوازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەراورد بكات لەوەی كەلەقورئاندا هاتووە و لەوەی كەلەتەوراتدا هاتووە. بۆيەئەويش ئەم روون كردنەوەی كرد . ((انا ارسلناك شاهدا)) ئێمە تۆمان بە شايەد حالّی باوەڕداران كردووە ، بەهەمان شێوە شايەد حالّی بەسەر بێ بڕوايانيشدا؛ لەهەمان كاتدا تۆشايەدی بۆ پێغەمبەران(صلى الله عليهم وسلم) كەبانگەوازەكەيان گەياندووە :نەتەوەكەی تۆش كەباوەڕيان بە تۆهێناوە شايەد حالّن بەوەی كە بانگەوازی خودايی گەيشتووە بەسەرجەم نەتەوەو گەلانی تر لەلايەن پێغەمبەرەكانيانەوە(صلى الله عليهم وسلم) .

(وبشیراً)) مژدەهێنەری بە بەهەشت بۆکەسانی باوەڕدار بەتۆ ((ونذ یراً)) ترسێنەری
ئاگری دۆزەخ بۆکەسانی بێ بڕوا بەتۆ . ((وحرزاً)) دەبیتە قەڵاو وپارێزەر
((للأمیین)) بۆئەو کەسانەی کە تائێستا خاوەن پەڕتووکی ئاسمانی نین وزۆربەیان
نەخوێندەوارن بەنووسین و بەخوێندنەوەش ((انت عبدي ورسولي)) تۆ بەندەی
تایبەتی منی وبۆیە نێراوی منی بۆخەڵکی ((سمیتك المتوكل)) ناوم لێ ناوی پشت
بەخودا بەستوو ؛ بەوەی رازی وقانیعی بەکەم لەبەشی خودا ، وپشت بەخودا بەستنن
ی تەواوت هەیە بۆسەرخستنت لەجەنگدا و دان بەخودا دەگرێت لەکاتی ناخۆشیەکاندا
چاوەڕوانی دەرفەت دەکەیت لەلایەن خوداوە بۆیان ، تۆخاوەن هەموو رەوشتێکی
بەرزوگەورەیت ، دڵنیایت لەوپەڕیدڵنیاییدا کەخودا هەموو پەیمانەکانی بەتۆدەهێنێتە
جێ ، هەربۆیە پشت وپەنات تەنها بەخودایە بۆیەناوی لێ ناوی ((المتوكل)) ((لیس
بفظ)) واتە رەوشتت ناشرین و ووشك نی یە ((ولاغلیظ)) واتە نەدڵ رەقیشی بەڵکو
لەوپەڕی نەرمی و ئاسنکاریدای ئەمەش هەمان واتای قورئانە ((فبمارحمة من الله لنت
لهم ولوكنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك )) ئال عمران :١٥٦))واتە ( بەهۆی
میهرەبانی خودایە کەتۆ نەرمیت لەگەڵیان ونەگەر تۆ ووشك ودڵ رەق بیت ئەوان
پەرش وبلاو دەبوون لەچوار دەوورت) . بێ گومان ئەمە مەبەست لایەنی موسوڵمانانە ،
بەڵام بەبۆنەی بێ بڕوایان و دوو ڕووەکان خودا فەرمانی پێداوە کەرەق بێت لەگەڵیان
بەوەی کەدەفەرمووێت: ((يَا أَيُّهَاالنَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا {٤٥ {التوبە ٧٣
.

((ولا صخاب)) بە(سین)یش هاتووە ئەو کەسەیە کەدەنگی بەرزدەکاتەوەو هاتوو هاوار
دەکات خەڵکی ئازار دەدات بە دەنگی ناخۆش وبەرزی لەبەر رەوشت نزمی
پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەپێچەوانەی ئەم جۆرە مرۆڤانەوەیە هاوار ناکات
بەسەرخەڵکیدابەڵکو نەرمە لەگەڵیان ، سۆزی هەیە بەرامبەریان . ((ولا يدفع السيئة
بالسيئة)) خراپەی خەڵکی بەرامبەری بەخراپ وەڵام ناداتەوە ئەمەش وەك قورئان وایە
: ((ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ {٩٦{)) المؤمنون ٩٦.

واتە:( پاڵ نانت بەوپەڕی باشی بێت لەبەرامبەر خەڵكیدا ).

((ولكن تعفو وتغفر)) بە لكو دەبوری وخۆش دەبێ بەلاَم بەمەرجێك سنووری خودانەبەزێت ئەگەر سنووری خودابەزێنرا ئەوا لەهەمووكەس بەغیرەتترە بۆ وەلاَم دانەوەی هەرجۆرە سەرپێچی یەك .

((ولن يقبضه الله)) واتە خودا نایمرێنێ ونایباتەوە بۆلای خۆی.

((حتى يقيم به الملة العوجاء)) هەتا خودا نەتەوەی پێ راست دەكاتەوە مەبەست پێ ی نەتەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)پێ ی راست دەبێتەوە چونكە ماوەیەك بوو پێش هاتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زیادو كەمی كرابوو لەئایینەكەدا كە ئایینی پێغەمبەر ئیبراهیم(صلى الله عليه وسلم)بوو؛ لەرێ ی راستی خودا لایاندابوو خواروخێچ كرابوو لەپاش راستی بوونی وتەواو ئابەم شێوە و شێوازەمایەوە هەتا هاتنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆیە راستی كردووە هەر خواری یەك هەبێت شیرك و نەزانی راكێش و بن بڕ كردو لەجێگەیدا خودا پەرستی دانا بەجێ بەجێ كردنی ((لااله الاالله)).

((ويفتح بهاعيناً عمياً) بەووشەی ((لااله الاالله))چاوان دەكاتەوەو روون دەبێتەوە بە ووشەی (لااله الاالله)مەبەست هەرخوارو خێچی یەك هەبێت راستی دەكاتەوە . ((وآذانا صماً)) گوێ ی پێ دەكاتەوە باكەڕیش بێت.

((وقلوباً غلفاً)) دڵە داخراوەكانی پێ دەكاتەوە وئاشنایان دەكات بەنیگای خودا. ووشە((غلف)) كۆی ((اغلف)) ە ((أغلف)) یش بە هەرشتێك دەو وترێ داپێچرابێت لەناو دوو توێدا وەك دەڵێن ((سيف اغلف )) (شیرێك)ی لەناو دووتوێدا مەبەست ئەوەیە لەناو كیفی تایبەتی خۆیدابێت ~~تێنینی~~ ((ئەمانە لێكدانەوەی بوخاری یە)) :

مەبەست لە (قلوبأغلفا) بادڵەكەش پێچرابێت بەنەزانی و شیرك ونەفامی خودا بەهۆی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیكاتەوە توانای ئەوەی پێ دەبەخشێ كە هەموو خێر و بێریك وەرگرێت .

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان:

١) گرنگترین کاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بانگەوازی مژدە هێنەرەو ترسێنەرە وشاهید حاڵە بەسە ئۆمەتی خۆی وپێغەمبەران و(صلی ا لله علیه وسلم) ئۆمەتانیشیاندا.

٢) ئەم سیفاتانە وبێجگە لەمانەش لەتەوراتدا هاتووە دەربارەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

٣) ئایینی ئیسلام بەگەیاندنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)کۆتایی زنجیرە پەیامی ئاسمانی یە .

٤) ئایین ئیسلام ئایینی هەموو پێغەمبەرانە لەسەر هەموویانە وەپێغەمبەرئیبراهیم (صلی الله علیه وسلم).

٥) هاتنی پێغەمبەری خۆمان ڕاست کردنەوەی ئەو خوارو خێچی یەیە کەپەیدا بووە لەئایینەکاندا بەتایبەت ئایینی ئیبراهیم و موسی وعیسی (صلی الله علیه وسلم)

٦) ئەم پێغەمبەرەمان کۆچی دوایی نەکرد هەتا هەموو ئایینەکانی تری ڕاست کردوەوە !؟.

٧) باوەڕ هێنان بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) باوەڕهێنانە بە سەرجەم پێغەمبەران(صلی ا لله علیه وسلم) .

٨) باوەرنەهێنانیش بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) باوەرنەهێنانە بەسەرجەم پێغەمبەران(صلی الله علیه وسلم) .

٩) هەرکەسێ باوەربە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نەهێنێ ئەوا سەرجەم پێغەمبەرانی بەدرۆخستووەتەوە لەوەی لەداوا دەکەن بڕوابە پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) کۆتایی بهێنن .

١٠) هەركەسێ باوەربە پێغەمبەرنەهێنێ هیچ پاداشت وەرناگرێت لەدووا رۆژدا رەنجەرۆدەبێت (( {وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٨٥﴾}) سورة ال عمران الاية ٨٥.

١١) هەركەسێ كەخاوەن ئاینەكانی تر بووبێ وبرِوابە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بهێنێ ئەوا خودا دوو خێری بۆدەنووسێ .

**یەكە یەكە لەسیفەتە جوانەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەست نیشان كراوە پێغەمبەریشی پێ ناسراوە پێش بوونی بە پێغەمبەرو (صلى الله عليه وسلم) پاش بوونی بە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوانە :**

أ) (فظ) نەبووە واتە ووشك

ب) (غلیظ) دڵ رەق وتوندو تیژ نەبووە

ج) بۆكاسبی كردن هاتوو هاوار كار نەبووە (ولاصخاب).

ح) رەوشتی ئەوەندە بەرزە بووە وەڵامی خراپەی خەڵكی بەرامبەری بەچاكە وەڵام دەداتەوە

خ) پشت وپەنای تەنها بەخودا بووە (المتوكل) ئەمانە هەموو سیفەت و رەوشتی پێغەمبەری خودا خۆی بووە.

**بەڵام سیفەتی ئایینەكەی لەمانەی خوارەوەدا وەدیار دەكەوێ :**

أ) مژدە هێنەرە:- بۆچاكە خوازان بەبەهەشت .

ب) ترسێنەرە:- بۆخراپەكاران بەبە دبەختی ودۆزەخ.

ج) شاهێدە بەسەرمیللەت ونەتەوەكانی تریشەوە كە پەیامی خودایان پێ گەیانراوە .

د) گەورەترین پلەی بەندایەتی بەرپرسیاریەێتی پێ بەخشراوە (عبدأورسولاً) .

**دەرەنجامی پەیامەكەی ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:-**

أ) زاڵ بوون وسەركەوتن بەسەرهەموو ئاینەكانی تردا بەئاسمانی ویاسابی زەوی یەوە

ب) سەرفراز بوونی شوێن كەوتوانی

ج) بەدبەختی یاخی بووانی

د) دڵ وچاو وگوێ ی کەلەپێش ئەو بەسترابوون ؛کرانەوە بەهاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

ه) تاکە ئایینێکە کەهەتا هەتا بمێنێتەوە بەبێ هیچ گۆڕینێکی ؛ دەگونجێ بۆهەموو کات و زەمانێك و کەسانێك .

و) تاکەئایینێکە هەتا هەتایی شوێن کەوتوانی دەستی لێ هەڵ ناگرن .

ی) بەڵکو سەرکەوتنیش دەهێنێ بەسەردووژمناندا.

أأ) **سەرکەوتنیش دوو جۆر:**

**جۆری یەکەم**: پابەند بوونیان بەئیسلامەوە بائەوپەڕی دژایەتیش بکرێن.

**جۆر:دووەم**: زاڵبوونیان بەسەرئایین ونەتەوەکاندا؛

**ئەمەش خۆی دوو شێوەیە:**

**شێوەیەی یەکەم**: بەهۆی جەنگەوەکەخودای گەورە جارێکیترموسوڵمانان بەهێز دەکاتەوە؛ بەئەوەی ئەوەان جارێکیتر رێ وشوێنی گوونجاووتایبەت بگرنەبەر.

**شێوەیەی دووەم**:بەهۆی زاڵبوونی عەقیدەو ئەحکام و ئەخلاقی ئیسلامەوە بەسەر سەرجەم پەیرە وو پرۆگرامەکاندا.

| چاکترینی کارەکان لای خودای گەورە دڵخوشی یەکە بیخەیتە دڵی موسوڵمانێك..... بەڵایەکی لە سەر لابدەیت... یان ناخۆشی یەك ومەترسی یەکی لێ دوور بخەیتەوە.....یان قەرزێکی بۆ بدەیتەوە)) فەرموودەیە. |
|---|

**(( ماجاءفي شفقة النبي(صلى الله عليه وسلم) على امته ودعائه لهم وبكائه عليهم شفقة ورحمة بهم))**

عن عبدالله بن عمروبن العاص- رضى الله عنهما-ان النبى- (صلى الله عليه وسلم)- تلاقول الله-عزوجل –فى ابراهيم - (صلى الله عليه وسلم)–(( {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }[٣٦](الآية)ابراهيم:٣٦)

وقال عيسى (صلى الله عليه وسلم): (( {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ }[١١٨]) (المائدة: ١١٨) .

فرفع النبي يديه ، وقال : ((اللهم! امتي ... امتي )وبكى ، فقال الله عزوجل ياجبريل ! اذهب الى محمد –وربك اعلم –فسلهُ :مايبكيك ؟ فأتاه جبريل عليه الصلاة والسلام – فسأله ، فأخبر، رسول الله- (صلى الله عليه وسلم)-بما قال-وهواعلم فقال الله تعالى : ياجبريل ! اذهب الى محمد ،فقل : اناسنر ضيك في امتك ولا نسؤءك )) رواه مسلم في صحيحه (١)

**((باس لەمیهرەبانی وسۆزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەكات : سۆزەكەی وای لیٚ دەكات دەست بەگریان بكات بۆیان: لەترسی ئەوەی كە بچنە دۆزەخەوە))** .

له عبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاسەوە- رەزای خودایان لیٚ بیٚت- دەڵیٚت: پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو ئایەتەی خوای گەورەی خویٚند دەربارەی ئیبراهیم پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كەدەفەرموویٚت (()–(( {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }[٣٦](الآية)ابراهيم:٣٦)

واتە ئەی خودایە ئەو(بت) و( تاغوتان)ە زۆریان لەخەڵكان گومڕاو سەرلیٚشیٚواو كردووە جاهەر كەسیٚ لەوان بڕوا بەمن بهیٚنیٚتەوەو شویٚنم بكەویٚ ئەوا لەمنە: بەڵام هەركەسیٚك

(١) اخرجه مسلم فى كتاب الايمان-باب:دعاو النبى ، (صلى الله عليه وسلم)لأمتهوبكائه شفقه عليهم برقم:(٣٤٦-(١٠٢)

نەکات وگوێڕایەڵیم نەکات ئەوا تۆخۆت ئەی خودایە میهرەبانیت ولێ بووردەیت زۆرە ) لەپاشان ئەو ئایەتەی خوێندکەباسی لەعیسا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات کەدەفەرموێت: ((( {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾}) (المائدة: ١١٨) .

واتە (ئەی خودایە ئەگەر تۆسزای ئەوکەسانە بدەیت کەپشتیان لەبەر نامەی من هەڵکرد ئەوا ئەوان خۆبەندەی تۆن ئەگەر لێی شیان خۆش بوی ، ئوا تۆخۆت خاوەن هەموودەسەڵاتێکی و کارداناو کار ڕەواشی )). پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەدوای ئەم دوو ئایەتە دەستەکانی بەرزکردەوە بۆئاسمان و فەرمووی ((اللهم امتی...اللهم امتی )) ئەی خودام نەتەوەکەم ئەی خودایە نەتەوەکەم ،دەستی بەفرمێسك باران کرد هەتاخودای گەورە فەرمووی ئەی جبریل !

((اذهب الی محمد))بڕۆبۆلای محمد (صلی الله علیه وسلم) ((فربك اعلم )) خودا دەزانێ –(فسله) لێ ی پرسە: (مایبکیك ؟ )ئەوە چی یە وای لەتۆکردووە دەت گریە نێ جبریلیش دێتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) لێ ی دەپرسێ هۆکاری گریانت چی یی ؟ ((فاخیرە رسول الله)) پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بۆی باس کرد کەدلێ بەنەتەودکەیەوە دەسووتێ نەوەك بچنە دۆزەخ خودای گەورە دەفەرمەێت بە جبریل برۆ بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێ ی بڵێ کەخودا دەفەرموێت : ((انا سنرضیك فی أمتك ولا نسۆك))واتە : (ئێمە تۆ رازی دەکەین لەئوومەتەکەت . واتە ئەو داوای چی لەئێمە بکات بۆ ئومەتەکەی ئەوا ئێمە پێ ی دەبەخشین ((ولا نسۆك)) کارێك ناکەین دڵی تۆبشکێنێت لەوەی لەدڵت بەنەوەکەی بسوتێ .

## لێکدانەوی زاناکان

## باب فضل امة محمد ﷺ

[ولا نسۆك] نووسەری (التحریر) ئەمەش تەکید دەکاتەوە بۆ پێشتر دڵت تەنگ وپەژارە ناکەین، چونکە ڕازی بوون جاری وا دەبیچت بۆ هەندێکیان دەبێت بەوەی

کەلێیان خۆش بی، ئەوانەی تریان دەچنە دۆزەخەوە، بۆیە خودای گەورە فەرمووی (نرضیك ولا تدخل علیك حزنا بل ننجي الجمیع) بەمەرجی تەوحیدەوە.

## (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)*

ئیمامی نەوەوی -رەحمەتی خودای لێ بێ -دەڵێت :-

١) ئەم فەرموودەیە روونی دەکاتەوە چەندە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەخەم ئومەتەکەیەوە دێت ، گرنگی تەواودەدات بە بەرژەوەندی یەکانیان ، چاودێری کارەکانیان دەبێت .

٢) سوننەتە کە مرۆڤ دەستەکانی بەرزبکاتەوە لەکاتی پاڕانەوەدا وەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی بەرزکردەوە بۆپاڕانەوەکەی .

٣) ئەو مژدەیەی کەبەم ئومەتە دراوە کە خودا زیاتر رێزی لێ دەنێ بەو پەیمان و سۆزانەی کە بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەدات . ئەمەش گەورەترین فەرموودەی قودسی یە کەهیوا دەخاتە دڵمانەوە .

٤) گەورەیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەلای خودای گەورەکەیەکسەر خودا دڵ نەوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکاتەوەو سۆزی ئەوەی دەداتێ کەرازی بکات بۆهەرشتێك کە داوای دەکات بۆ نەتەوەکەی .

حیکمەت لەناردنی (جبریل) چەند جارێك بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەبەست ئەوەیە ئەوجێ ی هەمووخێرو بێرێکە لەلای خودای خۆی بەوەی کەخودا رازی دەکات و رێزی لێ دەگرێت ئەمانەش هەموو بەشایەت گرتنی فریشتەکانی نزیك لەخودا لەکۆڕی تایبەتی خۆیدا ((الملأ الاعلی)) کاتێ ئەمەش دەنێرێ بەجبریلدا کەگەورەترین فریشتەیە لەناوفریشتەکانی بێ گومان ئەم فەرموودە قودسی یە دووبات کردنە وەو دڵنیا بوون و تەئکیدکردنی ئەوئایەتەیە کەدەفەرموێت: ((وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى ٥) (الضحى :٥ ) (( کۆتاهی هات ووتەی نەوەوی)).

٥) سوننەت بوونی گریان لەکاتی پاڕانەوەدا نزیکترە لەوەی کە خودا لێت وەرگرێت .

٦) جبریل لەنێوان خودا و پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوو چۆدەکات .

٧) تەنانەت جبریلیش لەخزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دایە .

٨) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکەم رازی نابێ بۆ نەتەوەی ئیسلام.

٩) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەدایك وباوك ومندالّ وهەموو کەسێکمان تەنانەت لەخۆشمان بەرامبەر خۆشمان بە میهرەبان ترو بەسۆزترە بۆ ئێمە.

١٠) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاڕانەوەکەی تایبەتی نی یە بۆخۆی یان بۆ خزم وکەسی بەڵکو گشتی یە . (( امتي)) نەتەوەکەم.

١١) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دڵنیایە لەوەرگرتنی پارانەوەکەش لەگەڵ ئەوەش هەر دەپارێتەوە ودەگری بۆیە سوننەتەهەر چەندەمرۆڤخاوەن باوەڕبێت هەرئەبێت زیاتربێ فیز بێت و سکاڵاو نوزانەوە بۆلای خودا ببات .

١٢) بەراووردکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرامبەر بەدوعاکانی سەرجەم پێغەمبەران (صلی الله علیه وسلم) بەتایبەتی ئیبراهیم و عیسی (صلی الله علیه وسلم).

١٣) ئێمە قەرزاری پێغەمبەرین کەمترین وەفاداری بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شوێن کەوتن وسلاوات بۆناردنیەتی .

ئەمانە هەمووی لە پێغەمبەردا دووپاتی ئەوئایەتە دەکەنەوە((بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ {١٢٨{سورة التوبة) کە تەنها تایبەتمەندی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) بۆنەتەوەکەی.

> ((هەر کەسێ دەسەڵاتی گرتە دەست ولای نەدا لە دادپەری هەر لە دونیا دا بە بەختەوەرو کامەرانی دەژی))
>
> ئیمامی عەلی کوری ئەبو تالیب

## (( تقسيم الصلاة الى نصفين نصف لله تعالى ونصف للعبد))

عن ابى هريرة- رضى الله عنه- قال سمعت رسول الله(صلى الله عليه وسلم) يقول : (( قال الله—عزوجل- :قسمت الصلاة بيني وبين عبدى نصفين ولعبدى ماسال ، فاذا قال ((**الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ** {٢}) قال الله-عزوجل —حمدني عبدني ، واذا قال : **الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ** {٣}) قال الله عزوجل —أثنى على عبدي ، واذا قال : **مَـلِكِ يَوْمِ الدِّينِ** {٤} )) قال الله- مجدني عبدني- وقال مرة فوض الى عبدي — فاذا قال: ((**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ** {٥}) قال هذا بينيوبين عبدي ، ولعبدى ماسال ، فاذا قال : ((**اهدِنَــــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ** {٦ {سورةالفاتحةالايات قال: ((هذا لعبدي ،ولعبدماسأل )) روا ه مسلم في صحيحه (١)

## ((خودا نوێژی کردووه بەدووبەشەوه بەشێك تایبەته بەخوداوه بەشێکی تریشی تایبەته به بەندەی نوێژ خوێنەوه))

لەباوکی هورەیرەوە- رەزای خودای لێ بێ- وله پێغەمبەرەوه (صلى الله عليه وسلم) لەخوای گەورەوه دەفەرمووێت ((قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفيت)) نوێژم لەنێوان خۆم وبەندەدا کردووه بەدووبەش بەشێك بۆمنەوبەشێکیش بۆبەندە ((ولعبدي ماسأل)) لەپاشان هەرچیم داوالێ بکات پێ ی دەبەخشم (فاذا قال العبد: ئەگەر بەندەکه ووتی ((**الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**)) واته ئەی خودای هەمووجیهان سوپاس تەنها شیاوی تۆیه قال الله عزوجل ((حمدني عبدني)) خودا دەفەرمووێت بەندەکەم سوپاس و ستایشی کردم ، کاتی دەلێ (**الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ**) خودا دەفەرمووێت:(بەندەکەم بەدەسەلات

---

(١) أخرجه مسلم في كتاب الصلاة-باب :وجوب قراءة الفاتحة في كل ركعة ، برقم : ٣٩٥/٣٨)واخرجه عبد االرزاق، واخرجه مالك بن انس، واخرجه احمد ،واصحاب السنن الاربعة: (ابوداود واالنسائى والترمذي وابن ماجة) وابن حبان في صحيحه.

وتوانایی مندا هەڵیداو دانی پیادانا ، كاتێ دەڵێ ((مَـلِكِ يَوْمِ الدِّينِ)) بەندەكەم دانی بەگەورەیی مندانا جارێكیش خودا فەرمووی بەندەكەم هەمووشتەكانی دایە دەستی خۆم-كاتێك دەڵێت ((إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ))خودا دەفەرموویت ئەمەوتائێرە لەنێوان من و بەندە كەمە ، بەندەكەشم داوای چی بكات پێ ی دەبەخشم ، كاتێ بەندە دەڵێ ((اهدِنَــــاالصِّرَاطَ المُستَقِيمَ ٦)) خودایە رێگەی راستم پێ نیشان بدەیت ((صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ {٧{)) رێگەی ئەوكەسانەی كەتو بەهرەو خێرو چاكەی خۆتت بەسەردا باراندوون: ئەوانە نین كەتۆ ئەی خودایەلێیان رەنجاوی و دوورت كردوونەئەوە لەمیهرەبانی خۆت ، نەئەوانەشن كەسەر لێشێواوون)) خودا دەفەرموویت ئەمە بۆبەندەكەمەو چیشی بوێ وداوای بكات پێ ی دەبەخشم )) .

## ((لێكدانەوەی زاناكان))

نەوەوی دەڵێت خودا دەفەرموویت ((سوپاسی كردم لەپاشاندا دەفەرموویت: دانی بەگەورەیی مندا نا)) چونكە سوپاس كردن بۆ(كار)ی یە واتە بەرامبەر كرداری رێك وپێكە بەلاَم بەگەورەیی زانینی (خودا )بۆسیفەتە تەواووگەورەكانی (خودای)ە هەر بۆیەش وەك وەلاَمێكە لەپاش ((الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ)) چونكە ئەم دوو وشەیە هەردوو سیفەتی خودی خوایی خۆی تیادایە .لە لەكاتێكیشدا كەدەفەرموویت ((بەندە كارەكانی هەمووخەڵكی دایە دەستی من -نەوەوی دەڵێت- چونكە ئەمەش یەكتر لەیەك چوونە بۆ ((مَـلِكِ يَوْمِ الدِّينِ)) هەرئەو خاوەنی رۆژی دوایی یە كەسی تر بۆی نی یە چرپەش بكات چ جای كەخاوەن هیچ شتێك بێت یان خاوەن هیچ دەسەلاَتێك بێت ،

، پاداشت وتۆڵە لەو رۆژەدا تەنها بەدەستی خودایە ،. لەپاشان ئەم دان نانە بەگەورەیی و دەسەلاَتی خودا و هەمووشتەكانی بداتەوەدەستی (خودا )خۆی ئەوپەڕی گەورەیی و

توانایی تیادایە مەگەر هەر خودا خۆی بزانێ چەند واتاكانی زۆرە وبەپێزە ((هذا لعبدي، ولعبدي ماسأل)) ئەمە بۆبەندەكەو هەرچیش داوابكات

هەرپێ ی دەبەخشم مەبەست بەتەو ووتانەیە ، یان ئەو ئایەتانەیە ((قسمت الصلاه)) مەبەست پێ ی سورەتی (فاتیحە)یە چونكە هەركەسێ لەنوێژدا نەیخوێنێ نوێژەكەی بەتاڵە وەك چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت ((االحج عرفة)) حەج كردن بریتییە لەعەرەفە (١) مەبەست پێ ی ئەومیە لەلایەن واتایەوە چونكە نیوەی بەكەمی فاتیحە سوپاس كردن و گەورە دانانی خودایە كارەكانی درانە دەستی خودا نیوەی دووەم ، پاڕانەوەو سكاڵاو داوا كردنە لە خودا (كۆتایی هات ووتەی نەوەوی).

## (گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)

(١) گەورەترین پەرستن ((نوێژكردنە)) كەبەندە ئەنجامی دەدات بۆخودای گەورەو هاوبەشە لەنێوان بەندە و خودای گەورە.

(٢) خودای گەورە فێرمان دەكات كەچۆن سوپاس بژێری ئەوبین بەووتنی ((الْحَمْدُ للّه رَبِّ الْعَالَمِينَ)) .

(٣) خودای گەورە فێرمان دەكات چۆن بەخودادا بڵێین ،گەورەیی باس بكەین وبەهیوای سۆزی بین لەدونیاو دوا رۆژیش ((الرَّحْمـنِ الرَّحِيمِ)) .

(٤) خودای گەورە فێرمان دەكات كەلەرۆژی( قیامەت)دا هەمووكەس بەمافی

خودای گەورە فێرمان دەكات كەلەرۆژی قیامەتدا هەمووكەس بەمافی رەوای خۆی دەگات كەئەگەر لێ ی زەوت كرابی ((مَـلِكِ يَوْمِ الدِّينِ)) هەموودەسەڵاتێك هەربۆخودایە لەو رۆژەدا.تائێرە مافەكانی خودا بوو بەسەر ئێمەوە.

---

(١) اخرجه مسلم في كتاب الصلاةباب :وجواب قراءة الفاتحة في كل ركعة ، برقم : ٣٩٥/٣٨)واخرجه عبدالرزاق، واخرجه مالك بن انس ،واخرجه احمد واصحاب السنن الاربعة (ابوداود وانسانى والترمزي وابن ماجة) وابن حبان، والحاكم والبيهقى في السنن عن عبدالرحمن بن يعمر بلفظ ((الحج عرفة،

من جاء قبل طلوع الفجر من ليلة جمع فقد ادرك الحج ، ايام منى ثلاثة ، فمن تعجل في يومين فلا اثم عليه ، ومن تأخر ملااثم عليه))حديث صحيحه

(٥)(( إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ)) مافی بەندەو داواكاریەكانی كەخودای گەورە لەسەر خۆی بەخۆی پێویستی كر كردووە،پەرستنی ئێمە بۆخودایەوتەنانەت بۆپەرستنەكەش هەرپێویستمان بەخودایەبۆرێنموویی ویارمەتی دانمان كەسەركەوتووبین تیایدا ولەهەمووكارەكاندا دەپارێینەوە كەخودا كۆمەكمان بێت خودا فەرمووی چیم لێ بپارێتەوە پێ ی دەبەخشم .

٦)لەداوای كۆمەكی كردنی خودایی ئێمەداوای ئایندە دەكەین كەخودا بۆمان مسۆگەربكات (اهدِنَــــاالصِّرَاطَ المُستَقِيمَ)) كەلەسەر رێگەی راستی خودای گەورە خۆی بمانهێڵێتەوە .

٧)گەورەترین پەرستن ((نوێژكردنە)) كەبەندە ئەنجامی دەدات بۆخودای گەورەو هاوبەشە لەنێوان بەندە و خودای گەورە.

٨)ئەورێگە راستە بریتی یە لەرێگەی پێغەمبەران (صلى الله عليه وسلم) وەك لەئایەتی تردا بە درێژی و بەراشكاوی ئاماژەی پێ كردووە: ((فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِمْ مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾)).النساء الاية٦٩

٩) خودایە وەك ئەوكەسانەمان لێ نەكەیت كە نەفرینت لێ كردوون بەهۆی ئەوەی پشتیان لەبەرنامەی تۆ هەڵكرد لەپاش ناردنی پێغەمبەران (صلى الله عليه وسلم) بۆیان بۆیە تۆ رق و كینەو نەفرینت لێ كردن ((المغضوب عليهم)) كەبرتین لە(نەوەی ئیسرائیل) لەپاش هاتنی پێغەمبەرەكانیان بۆلایان شارەزابوونیان –یاخی بوون لەفەرمانی خودای گەورەكردووە.

١٠)پەرستنی ئێمە بۆخودایەوتەنانەت بۆپەرستنەكەش هەرپێویستمان بەخودایەبۆرێنموویی ویارمەتی دانمان كەسەركەوتووبین تیایدا ، ولەهەمووكارەكاندا

دەپارێینەوە کەخودا کۆمەکمان بێت خودا فەرمووی چیم لێ بپاڕێتەوە پێ ی دەبەخشم.

١١)نەمان کەیت بە ((**الضالین**)) نەکات ئەوانەی کەبەنەفامی ونەزانی خۆیان سەرلێ شێوابوون بەحەزو ئارەزۆی خۆیان پەرستنیان دەکرد. بۆیەهەرکەسێ لەنەتەوەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەزاناکان یاخی بێت ئەوابەشێکی وەك ((**المغضوب علیهم**)) وایە هەرکەسێکیش بەنەفامی وبەنەزانی پەرستنی خودا بکات بەشێکی ((**الضالین**)) ە کانی تیادایە کەبریتی بوون لەگاوو روجوولەوکەکانی پێش پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)

١٢) بۆیە ((الفاتحة)) ناونراوە بە((الصلاة))چونکە هیچ نوێژ کردنێك بەبێ خوێندنی((فاتحة))دروست نی یەوخودا وەری ناگرێت وەك چۆن هیچ حەج کردنێك بەبێ وەستانی ((عە رە فە)) بەتاڵە وخودا وەری ناگرێت .

١٣)ئەوەشی لێ وەردەگرین بەناو وسیفەتەکانی خودا بپارێنەوە ،خودایش پەیمانی وەرگرتنی داوە.

١٤)بەکردەوەی تایبەت بۆخودا بوون بپارێینەوە ((العمل الصالح الخالص لوجه الله)) واتەبەکردەوەی باشی خۆت بپارێیتەوە لەخودای گەورە ئەو کردروە چاکەت تایبەت بۆخودا ئەنجام داوە .

١٥)هەرچەندە خودا پەرست بین ئەبێت کۆمەکی هەر لە خوداوە وەرگرین.

١٦)نابێت مرۆڤ بایی ببێت (سەرسام) بێت بە پەرستنەکانی خۆی با هەرچەندە زۆر و تێرو تەسەلبێت.

١٧)ئەگەر خودای گەورە رێنیشاندەر نەبێت؛ ئێمە بە هۆش و هزری خۆمان سەرلێشێواو دەبین.

١٨)تەنها ئایینی ئیسلام ئایینی هەمووپێغەمبەرانە(صلى الله علیهم وسلم).

١٩)هیچ ئایینێك پەسەند نیەو خودای گەورە وەرناگرێت بێجگەلە ئایینی وپەیامی ئیسلام خودا دەفەرمویت(( {وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ {٨٥})) سورة ال عمران الاية ٨٥.

٢٠)ئەگەر لە دونیادا مافێکت خورا دڵنیا بە کە خودای گەورە مافەکەت بۆوەردەگرێتەوە لەدوارۆژ.

٢١)پاڕانەوە گەورەترین پەرستنە بۆخودای گەورە.

٢٢)نابێت مرۆڤ بەهیچ شێوەیەك بێئاگابێت لەپاڕانەوە بۆلای خودای گەورە.

٢٣)هەرکە بپاڕییتەوە سۆزو پەیمانی وەرگرتنت هەیە لەلایەن خودای گەورە واتە گرنتی ئەوەت هەیە پاڕانەوەکەت بەفیڕۆ ناچێت.

٢٤)مەرج نیە ئێمە هەموو مافەکانی خۆمان بەدەستی خۆمان وەرگرینەوە. یان بەتێکرامافەکانی خۆمان بگەین لەدوونیادا.

٢٥ )ژیانی دوونیاو ژیانی دوارۆژ تەواو کاری یەکترین.

٢٦)پاڕانەوە بەتەوحیدی( الربوبیة)پەروەردگاری (والالوهیة)تەنها پەرستنی خودایی( والا سماء والصفات)ناوەکان وسیفەتە بەرزەکانی خودای گەورە.

٢٧)دانپیانانی هەرسیفەتێك کەخودای گەورە بۆخۆی دانابێ یان پێغەمبە ر(صلی الله علیه وسلم )لە فەرمووده راستەکانی بۆی دانابێت ؛ بەبێ هیچ چەندو چۆنێك.

٢٨)گرنگترین پاڕانەوە بۆدابین کردنی ئاییندەی مرۆڤە کەدوارۆژە.

٢٩)پاڕانەوە بەکردەوەی چاکی باوەڕدار خۆی؛ وەك ئەوەی بلێت خودایە لێت ئەپاڕێمەوە بەباوەڕی من بەتۆ، [illegible] کردەوەی چاکی خۆی بپاڕێتەوە.

- من وا نابینم کامەرانی وبەختەوەری لە کۆ کردنەوەی ماڵ وساماندا یە، ئەوەی لەخودا ترس بێت هەر ئەوە بەختەوەرە)) ئەل حوتەیئە.
- ((ئەگەر هەوڵ دانت بۆ کامەرانی یە لەسەر راستی بەردەوام بە، مەبەست وئاواتەکانت بە دی دێن، دەبیتە یەکەم کەسێك کەشادو دڵنیا دەبیت)) سەڤ دین ئەل حللی.

**((فضل صلاتی الفجر والعصر وتعاقب الملائكة فینا))**

**عن ابی هریرة -رضي الله عنه-عن النبي صلى الله علیه وسلم ((الملائكة یتعقبون؛ملائكة باللیل وملائكة بالنهار ، ویجتمعون فی صلاة الفجر، وفي صلاة العصر ، ثم یعرج الیه الذین باتوا فیكم فیسألهم وهواعلم :كیف تركتم عبادي؟ فقالوا تركناهم یصلون ، واتیناهم یصلون)) رواه البخاری (١)**

**((باسی لە گەورەیی دوو نوێژەی عەسرو بەیانی دەكات ، بەدوای هاتنی فریشتەكانی شەوبەدوای فریشتەكانی رۆژكەلەناو ئێمەدا دەمێنێنەوە بۆنەوەی شایەدبن لەسەرئامادەبیان بۆنوێژەكان وهەركردەوەیەك ووتەیەكی باش یان خراپ)).**

**لەباوكی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) و لە پێغەمبەرەوە (صلى الله علیەوسلم) كەفەرموویەتی ((الملائكة یتعاقبون)): فریشتەكان لەناوئێوەدا بەدوای یەكدادێن مەبەست لەم فریشتانە ئەوفریشتانەن پاراستنی ئەو كردەوانە دەكەن كەفریشتەكانی بەرپرس لەكارەكانی ئێمەن بۆ نووسینیان واتە جیاوازیان لەناوداهەیە ((ملائكة باللیل)) هەندێك لەفریشتەكان بەشەو لەناوئێوەدا دەمێنێتەوە. ((وملائكة بالنهار)) هەندێكی تریان بەرۆژ ((ویجتمعون في صلاة الفجر وفي صلاة العصر)) لەكاتی نوێژی عەسرو بەیانیدا بەیەك دەگەن ،((ثم یعرج الیه ا لذین باتوافیكم)) لەپاشان بەرزو بڵند دەبنەوە ئەوانەی والەناوئێوەدا بەشەوما بونە تەوە((فیسئالهم وهواعلم)) خودای گەورەلێیان دەپرسێ خۆیشی لەوان بەئاگاترە : ((كیف تركتم عبادي ؟)) چۆن بەندەكانی منتان بەجێ هێشت مەبەست پێ ی لەچ حاڵەتێكدابوون لەپەرستنەكان؟**

---

(١) اخرجه البخارى في كتاب مواقيت الصلاة-باب فضل صلاة العصر .واخرجه البخارى ايضا في كتاب التوحيدواخرجه مسلم في كتاب المساجد ومواضع الصلاة-باب فضل صلاتى الصبح والعصر، والمحافظه عليها برقم :٢١٠-(٦٣٢)واخرجه مالك في قصرالصلاة-باب جامع الصلاةواخرجه امام احمد ايضاً وابن خزمة والنسائي في كتاب الصلاة-باب فضل صلاة لجامعة برقم : (٤٨٤) .

((فقالوا تركنا هم يصلون ،واتيناهم يصلون)) ئێمە ئەوانمان بەجێ هێشت ئەوان لەنوێژدابوون لەچوون بۆلایشیان هەر لەنوێژدا بوون)).

**تێبینی/**

**ئەمجۆرە پرسیارەش دوو واتای هەیە:-**

**واتای یەکەم** : چاکەی ئەوەی (ئادەم) دەر دەخات کەئەوان کاتەکانیان لەپەرستندا دەبەنەسەر.

**واتای دووە م** : فریشتەکان دەبنە شاهیدلەسەر ئەوەی بەندەکانی خودا لەپەرستندان .

## (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی *کە لەم فەرمووده پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)

(١) رێزو نرخی مرۆڤ لای خودای گەورە کاتێ لەپەرستندابێت.

(٢) خودا شانازی بەپەرستنی ئەم مرۆڤانەدەکات لەکاتێکا ئەوهەموو پەرستکارانە هەیە .

(٣) هیچ شتێك لەخودا ناشاردرێتەوە.

(٤) خودا زاناترە لەسەر کارو ووتەی مرۆڤەکان تەنانەت لەوفریشتانەش کەخودا کردوونی بەبەرپرس لەبۆ نوسینی چاکەو خراپەی بەندەکان .

(٥) خودا فریشتەکانیش دەکات بەشایەد بۆچاکی و خراپی مرۆڤ .

(٦) گەورەیی نوێژی بەیانی وعەسر لەلای خودای گەورەو ئەنجامدانیان بەجەماعەت .

(٧) تەنانەت فریشتەکانیش خودا ئەرکی خزمەت کردنی مرۆڤی پێ بەخشیوون .

(٨) فریشتەی نووسینی چاکە وخراپی رۆژان وشەوان .

(٩) ئەم فریشتانەش جیان لەوفریشتانەی کە هەردەم لەگەڵ مرۆڤن ولێ ی جیانابنەوە .

(١٠) دەرەنجامی کارەکان بەستراوە بەکۆتایی یەکانی یەوە .

(١١) فێری ئەودەبین هەرکەس هەستێ بەکاری پێویستی خۆی .

(١٢) مامۆستا بۆی هەیە پرسیاربکات لەوکەسانەی کەفێری دەکات .

(١٣) گرنگی وگەورەیی نوێژ لەبەراوورد کردنی بەرانبەر پەرستنەکانی تر.

(١٤) لێپرسینەوەی ئەوکەسانەی کەکاریان پێ سپێراوە.

(١٥) وتنی شەهادەی هەق وراستی لەسەرئەو کە کارەکە یان رووداوەکە بەچاوی خۆیان دەبینن.

(١٦) تەنانەت لێپرسینەوەی کەسی ناسراو بەدەست پاك بکرێت؛چونکە لێپرسینەوەی فریشتە دەکرێت لەکاتێکا کەئەوان بێ ھەڵەن.

(١٧) پاداشت دانەوەی ئەوکەسەی کەبەکاری تەواوی خۆی هەڵئەستێ. سزاو تۆڵە دانەوەی ئەوکەسەی کەبەکاری تەواوی خۆی هەڵناسێ.

(١٨) مۆڵەت ودەرفەت دان بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێ بەکاری تەواوی خۆی هەستێ.

(١٩) تەناتنەت فریشتەکانیش کاریان جیاوازە؛ بۆیە ئەبێت مرۆڤەکانیش هەریەکەو بەکاری خۆی هەستێلەوپەڕی رێك وپێکیدا.

- ئاگادار بە، وا گومان مەبە کە خۆشی یەکان بەردەوام ددبێت لەسەرت چونکە خۆشی یەکان لە رۆژ کارەکاندا کەمن، بەدوای دونیا مەکەوە، چونکە خۆشی یەکانی وەك سێبەری هەتاوە لە دوور دەبینری وکاتێك بۆی دەچی نامێنی)) ئەل شەریف ئەل مورتەزا.
- ((بەختەوەر ئەوەنی یە کە بەدونیای شادوو کامەران بیت، بەختەوەری راست وبەردەوام ئەوەیە کە مرۆڤ دەرباز ورزگار بێت لە ئاگری دۆزەخ)) ووتە شاعیر ێکە.

## ((ماجاء في الانفاق وفضله))

عن ابى هريره -رضى الله عنه -ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال ((قال الله :انفق باابن ادم؛ أنفق عليك ))، رواه البخاري (١)

**دەروازەی((ئەوەی لەبارەی خێرکردن وخەرج کردن دێت بۆخۆت ومالّ ومندالّت وگەورەیی وپاداشتی خودا بۆت)).**

**لەباوکی هورەیرەوە- خودای لێ رازی بێ -و لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليەوسلم) : کەدەفەرمووێت:خودای گەورە فەرموویەتی((انفق باابن ادم)) ئەی نەوەی ئادەم خەرجی بکە ((انفق عليك)) منیش بەسەرتا دەبارێنم.**

## (لێکدانەوەی زاناکان بۆفەرموودەکە)

**ئەم فەرمانەی (خودا) وەك ئەوە وایە کەخودا هەلّسوکەوتت لەگەلّ دەکات چۆن تۆهەلّسوکەوت بکەی لەگەلّ خەلّکانی تردا: ئەگەر چاك بیت ئەوا خودا بەهەرەو چاکەت بەسەردا دەبارێنێ ئەگەر چاو چنۆك بیت ئەوا خودا بەهەرەی خۆیت لێ وەردەگرێتەوە وتۆش تەنها لۆمەی لەخۆت بکە.**

---

١) اخرجه البخارى في صحيحهٌ فى كتاب النفقات-باب: فضل النفقة على الاهل ، واخرجة البخارى ايضاً في كتاب التفسير-سورة هود-باب: قولةتعالى: ((وكان عرشه على الماء)). واخرجه مسلم في كتاب الزكاة- باب: الحث على النفقة ، وتبشير المنفق بالخلف برقم :٣٧ –(٩٩٣)

## (گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)

١)خودای گەورە فەرمان بەخەرج کردن دەدات ومرۆڤ چاوچنۆك نەبێت.

٢) خودا سەخاوەتی بەندەی خۆی پێ خۆشە .

٣) خودا چاو چنۆکی پێ ناخۆشە .

٤) ئەگەر خەرجی بکەیت ئەوا فەرمانی خودات بەجێ هێناوە .

٥) ئەگەر خەرجی نەکەیت ئەوا فەرمانی خودات شکاندووە .

٦) چەند سەخاوەت ودڵ کراوەبی خودا زیاتر بەسەرتا دەبارێنێ .

٧) چەندە چاوچنۆك بیت خودایش لێت دەگرێتەوە .

٨) خودا پەیمانی داوە بەوەی کەخەرجی دەکات خودا بۆی پڕدەکاتەوە .

٩) گەورەیی خێرکردن وچاکە کردن لەگەڵ کەسانی ژێردەستەی خۆت واتە ئەوکەسانەی کەتۆ لێیان بەرپرسی وکەسانی تریش .

١٠) مولکی (خودا) کەم ناکات بەرۆزی دانی هەموو خەڵکی .

١١) ئەوەندە ماڵ وسامان هی تۆیە کەتۆ زیندویت لەپاش مردنت مافت بەسەرماڵەکەوە نامێنێ .تەنهائەوەندە نەبێ قەرزت لەسەربێ بۆت بدرێتەوە یان سێ یەکی ماڵەکەت بەوەسیەت بدەیت .

- ((توێشووی بەختەوەری لە چاکەو باشە کردندا یە)) ووتەی عەرەبی یە.
- ((بەختەوەری وکامەرانی لە وەدا یە ئەوکارەی ئەنجامی دەدەیت پێ خۆش حاڵ بیت پێ ی)) ووتەی عەرەبی یە.

## ((ماجاء في الصيام وفضله))

ابي هريرة- رضي الله عنه- ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال (قال الله :-عزوجل -((الصوم لي وانا اجزي به يدع شهوته واكله وشربه من اجلي ، والصوم جنة ، وللصائم فرحتان : فرحةٌ حين يفطر ، وفرحةحين يلقي ربه ، لخلوف فم الصائم أطيب عندالله من ريح المسك)) اخرجه البخاري في صحيحه (١)

## ((باس لەرۆژو گرتن وگەوردیی رۆژوو دەكات)) .

**لەباوكی- هورمیرەوە- رمزای خودای لێ بێ- ولە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليەوسلم) لەخودای گەورەوە دەفەرمووێت ((وانا اجزي)) هەرخۆیشم پاداشتی دەدەمەوە ((یدع شهوته وطعامه وشرابه من اجلي)) واز لەئارەزۆ مەندیەكانی خۆی دێنی ولە خواردن و خواردنەوەش لەپێناومندا ((والصوم جنة)) رۆژی گرتن پاراستنە بۆمرۆڤ .((وللصائم فرحتان)) بۆ رۆژووەوان دوو خۆشی هەیە : ((فرحه حین بفطر)) خۆشی یەكیان كاتێ رۆژووەكەی دەشكێنێ ((فرحة حين يلقي ربه)) كاتێكیش دەگاتە وەلای خودای گەورە بۆپاداشتەكەی(ولخلوف فم الصائم أطيب عندالله من ريح المسك ) بۆنی ناودەمی رۆژووەوان خۆشترە لەلای‌خودای گەورە لەبۆنی میسك وعەنبەر) كەخۆشترین بۆنە.**

## (لێکدانەوەی زاناکان بۆفەرموودەکە)

((الصوم لى وانا اجزى به)) (نەوەوی) دەڵێت:(( زاناکان بۆچوونی جیاجیان هەیە بۆلێکدانەوەی ئەم بەشە لەفەرموودەکە لەوەی کەخودا دەفەرموووێت ((رۆژوبۆمنە)) **تایبەتی کرد لەکاتێکا هەموو بەرستنەکان هەر بۆخودایە** :

**یەکەم** :**دەڵێن** بۆیەخودا دەیداتەوە پاڵی خۆی چونکە هیچ کەسێکی تر نەپەرستراوە بەم جۆرە پەرستنە بێجگەلە خودا ، کاتێك نەبووە کافرەکان هەرچەندە پەرستنیان بۆپەرستراوە کانی خۆیان زۆروگەورە بووبێ بەڵام نەگەیشتووەتە ئەورادەیەی کەرۆژووی بۆبگرن . باکورنوش وقوربانی و خێریشیان بۆکردبێ.

**دووەم**: بۆیە خودا دەفەرمووێت بۆمنە چونکە رۆژوگرتن دوورە لە(ریاء) کردن و لەبەرچاو بوونی خەڵکی چونکە نهێنە لەنێوان بەندەو پەروەردگار ،بەپێچەوانە هەریەك لە(نوێژو حەج وتێکۆشان وچاکەکردن) بێجگە لەمانەش لەپەرستنە ئاشکراو دیارەکان .

**سێ یەم** :-لەبەرئەوەی هیچ بەشێکی بۆ رۆژووە وان تیادانی یە ، بەپێچەوانەی هەرپەرستێکی تر

**چوارەم** :- لەبەرئەوەی وازهێنان وپێویست نەبوون لەخواردن وخواردنەوەکان لەسیفەتەکانی فریشتەکانە ؛ رۆژووەوان بەم پەرستنەی خۆی دەباتە رێزی فریشتە کەدوورن لەهەموو ئارەزۆ مەندی یەك .

**پێنجەم** :- فەمووی (الصوم لى) واتە رۆژو بۆ(منە). تەنها خودا خۆی دەزانێ پاداشتی چەندە خودا خۆی بۆی چنگانەدەکاتەوە بەدەقات و زیاتریش ، چونکە هەموو پەرستنێك خودا پاداشتەکەی دیاری کردووە .

**شەشەم** :- ئەم دانە پاڵە بۆلای خودای گەورە خۆی؛ لەخۆیدا رێزلێ گرتنە لەکاتێکا

هەموو دونیا هەر هی خودایە . ((وانا اجزي بە)) هەرمنیش پاداشتی دەدەمەوە ئەمەش دەرخستنی گرنگی وگەورە رۆژووە بۆیە هەرخودا خۆی پاداشتی گەورەی بۆداناوە ((ولخلوف فم الصائم)) بۆن وتامی دەمی مرۆڤ دەگۆرێ لەبەر خودای گەورە ئەم تام وبۆن گۆرینەی ناودەم پەسەند دەكات بۆیەخوداپاداشتی دەداتەوەی بەوەی كەلای خۆی خۆشی بوێ لەبۆنی میسك خۆشتر.

((وللصائم فرحتان)) (ئەوەوی) دەفەرموێت(زانایان) دەڵێن(( خۆشی یەكەی كاتێ دەگات بەخزمەت خودای گەورە ئەومیە دڵێ خۆش دەبێ بەوەی خودا پاداشتی گەورەی بۆداناوە وە كەخودا خۆی پارمەتی دەری بووە بۆگرتنی رۆژووەكەی بەلام خۆشیەكەی كاتێ بەربانگ دەكاتەوە هۆیەكەی ئەومیە دڵێ خۆش دەبێ كەپەرستنێكی گەورەی ئەنجام داوە بەرێكێ وپێكی هیچ كارێكی نەكردووە كەخودا پێی ناخۆش بێ .لەگەڵ ئەمانەش هەمووی كاتی لەزەت وەرگرتن دێت لەخۆشی یەكانی دونیاخواردن وخواردنەوە .

***((گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان))***

١) گەورەترین پەرستن بۆخودا رۆژووگرتنە چونكە هەمووپەرستنێك پاداشتی دیاری كراوە تەنهارۆژوو نە بێت تەنهاخودا خۆی دەزانێت چ پاداشتێكی گەورەی بۆداناوون.

٢) رۆژووگرتن نهێنی یە لەنێوان خودا وبەندە چونكە دەتوانی بخوات وبخواتەوە بەلام لەبەر خوا وازی لێ هێناوە بۆیە خودایش خۆی پاداشتەكەی .و بەنهێنی هێلاوەتەوە .

أ) پاراستن لەدۆزەخ و .

ب) پاراستن لەوەی کەکۆنترۆڵی خۆت دەیکەیت بە رۆژووگرتن هەرئەوەش وات لێدەکات لەئارەزۆمەندی یەکانت بپارێزێ .

٤) **رۆژگر دووخۆشی گەورەی هەیە.**

**خۆشی یەکەم** : کاتێ رۆژووەکەی دەشکێنێ شاد دەبێ بەوەی جارێکی تر خودا سەرکەوتووی کرد بۆگرتنی رۆژ ووەگەی وخواردن وخواردنەوەو ئارەزوومەندەکانیش بۆحەڵاڵ بوویەوە .

**خۆشی دووەم** : خۆشی گەورەبۆرۆژی دوای یە کاتێ پاداشتی بێ سنووری خۆی وەردەگرێ لەلای خودای خۆی .

٥) کاتێ بۆنی دەمی رۆژووەوان ناخۆش دەبێ خوداپاداشتی دەداتەوەبەوەی کەلای ئەوخۆشترەلەبۆنیمیسك.

٦) .ئێمەئەوەی لەسەرمانە لەپاشێودا ددانی خۆمان خاوێن بکەینەوەبەدەزوو وهەویری ددان وبەردەوام سیواکیش بەکاربهێنی بۆئەوەی ئەوبۆنەناخۆشە کەم بکەینەوە خەڵکانی تری پێ نارەحەت نەکەین .

٧) ئەگەربرسی وتێنوو بوویت نرخی کاتی تێربوونت دەگریت ، دڵت بەهەژاران دەسوتێ.ویارمەتیدەریاندەبی.

٨)مرۆڤی رۆژووەوانئەبێت لەهەمووکەس زیاتر خۆی لەحەرام وشوبهەبپارێزێ خۆی دووربخاتەوە چونکە ئەو خۆی لەحەڵاڵ دەگرێتەوە لەبەرخودای گەورە نهێنیەو کەس ئاگای لێ نیە.

٩)رۆژوو ئەبێت بۆخودابێت وچاوەڕوانی پاداشت لەخوداوە بکات.

- بەختەوەری وکامەرانی لە هەزاری لە دایك دەبێت، نەبوونیش خۆی شاردووەتەوە لە ناو دڵی بەختەوەریدا)) لاوتسۆ.

- ((خەندە و روخۆشی بچێنە لەرووی خۆت، بەرهەمی بەختەوەری یەکان دەدروێتەوە لە دڵی خەڵکەکاندا)) راندل.

## ((ماجاء في الحث على الفضيلة والنهي عن الرذيلة))

عن حذيفة- رضي الله عنه قال :قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) : ((تلقت الملائكة روح رجل ممن كال قبلكم، فقالوا: أعملت من الخير شيئاً؟ قال: لا،قالوا :تذكر، قال :كنت أداين الناس فآ مر فتياني ان ينظروا المعسر ويتجوزوا عن الموسر ،قال: قال الله-عزوجل -: تجوزوا عنه)) اخرجه مسلم في صحيحه (١)

**دەروازەی(هاندان بۆنەوەی چاكەكردن بەرامبەرخەڵكی بكرێت وهیچ زیانێك بەخەڵكی نەكەیەنرێت)) .**

**لە(حوزەیفەوە)- رەزای خودای لێ بێ- لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ((تلقت الملائكه روح رجل ممن كان قبلكم))((فریشتەكان گەیشتن بەرۆحی پیاوێك لەوكەسانەی كەلەپێش ئێمەدا هاتوون .**

**ووتیان ((اعملت من الخير شيئاً)) ؟ هیچ كارێكی خێرت كردووە؟ قال:(لا) وتی نەخێر((قالوا تذكر؟)) قال:((كنت آمر فتيانى)) ووتی: ((من فەرمانم دەدات بەوكەسانەی كەئیشیان لەگەڵ دەكردم)) ((ان ينظروا أويتجاوزوا عن الموسر)) مۆڵەت ودەرفەتی ئەوكەسەی كەهەیبوو یان لەوكەسە خۆش بن كەهەژارونە داربوو ،قال : قال الله فتجاوزواعنه)) پێغەمبەر((صلى الله عليهوسلم)) دەفەرموێت: (خودا فەرمووی لێ ی خۆش بن لەتاوانەكانی ) مادام ئەم چاكەیە هەبوو لەگەڵ خەڵكی.**

---

**(١) اخرجه مسلم في كتاب المساقات –باب :فضل انظار الموسر، برقم :٢٦- (١٥٦٠) واخرجه البخارى في كتاب البيوع –باب من انظر موسرا. واخرجه البخارى ايضاً في كتاب احاديث الانبياء –باب ماذكر عن بنى اسرائيل.**

# لیکدانەوەی زاناکان

زانا(قەستەلانی) دەڵێت: ( ئەم فەرموودەیە وەك ئەونایەتەوایە کەدەفەرمووێت: {وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ {٢٨٠}) البقرة :٢٨٠). واتە : ((خودافەرمانی بەوکەسانەی لەخاوەن قەرزن بەلای خەڵکەوە پێویستە لەسەریان دەرفەتیان بدەن هەتادەیان بێت )).

نەك وەك نەفامەکانی پێش هاتنی پێغەمبەر((صلى الله عليه وسلم)) کەکاتێ کاتی قەرزدانەوەکەیان بەهاتایە دەیان ووت بەقەرزارەکان (یان ئەبێ قەرزەکەم بۆگێریتەوە یان قەرزیان لەسەردەنوسمەوە بەزیادبوونی (ریبا)) .

هەرکاتێ زانرا قەرزار توانای دانەوەی نی یە حەرامەو قەدەغەو گوناهە زۆری لێ بکرێت داوای قەرزەکەی لێ بکەیت بۆیە زانا قەرزان وبێجگە لەئەویش دەڵێت : گەردن ئازاکردنی قەرزاری نەدار باشترە وخێرترە لەوەی کەدەرفەتی تری بۆتازە بکەیتەوە .

### (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی کە لەم *فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)

١) پەندوەرگرتن لەنەتەوەکانی پێش خۆمان وەرگرین لەچاکە چاکەبکەین لەخراپەی ئەوان ئێمە خۆمان دوور بخەین.

٢) هەرچەندە گوناە باربی بێجگە لەشیرك وهاوبەشی و دووروویی )) ئەگەرگوناهێکی تری هەبوو بەچاکە کردن لەگەڵ خەڵك خودا لێ ی خۆش دەبێ.

٣) فەرزە قەرزارمۆڵەت ودەرفەتی بۆتازەبکەیتەوەوهەتا توانای دانەوەی دەبێ.

٤) ئەگەرلێ ی خۆش بووی باشترە وخودایش لە تۆ خۆش دەوێ لە کاتێکا کە تۆ زۆر پێویستت بە لێخۆشبوونی خودا دەبێ.

٥) فریشتەبەفەرمانی خودا پرسیاردەکەن بۆیان نی یە ئەشکەنجەو ئازاری کەس بدەن هەتا خودا خۆی فەرمانی لێ خۆشبوون یان پاککردنەوەی لەتاوان نەکات.

٦) فریشتەكان پرسیار لەمرۆڤەكان دەكەن لەدوواڕۆژ بۆچاكی وخراپیان لەدوونیادا .

٧) كاتێ لەكەسێك خۆش دەبی كەقەرزارتە بەهیوای ئەوەبی كەخودا لێت خۆش بێ نەك بۆ چاولێكردن وناوبانگی بێت خودای گەورە لێت خۆش دەبێ.

٨) خێركردن باكەمیش بێت بەلاَم هەرئەنجامی بدە خودا لێت وەر دەگرێ .

٩) ئەگەر ئێمە بەزەییمان بەیەكتردا بێتەوە خودای گەورەش بەزەیی بەئێمەدا دێتەوە.

١٠) ئەگەر ئێمە بەزەییمان بەیەكتردا نەیەتەوەئەوا خودای گەورەش بەزەیی بەئێمەدا نایەتەوە.

١١) مەرج نیە بەزەیی تەنها لەوەدا بێت مرۆڤ بەزەیی بەمرۆڤ ببات ؛وبێ بەزەیی بێت بەرامبەر درووست كراوانیتر نەخێر نەبێ بەزەیی بە سەرجەم درووستكراوانی تری خودای گەورە بگرێتەوە تەنانەت رووەك ودارو بارو ژینگەبەتێكڕادەگرێتەوە.

١٢) ئەگەر لەكەم وكورتی خەلّك خۆشببیت خودای گەورەش لەكەم وكورتیت خۆشدەبێ.

١٣)لەوانەیەخێرێك زۆركەم بێ و هیچ هەژماری بۆنەكەیت بەلاّم پاداشتەكەی لەدەرئەنجامدا زۆر گەورە بێت.

١٤) لەوانەیەخرپەیەك زۆركەم بێ و هیچ هەژماری بۆنەكەیت بەلاّم سزاوتۆلّەكەی لەدەرئەنجامدا زۆر گەورە بێت.

١٥)هیچ خێرێك لەلای خودای گەورە وننابێت بازۆر بچووك ونادیاربێت.

١٦) هیچ شەڕوخراپەیەك لەلای خودای گەورە وننابێت بازۆر بچووك ونادیاربێت بەلگەش بۆهەردوو خالّی( ١٥-١٦)خودای گەورە دەفەرموێت: ((فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)))سورة الذاريات.

- ((هیچ بەختەوەری یەك هاوسەنگی حەوانەوەی بە ویژدانی دەروون نی یە)) كوڕی ئیبن ماجە))
- بونەوەی بتوانی پارێزگاری لە بەختەوەری وكامەرانی بكەیت پێویستە برا بەشی بكەیت بە نیوە لەگەلّ خەلّكانی تر)) نووغست كۆنت.
- ((بەختەوەری رازی بوونە بە بەشی خۆت، نەبەزێر ونەبە زیو وبەگەورەیی دەتوانن بەختەوەرمان بكەن)) لافۆنتین
- ((كاركردنم بۆ بەختەوەریم ئەوكاتە یە كە كار بكەم بۆ بەختەوەری و شادی خەلّكانی

## ((النهي عن الشحناء وانه اعظم ذنب بعد الاشراك بالله))

عن ابي هريرة- رضي الله عنه- ان رسول الله -((صلى الله عليه وسلم))- قال (تفتح ابواب الجنة يوم الاثنين ويوم الخميس ، فيغفر لكل عبدلا يشرك بالله شيئا ، الا ((رجلاً كانت بينه وبين أخيه شحناء ،فيقال :انظروا هذين ، حتى يصطلحا ، انظروا هذين حتى يصطلحا، انظروا هذين حتى يصطلحا)) .رواه مسلم-١- وفي روايه ((الا المتهاجرين))

## ((قەدەغەكردنی لەدەنگ لە یەك لەوەرگرتن ((قسەلەگەڵ یەك نەكردن)) گەورەترین تاوانە لەدوا هاوەڵ وهاوبەش پەیداكردن بۆخوای گەورە ))

لەباوكی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) كە پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) دەفەرمووێت: ((تفتح ابواب الجنة یوم الاثنین ویوم الخمیس)) دەرگاكانی بەهەشت دەكرێنەوە لەرۆژی دووشەممە ورۆژی پێنج شەممە )). ((فیغفر لكل عبدلایشرك بالله شیئاً )) خودا لەهەموو كەسێك خۆش دەبێ كەهاوەڵ وهاوبەش بۆخودا دانەنابێ : ((الا رجلاًكانت بینه وبین اخیه شحناء)) وەكەسێكی تریش خودا لێ ی خۆش نابێ كەرق و كینەی لەدڵ بێ بەرامبەر برای موسوڵمان.فیقال : ((انظروا هذین ،حتی یصطلحا)) دەووترێت ئەم دووكەسە دوابخرێ ولێیان خۆش نابێ ، هەتا ئاشتی وتەبایی نەكەوێتە نێوانیانەوە ))

---

.(١) اخرجه مسلم في كتاب البروالصلة والأداب –باب :النهي (عن الشراك بالله والشحناء )في الادب المفرد : (٤١١) واخرجه الامام مالك في كتاب حسن الخلق . واخرجه ابوداود في كتاب الادب –باب :في هجرة الرجل اخاه برقم : (٤٩١٦) .

## ((لێکۆلینەوەی فەرموودە کە بەبۆچوونی زاناکان))

(نەوەوی) دەڵێت: (قازی) دەڵێ: (وئەویش دەڵێ بابی دەڵێت: ( واتای دەرگاکردنەوەی بەهەشت لێ خۆش بوون ولێ بووردەیی دەگرێتەوە پلەوپایەی پیاوچاکان بەرزدەکرێتەوە وبەخشینی پاداشتی زۆرە: بەڵام قازی خۆی دەڵێ ((لەوانەیە مەبەست هەر دەرگاکردنەوەی بەهەشت خۆی بێ مەبەست ((لەفەرموودەکەی پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) ((انظروا هذین حتی یصطلحا)) ئەوەیە لێ خۆش بوونیان دوادەخرێن .
یەك مەرج دەهێننە جێ ئەویش لەیەکتر بوردنەهەتا خودایش لێیان ببورێ .
فەرموودە (قودس)ی یەکە لێرەوەدەست پێ دەکات ، ((فیقال : انظروا هذین حتی یصطلحا)) .
واتە:( خودا دەفەرمووێت دەرفەت بدەن بەو دووکەسە بالەیەکتر خۆش بن لەپاشان منیش لێیان خۆش دەبم ) لەهەندێ (ریوایەت)دا دەفەرمووێت ((الاالمتهاجرین)) تەنها ئەو دووکەسە نەبێ کەخودا لێیان خۆش نابێ کەقسەیان لەگەڵ یەك نەبێ
هاوەڵ وهاوبەش بۆخودا دانەنابێ : ((الا جلأكانت بینه وبین اخیه شحناء)) وەکەسێکی تریش خودا لێ ی خۆش نابێ کەرق و کینەی لەدڵ بێ بەرامبەر برای موسوڵمان . (( فیقال : انظروا هذین ،حتی یصطلحا)).
واتە(( دەووترێت ئەم دووکەسە دوابخرێ ولێیان خۆش نابێ ، هەتا ئاشت وتەبایی نەکەوێتە نێوانیانەوە ))

### (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی که *لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)

١. بەهەشت دەرگاکانی زۆرە بۆیە لەریوایەتدا هاتووە کەهەشت دەرگای هەیە .
٢. کردنەوەی ئەودەرگانە لەرۆژانی دووشەوەمەو پێنج شەممە چونکە رۆژی دووشەممە خودا هەرلەئەزلدا فەرمانی ئەم شتانەی تیاداوە
أ) لەدایکبوونی پێغەمبەر((صلی الله علیەوسلم))

ب) کۆچ ومالْ ئاوایی کردنی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم))

ت) هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆگیانی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)).

**بەلأم رۆژی پێنج شەممە**: خودا فەرمانی داوە کەکردەوەی باش وخراپی خەڵکانی تیادا بەرزبێتەوە بۆئاسمان  خودایش دەزانێ حیکمەتەکانی تری چیە وچەندەو بۆچی یە .

٣)خودا لەهاوەڵ وهاوبەش پەیداکار خۆش نابێ بەهیچ شێوەیەك باهاوەڵ و هاوبەشی پەیدا کردنەکەیشی زۆرکەم  وورد وونادیاربێت کەئەمە گەورەترین مافی رەوای خودای گەورەیە بەسەر هەمووکەسێکەوە .

٤) خودا لێ خۆشبوونی خۆی دوا دەخات لەکەسێك یان لەدووکەس کەرق وکینەیان لەدڵدابێت بەرامبەر یەکتر هەتا لەیەك رازی دەبن ئەوکاتیش خودا دەیان بەخشێ

٥) دەکرێت خودای گەورە لەبەر کارێك لێ خۆشبوونی خۆی دووابخات هەتاهەڵ دەستن بەکارێکی واکە خودا لەخۆیان رازی بکەن . هەرکەسێ ئەیەوێ خودا لێ .

٦)هەرکەسێ ئەیەوێ خودا لێ ی خۆش بێ بالەوکەسە ببوورێ کەهەڵەی بەرامبەر کردووە خودایش لەهەڵەوکەم و کورتی ئەو لەماف وئەرکەکانی کەلەسەریەتی بەجێ ی نەهێناوە وەك پێویست یان هەر بەجێ ی نەهێناوە .

٧)ماف وئەرکی خودا هەمووی جێ ی لێ خۆش بوونە بێجگە لەهاوەڵ پەیداکردن.

٨)ماف وئەرکی مرۆڤ لەسەریەکتر لەلایەن خوداوە لێ خۆش بوونی نی یە بەڵکوهەتا خاوەن هەق دەگەیەنێ بەهەقی خۆی .

٩) خودا مافی مرۆڤی لەگەڵ مافی خۆی باس کردووە بۆئەوەی پێمان بڵێت چەند تاوانە وبێ خۆشی بوونی نی یە ئەگەر بێتو مافی خەڵکانی زەوت بکەین .

١٠)خودا ئەوەی لەئیمەدەوێت کەتەبابین وپشتی یەکتربگرین ماف وئەرکی یەکتربەجێ بهێنین.

١١) شەیتان دەوێ رق وکینەبخاتە نێوانمان وەك خودادەفەرمووێت :(( { إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِوَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ }٩١ { )). سورة المائدةالاية

١٢) ئەگەر دووکەس قسە لەگەڵ نەکەن بەیەکێکیان بمرێت دەرفەتی لێ خۆشبوونی خودایی لەدەست هەردووکیان دەبێت .

مەرج نی یە هەموو کەسێ بە ئاواتە کانی بگات، ئەگەر پێ ی بگات مەرج نی یە سەرکەوتوو بێت تیایدا ، مەرج نی یە سەرکەوتوبوو لە کارەکان لە جێ ی خۆی بوو بێت، بەلآم ئەگەر نیازو توانایی و سەرکەوتن ولە جێ ی مەبەستی بگرێت ئەوکات هەموو بەختەوەری یەکان تەواووتێرو تەسەل دەبێت)) جەعفەر کوری محمد کوڕی عەلیَ.

## ((فضيلة المتحابين في الله تعالى))

عن ابى هريرة– رضي الله عنه–قال : قال رسول الله – (صلى الله عليه وسلم) : ((ان الله يقول يوم القيامة : اين المتحابون بجلالي ؟ اليوم أظلهم في ظلي يوم لاظل الا ظلي)) رواه مسلم (١)

## ((گەورەیی ئەوکەسانەی کەیەکتریان خۆش دەوێ لەبەرخودای گەورە ))

لەباوکی هورمیرەوە -رەزای خوای لێ بێ-دەڵێت: پێغەمبەر((صلى الله عليه وسلم)) فەرمووی : خودای گەورە دەفەرموویت لەرۆژی ((قیامەت)) لەکوێن وکوان ئەوکەسانە لەبەر گەورەیی وفەرمان رەوایی فەرمانبەری یەکتریان خۆش ویستووە ((اليوم أظلهم في ظلي)) ئەمڕۆدەیان خەمەژێر سێبەری خۆم ((يوم لاظل الا ظلي)) ئەمڕۆ ئەو رۆژەیەوە کەهیچ سێبەرێك نی یە بێجگە لەسێبەری من نەبێت .

## لێکدانەوەی زاناکان بۆفەرموودەکە

مەبەست لە ((المتحابون بجلالي)) ئەوەیە تەنها لەبەرخودای گەورە و کەخودای گەورە فەرمانی خۆش ویستنی یەکتری داوە ، نەك مەبەستیان دونیایی بێت یان ئەیەوێ خودا لێ ی خۆش بێ بالەوکەسە ببوورێ کەهەڵەی بەرامبەر کردووە خودایش لەهەڵەوکەم و کورتی ئەو لەماف وئەرکەکانی هەربەرژەوەندیەکی ترکەواتە تەنها لەبەر خودا و لەپێناوخودا وبۆخودای گەورە یەکتریان خۆش بوێ ((يوم لاظل الا ظلي)) ئەورۆژە گەرمە خەڵکی هەمووله بیابانێکی پان وبەریندا دەژین زۆر حاڵیان پەرێشانە هیچ

---

(١) أخرجه مسلم في كتاب البر والصلة والآداب –باب : في فضل الحب في الله برقم :٣٧-(٢٥٦٦) . واخرجه الامام مالك في الموطأ- كتاب الشعر –باب (٥) ماجاء في ا لمتحابين في الله برقم : (١٣) واخرجه الامام أحمد في المسند وابن حبان في صحيحه .واخرجه الطبراني في المعجم الكبير عن معاذ بلفظ ((ان المتحابين بالله فى ظل العرش)) وصححه الشيخ ألالباني في صحيح الجامع الصغير برقم ؛ (١٩٣٧) . المعجم الكبير عن معاذ بلفظ((ان المنحابين بالله فى ظل العرش)) وصححه الشيخ ألالباني في صحيح الجامع الصغير برقم؛(١٩٣٧) .

شتێك لەداروبەرد بەرزایی وهیچ شتێكی نیە كە (سێبەر)ی هەبێت وبتوانن لەژێریدا بخەوێنەوە تەنها وبێجگە لەیەك( سێبەر) كەئەویش بریتی یە لە(سێبەر)ی خودای گەورە خۆی بەكەسانێكی تایبەتی خۆی دەبەخشێ كەواتە ئەوكەسانە دەگرێتەوە كەیەكیان خۆش بوێ .

## (زانایان لەسێ بۆچووندان لەلێكدانەوەی)

**بۆچوونی یەكەم** : ((عیسی كوڕی دینار ، دەڵێت: (مەبەست پێ ی ئەومیە كەخودا لەناخۆشی یەكانی ئەو ڕۆژەیان بەدوور دەخات ودەپارێزێ و ڕێزی تایبەتیان لێ دەگرێت ، خودا دەیان پۆشێ هەربۆیە ووتراوە ((السلطان ظل في الارض)) پادشای دادپەروەر (سێبەر)ی خودایە لەزەویدا .

**بۆچوونی دووەم** ، هەندێك دەڵێن، لەوانەیە مەبەست لە((الظل)) لێرەدابریتی بێ لەحەوانەوەو بەهرە ڕژاندن بەسەریاندا وەك چۆن ووتراوە ئەو لەژیانێكی ((في ظل ظليل)) دایە مەبەست پێ ی خۆش وبەختەوەرو ئاسوودە وكامەران دایە.

**بۆچوونی سێیەم** ، ((القاضي)) دەڵێت، ( ئێمە لەفەرموودەكەی خودا وادەگەین كەلەژێر (سێبەر)ی خودان كە لەگەرمای وتینی (خۆر)و (ڕۆژ) یان لەسەر لادەبات ، تین وهەڵمی ئەو خەڵكانەو بۆن و ناخۆشی ئارەق و ناخۆشی بۆنی هەناسەكانیان لێ دەپارێزێ .

**بۆچوونی چوارەم** : ((منی هەژار بۆمیهرەبانی خودا دەڵێم)): ( ئێمە فەرموودەكە وەردەگرین وەك خۆی كە خودا خۆشەویستانی لەپێناوخۆی دەخاتە ژێر (سێبەر)ی خۆی ئینجا ئەو (سێبەر)ە بریتی بێ لەوەی كەخودا خۆی فەرمانی پێ بدات یان

لەژێر(سێبەر)ی (عەرش)دا دەبن وەك هەندێ ریوایەت هاتووە ((فی ظل العرش)) بڕوانە (صحیح الجامع الصغیر برقم : (١٩٩٧) . ئەگەر بێتو خودا لەژێر سێبەری عەرشەکەیدا پەنات بدات ئەوا بێگومان هەرسێ بۆچوونی زاناکان کەباسمان کرد بەتێکرا جێ گەی دەبێتەوە لەژێرسێبەری، هەر لەپاراستن لەهەموو ناخۆشی یەکانی ئەو رۆژە کاتێکیش لەم ناخۆشیانە بپارێزرێی بێگومان ئەوە مانای دووەمە کەرێزت لێنراوە ؛ کاتێکیش رێزت لێ بنرێ تۆ لەهەموو خۆشی یەکدای .

## (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)

١) لەرۆژی قیامەتدا خودا یەکسەر وبێ پەردە قسەلەگەڵ خەڵکی دەکات .

٢) گرنگترین کار بۆئەورۆژە سوودمان پێ بگەیەنێ خۆشەویستیمان بۆ یەکترە لەپێناو خودا دا.

٣) خودا بەتایبەت لەوکەسانە دەپرسێت کەخۆشەویستیان لەپێناوی ئەودابووە .

٤) لەبەرخودا وفەرمانی ئەو بەجێهینان بێت نەك لەبەر هیچ بەرژەوەندیەکی تربێت .

٥) ئەورۆژە رۆژیکە جێ ی پاداشت وەر گرتنەوەیە بۆئەوکەسانە تام ولەزەتیان لەخۆشەویستی یەکتر کردبێ لەدوونیا پشت گرتن وکۆمەکی یەکتر کردنیان کردبێ لەبەرخودای گەورە پاداشتیان بەچاکترین شێوە دەدرێتەوە کەهەموو خەڵك ئاواتە خوازی ئەو جۆرە خۆشیانەن .

٦) لەورۆژەدا هیچ (سێبەرێ)ك نی یەو هیچ شتێك نی یەمرۆڤ بتوانێ پەنای بۆببات بۆئەوەی هەندێك لەگەرمایی وناخۆشی ئەورۆژەی لەسەر کەم بکاتەوە

٧) تەنها(سێبەر)ی (خودا) نەبێ کەجێ ی حەوانەوە وپەنادانە بۆلا بردن ونەهێشتنی هەموو تەنگو چەڵەمەیەك .

٨) نەبیٚ لەژیانی دوونیاماندا خۆشەویستی راستەقینە بکەین لەپیٚناو خودادا بۆ ئەوەی لەو (رۆژ)ە کەژیانی دوا( رۆژ)ە فریامان بکەویٚت .

٩) ناخۆشترین وترسناکترین رۆژ ئەو رۆژەیە کەجیٚ ی ئەومیە مرۆڤ هەموو خەمیٚکی بۆ هەل' کیٚشیٚ ولەهەمان کاتدا کاری بۆبکات بۆئەوەی ئەو رۆژەی مسۆگەر بکات لەژیٚر (سیٚبەر)ی خودای گەورە .

١٠) هەرچ خۆشەویستیەك هەبیٚت بیٚجگە لەبەر خۆشەویستی خودای گەورە پووچەڵە وهاوارو نەفرین لەیەك دەکەن وەك قورئان دەفەرموویٚت :(( {الْأَخِلَّاء يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ }٦٧{}) سورةالزخرف الاية٦٧

واتە : خۆشەویستان دەبنەدووژمنی یەك بیٚ گومان ئەگەر لەبەر هەر بەرژەوەندی یەك بیٚت تەنهاخۆشەویستی خودای گەورەی لیٚ دەرچیٚ.

- ئەگەر خۆشەویستی نەبیٚت ژیانی دوونیا هەرگیز بەردەوامبوو نی نابیٚت((نووسەر))
- خۆشی وبەختەوەری وکامەرانی تاسەر وبیٚکۆتایی نی یە، بەهەمان شیوە ناهەمواری وناخۆشی هەتا هەتایە بۆ کەس نەبراوەتەوە، بەڵکو ئیٚمە بە هزرەکانمان هەستی بە خۆشی وبەختەوەری یان ناخۆشی وناهەمواری دەکەین)) دیکارت.

## ((وجوب عيادة المريض ، وانك لوعدت المريض لوجدت الله عنده ؟))

عن ابى هريرة- رضى الله عنه —قال :قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ((ان الله- عزوجل – يقول —يوم القيامة : يابن آدم امرضت فلم تعدني . قال :يارب ! كيف اعودك وانت رب العالمين ؟ قال : اما علمت ان عبدى فلاناً مرض فلم تعده ؟ اما علمت انك لوعدته لوجدتني عنده ؟ يابن ادم ! استطعمتك فلم تطعمني.قال :يارب !وكيف أطعمك وانت رب العالمين . قال اما علمت انك لو اطعمه لوجدت ذلك عندي ؟ يابن ادم استسقيتك فلم تسقني !قال كيف اسقيك وانت رب العالمين ؟ قال : استسقاك عبدى فلان فلم تسقه اما إنك لوسقيته لوجدت ذلك عندي)) . رواه مسلم (١) في صحيحه.

## (پێوستبوونی سەردانی نەخۆش،وئەگەرسەردانت کردخودات لەوێ دەدی)

لەباوکی هورەیرەوە -خودای لێ رازی بێ- وله پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)((ان الله تعالى —يقول: ((يوم القيامه))خودای گەورە دەفەرموێت: لەرۆژی زیندووبوونەوەی - بوونەوەردا —((يابن آدم ! مرضت فلم تعدني )) . ئەی ئەوەی ئادەم ! نەخۆش بووم نەهاتیتە سەردانم )) قال : ((يارب ! كيف أعودك وانت رب العالمين)) ؟ ووتی : ئەی خودام ! چۆن سەردانت بکەم تۆخوداو پەروەردگاری هەمووجیهانەکانی ؟ قال ((اماعلمت ان عبدي فلانامرض فلم تعده))؟خودای گەورە فەرمووی ئەی ئایا نەتزانی کەفلآن بەندەی من نەخۆش بوو نەچوویتە سەردانی ؟ ((اما علمت انك لو عدته لو جدتنى عنده ؟)) خودا دەفەرموێت: ((ئەی نازانی کە ئەگەر تۆسەردانت بکردایە منت لای ئەودەدی ؟ ((يا ابن آدم ! استطعمتك فلم تطعمني )) خودای گەورە فەرمووی ئەی نەوەی ئادەم داوای خواردنم لێ کردیت خواردنت پێ نەدام . قال : ((يارب! وكيف أطعمك وانت رب العالمين )) کابرای دەڵێ ئەی خودایە! چۆن خواردنت پێ بدەم و تۆ

---

١)اخرجه مسلم في كتاب البروالصلة والاواب —باب فضل عياده المريض —برقم (٤٣- (٢٥٦٩).واخرجه الامام احمد في المسند والترمذي جميعهم من حديث ثوبان رضى الله عنه ..

خۆت پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی؟ قال : ((اما علمت انه استطعمك عبدی فلان فلم تطعمه)) ؟ خودافەرمووی ئەی نەتزانی کەفلان کەسی بەندەم داوای خواردنی لێ کردی وتۆپێت نەدا؟ ((اما علمت انك لو اطعمته لوجدت ذلك عندی)) ؟ خودای گەورە فەرمووی ئەی نەتزانی ئەگەر تۆخواردن پێ بدایە ئەوا لای منت بەدەست دەکەوتەوە؟ ((يا ابن آدم إستسقيتك ، فلم تسقني)) . خودا فەرمووی ئەی نەوەی ئادەم داوای ئاووم لێ کردی، پێت نەدام . قال : ((يارب! كيف اسقيك وانت رب العالمين؟))کابرا ووتی : ئەی خودایە چۆن ئاووت پێ بدەم وتۆخۆت خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانەکانی ؟ قال: ((استسقاك عبدی فلان فلم تسقه)) : خودا فەرمووی فلان بەندەی من داوای ئاوی لێ کردی تۆپێت نەدا؛ ((اما انك لوسقيه لوجدت ذلك)) . خودافەر. خودافەرمووی ئەگەرئاوت پێ بدایە ئەوا تۆئەوەت لای من دەدی)) .

## ((لێکدانەوەی زاناکان بۆفەرموودەکە))

ئیمامی(نەوەوی)دەڵێت : زانایان دەڵێن: خودا نەخۆشی دەداتەپاڵ خۆی کەنەخۆشی کەنەخۆشی بەندەکەیەتی وەك رێزلێنانێکە بۆنەخۆش ونەخۆشی.

زانایان دەڵێن: واتای ((وجدتني عنده)) مەبەست پێ ی ئەوەیە پاداشتت لای من وەردەگریتەوە . هەمووڕێزێك ومیهرەبانی یەکی گەورەت دەست دەکەوت .هەربۆیە لەکۆتایی فەرموودەکە دەفەرموێت ((لواطعمته لوجدت ذلك عندي، ولواسقيته لوجدت ذلك عندي)) ئەجروپاداشتت وەردەگریتەوە لەلای من .

**منیش** ((**بەندەی هەزار بەمیهرەبانی خودای گەورە**)) **دەڵێم** : ئەگەربێت وجوان ورد وبیربکەینەوە لەفەرموودەکە بۆنەخۆشی یەکە دەفەرمووێت ((اما علمت انك لو لوجتني عنده) واتا:- منت لای نەخۆشەکەدەدی . بەڵام لەدووجێگەکەی تردا ((اما علمت انك لو اطعمته لوجدت ذلك عندي))؟ یان دەفەرمووێت : ((اما علمت انك لو اسقيته لوجدت ذلك عندي)) ئەوا تۆئەوە ت لای من بەدی دەکرد وو دەست دەکەوت واتە

پاداشتەکەی لەئەمڕۆدا . بەلاّم بۆیەکەم فەرمووی ((منت دەدی لای نەخۆشەکە)) بێگومان ئەم جۆرە دەربڕینە واتای تایبەتی خۆی هەیە جیاوازە لەدوو ووتەکەی تر کەدەفەرمووێت ((لوجدت ذلك عندي)) سەردانەکانت پاداشتی خۆیت لەسەر وەردەگرتەوە لای من)) .

ئەمەش بێگومان وەك ئەوەی کەخودا ڕێزی تایبەتی لەنەخۆش گرتووە خودا خۆی دەخاتە جێ ی ئەو نەخۆشە لەکاتێکا کەخودا نەخۆشی وهیچ کەم وکورتی یەکی نی یە ونەبووە ونابێ بەلاّم بۆیە بەم شێوەدەری بڕی بۆئەوەی گەورەیی نەخۆش وسەردانی کردنی بۆئێمە دیارو روون وئاشکرا بکات ، لەهەمان کاتدا ئەگەربێتوو سەردانی نەخۆش نەکرێ هەرەشەی بێ وێنەی خودایی تیادایە بۆ مرۆڤ .

## (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)

١) خودای گەورە سەرزەنشتمان دەکات لەبەرامبەر کەم وکورتی وکەم تەر خەمی مان بەرامبەر یەکتر .

٢) گەورەیی نەخۆش؛سەردانی کردنی دیاروئاشکرایە لەم فەرموودەدا .

٣) هەڕەشەی خودای گەورە بۆکەسێك بیانوی باوو گونجاو راست نەبێ سەردانی نەخۆش نەکات .

٤) خودا خۆی دەخاتەجێ ی نەخۆش بۆئەوەی نەخۆش دڵی بەم کارەی خوداش خۆش بێ و هاندانیشە بۆ ئەوەی خەڵکی بچن بۆسەر دانی نە خۆش .

٥) مافی هەمووکەسێك دەدات کەبەرەڤانی لەخۆی بکات کاتێ تاوانێکی دەخرێتە پاڵ

٦) گوێ بیستی هێنانەوەی بیانووەکەی دەبێ.

٧) لەپاشان تۆڵەوسزای بەپێ ی تاوانەکەی دەدرێت بەهیچ زیادو ستەمێك .

٨) ئەگەرکەسێك پێویستی بەخواردنێك هەبێت پێویستە خواردنی بدرێت ئەمەش لای خودای گەورە وون نابێ بەداکۆکی کردن لێ ی یان بەفەراموۆش لێ کردنی .

٩) بەهەمان شێوە ئاوگرتنەوەیەك لەجیران یان لەهەرکەسێ پێویست بێ هەمان پاداشت پاتۆڵەی بەردەوێ

١٠) خودای گەورە ناوی کەسی نەخۆش وبرسی وتینوو دەهێنێ .بەئەمەش پڕبەهایی باوەڕدار دەردەخات

((تەنها یەك ماڵی بەختەوە رم پێ ببەخشە، هەموو نیشتمان بە بەختەوەر بۆ خۆت ببە)) عەققاد

(مەبەست ئەوەیە بەختەور ەی لەتاك و خێزانەوە دەست پێدەکات باڵدەکێشێت بەسەر هەموو کۆمەڵگادا)نووسەر

## ((تحريم ظلم العباد بعضهم لبعض))

عن ابى ذر الغفاري- رضي الله عنه- عن النبى- صلى الله عليه وسلم- فيما روى عن الله- تبارك وتعالى – انه (قال : ياعبادي ! انى حرمت الظلم على نفسي ، وجعلته بينكم محرما ، فلاتظالموا.وياعبادي كلكم ضال الامن هديته ، فاستهدوني أهدكم ،ياعبادي! كلكم بائع الامن أطعمته فاستطعموني أطعمكم ، ياعبادي كلكم عارٍ الامن كسوته ، فاستكسوني أكسُكم . ياعبادي َ انكم تخطئون بالليل والنهار، وانا اغفر الذنوب جميعاً ، فاستغفروني أغفر لكم . ياعبادي انكم لن تبلغوا ضري فتضروني ،ولن تبلغوني نفعي فتنفعوني . ياعبادي الوان اولكم واخركم وانسكم وجنكم كانوا على انقى قلب رجل واحدمنكم ،مازاد ذلك في ملكي شيئا ياعبادي ! لوان اولكم واخركم وانسكم واجنكم ، كانوا على افجر قلب رجل واحد منكم ،مانقص ذلك من ملكي شيئا . ياعبادي ! لوان اولكم واخركم وانسكم وجنكم ، فاموافي صعيد واحد ،فسألوني ، فاعطيت كل انسان مسألته ، مانقص ذلك مما عندي الا كما ينقص المخيط اذا ادخل البحر ،ياعبادي! انما هي اعمالكم أحصيهالكم، ثم اوفيكم اياها ، فمن وجدخيراً فليحمدالله ، ومن وجدغير ذلك فلا يلومن الا نفسه)) رواه امام مسلم (١) في صحيحه .

## ((قەدەغەو حەرام كردنی ستەم و زۆر لەیەكتری)) .

لەباوكی زەڕ رەوە- رەزای خودای لێ بێ- وله پێغەمبەرەوە(صلى الله عليەوسلم) لەخودای گەورەوە دەگێڕێتەوە كەخودا فەرموویەتی (( ياعبادى ! انى حرمت الظلم على نفسى)) واتە : ئەی بەندەكانم من ستەمم لەخۆم حەرام كردووە كەلەهیچ لەكەسێكی بكەم زانایان دەڵێن : (واتای ستەم ئەوەیە لەسنووری خۆی دەرچێ ئەمەش

---

(١) اخرجه الامام مسلم في كتاب البر والصلة والاداب –باب :تحريم الظلم ، برقم : (٥٥(٢٥٧٧)واخرجه الاماحمد في المسندايضا والترمذى في ابواب الرهد باب: (١٥) برقم (٢٤٩٤)وابن ماجه في كتاب الزهد-باب :ذكرالتوبة برقم : ((٤٢٥٧)

مەحاڵە بەکار بهێنرێت بۆخودای گەورە چونکە هەمووی لەژێر سنووری خۆدای گەورەدایە؛ بەهەمان شێوە ئەوەش دەگرێتەوە کەلەسنووری خەڵکانی پێ ببەزێنی ، ئەمەش دووبارە مەحاڵە بۆ خودای گەورە چونکە هیچ کەسێك لەسەرووی خوداوە نی یە ، هەتا خودا سنووری ببەزێنێ بەڵکو جیهانەکان و ئەوانەش وا تیایدایە موڵك و سامانی خودا خۆیەتی ؟(( وجعلته بینکم محرماً)) لەنێوان ئێوەشم بۆیەکتر قەدەغە کردووە. ((فلا تظا لموا)) دەی کەواتە ئێوەش ستەم کارمەبن لەیەکتر ، ئەمەش دووبارە دڵنیا کردنەوەیە لەقەدەغە کردنی ستەم وستەمکاری.

((یاعبادي کلکم ضال الا من هدیته)) ئەی بەندەکانم هەمووتان گومڕان وسەر لێشێواوون مەگەرکەسێکتان نەبێت کەمن ڕێنموویی ورووناکیم پێ بەخشی بێ .ئەمەش واناگەیەنێ کەپێچەوانەو دژاری یەتی فەرموودەکەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەکات کەدەفەرمووێت ((کل مولود یولد علی الفطرة)) چونکە ئەمەیان باس لەبێگەردی خاوێنی فیترەت دەکات کەخودا بۆئێمەی هەڵبژاردووە.

دووەمیان : باس لەوەدەکات کەلە هەمووشتێکا پێویستمان بەکۆمەکی ویارمەتی خودا هەیە چونکە ئەوەندە لادەرەکان زۆرن هەر تەنها خودا خۆی ئێمەی لێ ڕزگار دەکات بۆیە دەفەرمووێت ((فاستهدوني اهدکم))دەسا ئێوەداوای هیدایەت ورێنموویم لێ بکەن من ڕێگەتان بۆروون دەکەمەوە واتەهیچ کەس بابەخۆیدا نەنازێ کەهۆشمەندە بۆیە ڕێگەی ڕاستی زانیوە بەڵکو لەخواوەوەی بزانێ.

((یا عبادي کلکم جائع الامن اطعمته)) هەمووتان برسین ئەگەرمن ڕۆزیتان نەدەم وتێرتان نەکەم .

(( فاستطعموني اطعمکم)) ئێوەداوای ڕۆزیم لێ بکەن ڕۆزیتان دەدەم .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەخودا خۆی ئەگەر نەیەوێ تێربین هەمیشە بەبرسی دەمێنیینەوە ئەگەر خودا توانای کاسپی کردن وپەیداکردنی ڕۆزی وهۆکارە کانمان بۆئاسان نەکات هەردەم برسی دەبین .

((یاعبادي کلکم عارٍ)  ئەی بەندەکانم هەمووتان رووت وبێ جل وبەرگێ ئەگەر من جل و بەرگتان بەبەرگتان نەکەم وهۆشی ئەومتان پێ نەدەم کەخۆتان بپۆشن ((فاستکسوني اکسکم )) داوای ئەوەم لێ بکەن هەردەم بتان پۆشم ئەوا منیش دەتان پۆشم.

(( یاعبادي ! انکم تخطئون باللیل والنهار )) ئەی بەندەکانم ئێوەدەکەونە هەڵەوە بەشەو بەرۆژ.

((وانا اغفر الذنوب جمیعاً)) من لەهەمووتاوانەکانتان خۆش دەبم ((فاستغفروني اغفرلکم )) داوالێ خۆشبوونم لێ بکەن لێتان خۆش دەبم .

((یاعبادي! انکم لم تبلغوا ضري فتضروني)) ئەی بەندەکام ئێوەناگەنە ئەوەی کەبتوانن زەرەرم پێ بگەیەنن بۆئەوەی زەرر مەندم بکەن .

((یاعبادي لن تبلغوا نفعي فتنفعو ني)) ئەی بەندەکانم ئێوە ناگەن وناتوانن سوودم پێ بگەیەنن بۆئەوەی سود مەندم کەن .

((یاعبادي لو ان اولکم واخرکم)) ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم مرۆڤ وکۆتامرۆڤتان ((وانسکم وجنکم)) بەمرۆڤەکان وجنۆکەکانەوە .

(( کانوا علی انقی قلب رجل واحد منکم )) هەمووتان لەسەردڵی یەك کەستان بن لەوپەڕی خاوێن ی ولەخودا ترسیدابێت.

((مازاد ذلك في ملکی شیئا)) هیچ لەمۆڵکی من زیاد نابێ بە  ئەوەی کەئێوە هەمووتان بە تێکڕای چاك بوون .

((یاعبادی لوان اولکم واخرکم وانسکم وجنکم)) ئەی بەندەکانم ئەگەریەکەم وکۆتاتان بەمرۆڤ وجنۆکەوە .

((کانوا علی افجر قلب رجل واحدمنکم، مانقص ذلك من ملکی شیئا))ئەگەرهەمووتان لەسەردڵی پیاوێکی خراپ بێت لەخراپی دا ئەوا هیچ لەمۆڵکی من کەم ناکاتەوە .

((لوان أولکم واخرکم وانسکم وجنکم فاموافي صعید واحدفسالونی )) ئەگەر هەمووتان لەیەکەم وکۆتاکەسەوە بەمرۆڤ وجنۆکەوە لەدەشتایی و چۆلاییەکدا بن داوابکەن لێم .

((فأعطيت كل انسان مسألته))بۆهەركەسێك داواكەی پێ ببەخشم .

(( مانقص ذلك مماعندی )) هیچ لەوەی لای منەكەم نابێتەوە.

((الاكما ينقص المخيط اذا أدخل البحر))واتە: ( ئەوەندەنەبێ كەچۆن دەرزی یەك بكرێت بەناودەریایەكدا چەندی لێ هەلْ دەگرێتەوە).

**زانایان دەڵێن** : (ئەمەی خودای گەورە دەفەرموێت:((الا كما ينقص المخيط اذا أدخل البحر))واتە: ( ئەوەندەنەبێ كەچۆن دەرزی یەك بكرێت بەناودەریایەكدا چەندی لێ هەلْ دەگرێتەوە ).

بۆنزیك كردنەوەیە لەتێگەیشتنەكانی ئێمەیە ،كەئەویش واتا كەی ئەوەیە كەهیچ كەم ناكاتەوە بۆیەش ئەم نمونەیە بەدەرزی ودەریاهێناوە ؛ چونكە بچوكترین شت كە نمونەی پێ بهێنریتەوە كە كەمترین ئاوهەلگرێ وكەمترین شت كەئاوی لێ هەلْ گیرێ بە دەرزیە وئاوی لێ كەم نابێتەوە دەریاكانە ئەمەش بۆیە نمونەی پێ هاتۆتەوە چونكە دەریا گەورەترین شتە كەخەڵك دیبینێ وەك ووتمان دەرزیش بچوكترین شتەكە كەمترین ئاو هەلْ دەگرێ لەگەلْ خۆی كە بخرێتە ناو دەریاو دەربهێنرێتەوە ئەمەش لەكاتێكا كەدەرزی خۆی ووشكە وتیژو لووس وسافە ئاوی هەر زۆر كەم پێوە و ە دەوەستێ .

((ياعبادی ! انما هی اعمالكم أحصيها لكم)) ئەی بەندەكانم ئەوە كارەكانی خۆتانە بۆتان دەژمێرم ولەسەر یەكتان بۆدادەنێم هەموویيتان پێ دەبەخشمەوە.

((فمن وجد خيراً فليحمدالله)) هەركەسێ خێری دەست كەوت ئەوا باسوپاسی خودای لەسەر بكات.

((ومن وجدغير ذلك فلا يلومن الا نفسه)) ((هەركەسێ خێری نەبینی ودەستی نەكەوت بەلكو پاداشتی خراپەی درایەوە باتەنها گازندە لەخۆی نەبێ لەكەسی تر نەكات)) .

## *(گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)*

١. خودا ی گەورە خۆی بەخۆی لەسەرخۆی هەموو شێوە ستەم كردنێكی حەرام كردووە .

٢. بەهەمان شێوە لەسەرئێمەشی حەرام كردووە وقەدەغەو (بڤەیە) ئەگەر هەرج شێوە ستەمێك بكەین گەورەبێ یان بچووك لەخۆمان بێت یان لەهەركەسێكی تر بێت لێ ی بەرپرس بین یان لێ ی بەر پرسیاربینیان بەپێچەوانەوەش .

٣. هەمووپێویستی بەهیدایەت وچاودێری خودا هەیە بۆهەڵ بژاردنی ڕێگەی ڕاست

٤. ئەگەر خودا كەسێك هیدایەت نەدات هەمووكەس ناتوانن هیدایەتی بدەن .

٥. ئێمەهەردەم پێویستمان بەپاڕانەوەهەیە بۆئەوەی ڕێگەی ڕاست بگرینەبەر .

٦. ئەگەر داوابكەین خودا ڕێگەمان نیشان دەدات بەرەو خۆیمان دەبات كەلێمان.ڕازی بێت .

٧. ئێمە هەربرسی وتێنوو ڕووتین ئەگەر خودا نەمان پۆشێت بەبەهرەو چاكەو میهرەبانی خۆی نەبێ جابۆیە هەردەم ئێمە دەبێت بپاڕێینەوەكەخودا چاودێریمان بكات ڕۆزی وتێنوویەتی مان بشكێنی وبمان پۆشێ.

٨. هەموومرۆڤەكان هەردەم بەشەوو بەرۆژ لەهەڵەدان وخودایش خۆی لەهەمووتاوانەكان خۆش دەبێ ، بەلاّ م ئێمە پێویستیمان بەوەهەیە داواو پاڕانەوەی لێخۆشبوون بكەین لەخودا.

٩. ئەگەرلەیەكەم مرۆڤ وجنوكەوە هەتا دوایین مرۆڤ وجنوكەوە هەمووبەتێكڕاموسڵمان وپیاوچاك بێت هیج لەموڵكی خودازیاد ناكاتەوە .

١٠. ئەگەر لەیەكەم مرۆڤ وبەجنوكەوە هەتا دوایین مرۆڤ وبەجنوكەوە هەموو بەتێكڕا بێ بڕواوخراپكاربن هیج لەمۆڵكی خودا كەم ناكاتەوە .

١١. ئەگەرهەمووشیان کۆببنەوە لەسەر (دەشتایی) یەك کەهەرکەسەو داواو پاڕانەوەی خۆی هەبێ بەهەر هەموو ببەخشێ هەرچی کەدەیانەوێ هیچ لەمولکی خودا کەم ناکاتەوە تەنهائەوەندەی دەرزیەك نەبێت کەبخرێتە ناو دەریایەك ودەربهێنرێتەوە چەند ئاو لەگەڵ خۆی هەڵ گرێ ئەوەندە لەمولکی خودا کەم کەم دەبێتەوە.

١٢. هەمووکردەوەکان بەخێروچاکە وشەڕوخراپە وەخودا بۆت هەڵ دەگرێ بەبێ هیچ زیادو کەمێك .

١٣. هەرکەسێ چاکەی زۆر بوو پاداشتی خودا بۆی لەکارو ووتەکانی زیاتربوو ئەوا باسوپاس وستایشی خودا بکات کەهەرچاکەی بە(دە)چاکەو زیاتریش بۆنووسیوە.

١٤. بەلاّ م هەرکەسێ خراپەی دی و تۆڵەی خراپەی لێ سەندرایەوە ئەوا تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات چونکە ئەوەندە خراپەی کردووە زاڵ بووە بەسەر چاکەکانیدا لەکاتێکا کەهەر خراپەك بە(یەك) دەنووسرێ یان خودا لێ ی خۆش دەبێ ئەگەر هاتوو خراپەکان مانەوە زاڵ بوون بەسەر چاکەکانیدا ئەوا بابزانێت هەرخۆی هۆکاری ئەوخراپانەیە.

١٥. هیچ کەس دەسەلاّتی ئەوەی نی یە خراپەت پێ بکات ئەگەر خۆت نەبی خراپەکار.

١٦. هەریەك لەئێمە لەم دوونیایەدا دەرفەتی هەڵبژاردنی ڕێگەی چاك یان خراپ وەك دەرفتی ئەنجامدانی کاری چاکت هەیە یان خراپ ؛ بەڵام لەدوارۆژ بەهەمووچاکەو خراپەکانت دەگەیت هیچ لەخودا وون نابێت :(فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ {٧}وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ{٨}).

١٧. هەرچەندە تاوان وهەڵەبێت ئەگەر گەڕانەوەداوای لێخۆش بوون هبێت خودا لێی خۆش دەبێ.

١٨. بەڵام ئەگەر داوای لێخۆشبوون نەکات خودالێی خۆشنابێت؛ چونکە مەرجی (تەوبە) ئەوەیە مرۆڤ دوای هەڵەکە داوای لێخۆشبوون بکات بەڵام ئەگەر ئەوکەسە بێ باك بێت و پێویستی بەداوای لێخۆشبوون نەبێت خودا چۆن لێی خۆش دەبێ؟!.

١٩. دەوڵەمەندی و سەخاوەتی خودای گەورە لەبێ ژمارە.

٢٠. هەکەس چاك بێت یان خراپ بێت هەربۆخۆیەتی . خودای گەورە پەك وباکی بەکەس نەکەوتووە وناکەوێ.

٢١. بەڵام رێگەی راستی بۆ بەندەکانی هەڵبژاردووە وپێی خۆشە : (وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ).سورة الزمر٧

٢٢. بەهەمان شێوە ئەوپەڕی گەڕانەوەی بەندە یاخی بووانیسشی پێخۆشە (لله اشد فرحا بتوبة احدكم - - - - -)

- ((بەختەوەری (تۆپێکە) ئێمە بە پێ یاری وگەمەی پێ دەکەین لە کاتێکا لە لێمان نزیك دەبێتەوە، کاتێك لێمان دوور دەکەوێتەوە ئێمە بەرا کردن بەدوایدا رادەکەین)) قاسم ئەمین.

- ئێمە پێ دەگەین وگەورەدەبین لە سەر ((بەختەوەری بریتی یە لە وهەست پێ کردنەی کە دەروون دەخەوێنێتەوە ئەوەی کە بالاً پۆش ونوقمت دەکات لە خۆشی یەکانی کاتێ خۆشی یەك دەخەیتە دڵی خەڵکانی ترەوە)) رێلکە.

- ئەوەی کە ئێمە لە بڕوامانـدا یە کە بەختەوەری لە وەرگرتنـدا یە لە پاشاندا بۆمان دەردەکەوێ وبە دڵنیایی یە دەزانین کە بەختەوەری لە بەخشیندا بەدەست دێت)) سۆمرست مۆم.

## ((من احب لقاء الله احب الله لقاءه))

عن ابى هريرة -رضيالله عنه-ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال : (قال الله – عزوجل :- اذا أحب عبدي لقائي أحببت لقاءه ،واذا كره لقائي كرهت لقاءه) رواه البخاري (١).

## ((هەرکەسێ خۆشی گەیشتنی بەخودابێت خودایش خۆشی بەوە دێت کەبگات بەو بەندەیە ))

لەباوکی هورمیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) کە بەراستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : خودای گەورە فەرموویەتی ((اذا احب عبدي لقائي)) ئەگەربەندەم حەزو خۆشی بەوە بێت کەبگاتە لام)) ((أحببت لقاءه)) منیش خۆشی وحەزم بەگەیشتنی ئەو بەندەیە دەبێ ((واذا کره لقائي)) بەلاّم ئەگەر حەزوخۆشی بەومنەیەت کەبەمن بگات ((کرهت لقاءه)) منیش حەز وخۆشیم بەگەیشتنی ئەوکەسەنایەت ؟

## ((لیکـدانەوەی زاناکان ))

زانا (ئەل قەستەلاّنی) :دەڵێت خەتتابی دەڵێت: ((احب لقائي)) مەبەست ئەومیە مرۆڤ دوا رۆژ بدات بەسەر ئەم دوونیایەدا واتە: کاری زیاتری بۆدوواڕۆا بێت : حەزنەکات زۆر لەم دوونیایەدا .بمێنێتەوە؛ بەلاّم حەزبەوەبکات هەردەم خۆی زۆر لەم دوونیایەدا بمێنێتەوە ، بەلاّم حەزبەومبکات هەردەم خۆی بۆئامادەبکات.

---

(١) اخرجه البخارى في كتاب التوحيد-باب قوله تعالى ((يريدون ان يبدلواكلام الله)) واخرجه البخارى ايضاًفي الكتاب الرقاق –باب :من احب القاالله .واخرجه مسلم في كتاب الذكر واالدعاء والتوبه والاستحفار –باب :-من احب القاء الله احب الله لقاءه – برقم :١٤-(٢٦٨٣) . واخرجه الترمذي فى ابواب الجنائز باب :ماجاء فيمن احب لقاء الله : قم(١٠٦٦)) . واخرجه النسائى في كتاب الجنائز وتمنى الموت- باب :فيمن احب لقاء الله برقم ١٩٦٢-

**منیش دەڵێم**: ((**بەندەی هەژار بۆمیهرەبانی خودا**))حەزبەتەمەن درێژی بکات بەڵام بۆئەوەی زۆرترین عیبادەتی خودای گەورە بکات وخودا لەخۆی رازی بکات ؛بە ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەجێ دەهێنێت کەدەفەرمووێت ((خیرکم خیرکم من طال عمره وحسن عمله)).

واتە: باشترینتان لەئێوە ئەوەتانە کەتەمەنی درێژ کرەوەی باش وچاك وجوانی هەبێت . بەپێچەوانەوەش خراپترین مرۆڤ ئەوکەسەیە کەتەمەنی درێژ بێت وکرداری خراپی هەبێت . (کۆتایی هات)

## گەیشتنی خودایش چەند شێوازێکی هەیە :

**یەکەم** :- گەیشتی ڕاستەوخۆ لەنێوان بەندەو خودای گەورە

**دووەم** :- گەیشتن بەرۆژی دووایی وەك خودا دەفەرمووێت : (( {٣٠}**قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَاء اللّه)) الانعام :٣١،)**

**سێ یەم** :–گەیشتن بەمردن وەك خودا دەفەرمووێت : (( {**مَن كَانَ يَرْجُولِقَاء اللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ اللَّهِ لَآتٍ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ** {٥)) **العنكبوت :٥))**

( نەووەوی )-رەحمەتی خودای لێبێ- دەڵێت : (کاتی سەرە مەرگ ئەگەر مرۆڤ ڕازی بوو بەمردن ئەوا خودایش ئەوەی دەوێ .ئیبن ئەپیر دەڵێ : مەبەست بەگەیشتن خودا پشتەوە دانە بۆژیانی دوا رۆژ ، هیوای خێری لای خودات هەبێت مەبەستی پێ مردن نی یە چونکە مردن هەموو کەس پێ ی ناخۆشە). بەلاّم لەراستیدا هەر کەس لەدونیا نەخەڵەتێت بەو دونیاو رازاوەییە کەی حەزی بە میهرەبانی خودا هەبێت؛ ئەوە حەزی بەگەیشتن بەلای خودای گەورە ی هەیە هەرکەسێکیش خراپەکاربێ هەموو شتێکی هەربۆدوونیا و دوا رۆژی هەر لەبیرنەبێ ئەوا ئەم جۆرەکەسانە حەزیان بەگەیشتن بە لیقای خودانی یە بۆیە خودایش حەزی بەئەونی یە .بەلاّم مەبەست لەخۆشەویستی خودا بۆبەندە ((محبة الله للقاء عبده)) ئەوەیە خودا خێری دەست گیر دەکات وچاکەی بەسەردا دەڕژێنێ شادی دەکات بەبینی خۆی لە بەهەشتدا

**(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

(١) خۆشەویستی هەیە لەنێوان (خوداو بەندە) بەڵام خۆشەویستی خودای گەورە ئەوەیە دەبارێنێ ودەرژێنی بەسەر بەندەکانیدا هەموو خێروو خۆشی یەکی دین ودوونیایی . بەڵام خۆشەویستی بەندە بۆ خودا ئەوەیە کەخودا خاوەن هەموو خێروخۆشی یەکە بەسەربەندەوە .

(٢) رق لێ بوونیش هەیە لەنێوان بەندەو خودای گەورە دا کاتێ بەندە خێرو بێرێك نەکات وئەنجامی نەدات خودایش ئەم جۆرە کەسەی ناوێ چونکە حەزی بەرازی بوونی خودانی یە لەکاتێکا کەپێویستی بەهەمووچاودێری وبەهەرمیەکی خوداییە بەڵام خودا کەپێویستی بەئەو نی یە دەوڵەمەندە لەئەو و لەهەموو جیهانیش؛ ئەگەر بەرەو خودا نەچیت خودایش تۆی ناوێ.

(٣) بەپێ ی کەم وزۆریت خودا تۆی خۆش دەوی یان رقی لێ دەبێتەوە ئینجا باپێوەرێك بۆ خۆت دابنێ بزانە تاچ رادەیەك خودات خۆش دەوێ وکاری چاك ئەنجام دەدەیت ، یان بەپێچەوانە تاچ رادەیەك خراپەکاری وئەوکات خودات نایەویت ؟!!

(٤) خوداگەورە مژدەت پێ دەدات وهەواڵی خۆشەویستی خۆیت پێ رادەگەیەنێ .

(٥) خودا گەورەئاگادارت دەکاتەوە ئەگەر تۆ خودات نەوێ خودایش پێویستی بەتۆنی یە بۆیە زۆر زوو هەر لەم چرکەیەدا خۆت بگۆڕە وحەزت بەگەیشتنی خودا هەبێ بۆئەوەی یەکسەر خوداگەورە خۆشەویستیت رابگەیەنێت

(٦) چۆن بێت خودای گەورە بەهەمان شێوە دەبێت لەگەڵت .

(٧) خودا گەورە ستەم کارنی یە لەتۆ؛ خۆت بۆخۆت خۆشی وحەزبوونت هەڵبژێرە بۆلای خودا یان بەپێچەوانەوە .

(٨) مەرجە هەتاخودات خۆش نەویٚ خودایش تۆی خۆش ناویٚ.

(٩) هەتا رقت لەخودا وپەیامەکەی نەبێت خودایش رقی لێت نابیٚ .

(١٠) ێمەبمانەویٚ و نەمانەویٚ هەر لەبەندایەتی خودا دەرناچین .

(١١) لەیەکەم جاردا کەبۆخۆشەویستی هاتووە فەرمووی ((اذا احب عبدی لقائی)) ئەگەر بەندەکەم خۆشی بەمن بێت وەك ئەوەی پێت بڵێت وەر بەرەومن رێزت لیٚ دەنێم بەلاَم لەدووەمدا ووشەی ((عبدی)) بەکارنەهێناوە وەك ئەوەی بڵێتهەرکەسێخۆشی بەخودای گەورە نەیەت بێجگە لەخودای گەورە دەپەرستێت.

١. ئەگەر پشت بەستن بە جگە لە خودابیٚ هەموو سەر شۆڕیەك روو لە مرۆڤ دەکات لە هەموولایە کەوە .

﴿ باوکی فیراس حەمەدانی ﴾

٢. ئەگەر رازی بوونی خودا نەخەیتە پێش هەموو شتێکی تردەوە لە حەزەکانت ئەوا تۆبەدان بە خۆگر نادانرێت .﴿ باوکی عەتاهی یە ﴾

٣. تەنــها بۆ لای خـــودا بگەڕێوە نە بۆ ئەم لاو ئەولا چونـــکە بەندەی خودایت و خودای گەورە پادشـــاتە.

﴿ باوکی عەتاهی یە ﴾

٤. ئاگادار بن هەموو شتێك بێجگە لە خودای گەورە پووچەڵ هەموو بەهرەیەکیش دەڕوات و نامێنــــیٚ .

﴿ کەبیدی کوڕی رەبیعە ﴾

٥. دەستی خۆت توند گریٚ بدە بەپەتی خوداوە چونکە بەراستی هەر ئەو پایەیە کاتێك پایەکانی تر ناپاکیت لە گەڵ بکەن. ﴿ باوکی فەخری موسلڵی ﴾

٦. هیچ فەرمانێك نابیٚ بێتە جیٚ ئەگەر فەرمانی خودای گەورەی شکاند . ﴿ بنچینەیەکی فیقهی یە ﴾

## ((انا الملك انا الديان))

٢٢- عن جابر- رضي الله عنه عن ابن انيس رضي ا لله عنه قال: سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول :( يحشرالله العباد، فيناديهم بصوت يسمعهُ من بعد كما يسمعه من قرب : ((انا الملك انا الديان (١) رواه البخارى .

### ((خودا دەفەرمویت من پادشام وهەموو کەس ئەبێ چۆکم بۆ دانەوێنێ ))

٢٢- لەجابرەوە لەئۆنەیسەوە (رەزای خودالەهەموویان بێت) دەڵێت: ( گوێم لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بووە دەیفەرموو (( يحشرالله العباد) خودا بەندەكان كۆدەكاتەوە ، (فيناديهم بصوت ليسمعه من بَعد).

واتە: (بانگیان لێ دەكات بەدەنگێك هەمووكەسێ لەدوور گوێ ی لێ دەبێ وەك چۆن لەنزیكەوە خەڵكان گوێیان لێ دەبێ) : ((انا الملك )) واتە خاوەن هەموو دەسەڵاتێكم ((انا الديان ))واتە : (هیچ كەس خاوەن هیچ شتێك نی یە هەر من پاداشت دەری خێرم وتۆڵە سێنەری خراپە كارم ).

### ((زاناكان ولێكدانەوەی فەرموودەكە))

ئەم وشەیە ((ملك)) وەك ئەوەی لەسورەتی فاتیحەدا ((ملك يوم الدين))هاتووە پادشای رۆژی قیامەت وهەڵسانەوەو زیندوو بوونەوەی خەڵكی بۆیە بەتایبەت ئەم رۆژە ناودەبات چونكە هیچ تكاكردن وستەم كردنێك ماستاوچییەتی نی یە بەڵكو هەموو خەڵك دەڵێن خودایە بەس خۆم رزگار بكەیت. ((لەحلیمی وەرگیراوە))

---

(١) اخرجه البخارى فى كتاب التوحيد –باب: قول الله تعالى ((ولا تنفع الشفاعة عنده الا لمن اذن له الرحمن- - )) .أخرجه الامام احمد : وابو يعلى والخرائطى في مساوىء الاخلاق والطبراني والحاكم وصححه وافقه الذهبي برواية اتم من هذه .

**(گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی *كە لەم فەرمووده پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) لە بیرو باوەڕی موسڵمانە زیندووكردنەوەی هەمووخەڵك وبوونەوەر.

٢) گەورەیی ودەسەلاٌت وقسەو فەرمان رۆیشتوو هەرخودایە لەورۆژە دا هیچ نێوانێك وشتێك نی یە بكرێت لە تكاكار بۆئەورۆژە تەنها كرداری باش مرۆڤ نەبێت .

٣) خودای گەورە زیاتر قسەو باسی لەگەڵ بەندەكانە لەجنۆكەن ومرۆڤ بەلاٌم ئاژەڵەكان تەنها تۆڵەی یەكتریان لێ وەردەگرێتەوە .

٤) خودای گەورە بانگی خەڵكی دەكات هەموو كەس گوێ ی لێ دەبێ لەدوور ونزیك .

٥) هەمووكەسیش لێ ی تێ دەگات بەبێ ئەوەی هیچ پێویستی بەوەرگێڕێك هەبێ .

٦) ئەورۆژە موڵك هی كەس نی یە واتە: هەمووكەس رووتو وقووتە وموفلیسە تەنها موڵك هی خودای گەورەیە:(لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ {١٦})غافر .

٧) هەمووكەس نەبێت خۆی مل كەچ وسەر شۆڕ بكات بۆخودای گەورە بەتایبەت ئەوكەسانەی كەلەدوونیادا خۆیان بەخاوەن كەس وكارو دەسەلاٌت وسەروەت وسامان وهێز دەیان نازی .

٨) شێوازی بانگ كردنی خودای گەرورە وەك شێوازی بانگ كردنی هیچ دروست كراوێك نیە: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ {١١})الشوری.

٩) هەمووكەس بەماف هەقی تەواوی خۆی دەگات.

١٠) تەنانەت مافی ئاژەڵی بێقۆچ وەردەگیرێتەوە لە ئاژەڵی قۆچ دار وەك پێغەمبەر دەفەرموێت :((حتی يقاد للشاة الجلحاء من الشاة القرناء))

﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ سورة البقرة/١٥٢واتە : ( یادم بكەن یاددتان دەكەم)

یادی خودا بۆ ئێمە بەهەشتی دلاٌنە لە ڕووی ئەم زەوییەدا هەر كەسێك لێی بێ بەش بێت، لەبەهەشتی دوارۆژیش بێ بەش دەبێ. بەهەشتی ئەم دونیایە ڕزگار كردنی دەروونە لە ماندوویی و دڵە ڕاوكێی و ژەنگ و نەفامی، گرتنە بەری ئەم ڕێگەیەتی ڕێگە ئاسانكارو ڕێ خۆشكارە بۆ هەموو سەركەوتنێك و دڵ خۆشیەك ، دیوانەكانی نیگای خودا بخوێنەوە بۆ ئەوەی بە چاوی خۆت سوودكانی یادكردنەوەی پەروردگارت بۆ دەركەوێت ، لە ڕۆژانەی خۆتدا ئەو دەرمانە تاقی بكەردوە بۆ ئەودی بەشی شیفای خۆتی لێ وەرگری .

## ((الصفات التي يعرف بها في الدين اهل الجنة و اهل النار))

٢٣- عن عياض بن محار المجاشعي –رضى الله عنه –ان رسول الله (صلى الله عليه وسلم)) قال ذات يوم في خطبته (الا ان ربيامرني ان اعلمكم ماجهلتم مما علمني يومى هذا :.... وجاء فيها واهل الجنة ثلاثة ذوسلطان مقسط متصدق موفق ، ورجل رحيم رقيق القلب لكل ذي قربى ، ومسلم عفيف متعفف ذوعيال.قال: (واهل النار خمسة الضعيف الذى زبرله الذين هم فيكم تبعاً لايبتغون اهلاً ولا مالاً ، والخائن الذي لايخفى له طمع وان دق الا خانه، ورجل لايصبح ولايمسى الاوهو يخادعك عن اهلك ومالك ، وذكرالبخل اوالكذب والشنظير الفحاش)) .رواه مسلم (١)

## (( ئەورەوشتانەی کەهەر لەدوونیادا خەڵکانی دۆزە خییان پێ دەناسرێتە و خەڵكانی بەهەشتیشی پێ دەناسرێتەوە ))

٢٣- لە عیازی کوڕی موحاری ئەلەجاشعی یەوە -رەزای خودای لێ بێ- دەڵێت :جارێك ((پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ووتاری بۆخوێندین فەرمووی ((ئاگاداربن خودام فەرمانی پێداوم فێرتان بکەم ئەوەی کەئێوە نایزانن لەوشتانەی کەئەمڕۆ خودای گەورە منی لێ فێرکردووە:.... تیایدا هاتووە کەفەرمووی ((واهل الجنة ثلاثة)) خەڵكانی بەهەشتی ئەم سێ کەسانەن

یەکەم : ((ذوسلطان مقسط متصدق موفق)) خاوەن دەسەڵاتێك کە دادپەروەربێت چاکە کار وسەرکەوتووبێ لەکارەکانی .

دووەم: ((ورجل رحيم رقيق القلب لكل ذي قربى ومسلم)) کەسێکیش کەسۆزدارو بەبەزەیی بێت دڵی نەرم بێت بۆهەرخزمێکی خۆی وموسوڵمانانیتریش))

سێ یەم: ((وعفيف متعفف ذوعيال)) کەسێك خۆی (خاوێن) بێت و دەست لەکەس

---

(١) أخرجه الامام مسلم فى كتاب الجنه وصفه نعيمها واهلها باب :الصفات التى يعرف بها فى الدين اهل الجنه واهل النار برقم :٦٣ (٢٨٦٥) .

پان نەكاتەوە، وخۆیشی لەوە بەدووربگرێت كەچاوی لەماڵی خەڵك بێت ،خاوەن منداڵی زۆریش بێت و هەژاریش بێت .

((واهل النار خمسة)) **دۆزەخی یە كانیش پێنج كەسن** :

یەكەم : ((الضعيف الذي لازبر له)) لاوازێكە؛ كەهیچ خاوەن هۆش ومالْداری نابێت ((وهم فيكم تبعاً)) ئەوان لەناوئێوە رۆڵیان نی یە نەبۆئایین داری نەبۆ دوونیاداری بەڵكو بەس شوێن ئەم وئەو دەكەوون .

دووەم : ((والخائن الذى لايخفى له طمع وان دق الا خانه)) كەسێكی (خیانەت) كارە لەدەست وزمان وروحی پاك نی یە دەروون نزمە هەرچی حەز لێ بوو دەیكا ونایشارێتەوە باكەمیش بێت بێ نرخ وسودایەتیشی تیادابێ بۆی ئەو هەرناپاكی خۆی لێدەكات.

سێ یەم : ((ورجل لايصبح ولايمسي الا وهو يخادعك عن اهلك ومالك )) كەسێكیش كەهیچ بەیانی وئێوارە ناكاتەوە ئەگەر فێڵ وتەڵە كەیەكت بۆدروست نەكات لەخۆت وماڵ ومنداڵ وخێزانت.

چوارەم : وذكر البخل أوالكذب)). ((چاو چنۆكیش دۆزەخی یە یان فەرمووی درۆكار)).

پێنجەم : ((والشنظير، الفحاش)) (والشنظير) هەر لە فەرموودەكەدا واتای لێكدراوەتەوە كە ((فەحاشە)) كەبریتی یە لەكەسێك رەوشتی خراپ وبەدكاربێت )) چ بەزمان چ بە هەڵسو كەوت .

**(گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی *كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) بەهەشتییەكان ئەوسێ كەسەن(١)كەبەرپرسیارێكی داد پەروەرو خێركاردەستی هەژاران بگرێت وسەركەوتووبێت لەكارەكانی واتە مرۆڤی لێهاتوو هەریەك لەجێ یتایبەتی خۆی دابنێ نەك لەبەرخزمایەتی

٢) كەسی دووەمی: بەهەشتی كەسێكە دەستی خۆی پاك بێت وچاوی لەماڵی كەس نەبێت وباخۆیشی هەژارو پێویستی بەماڵیش هەبێت وخێزانداری زۆریش بێت خۆی بەخۆی كاسبی دەكات ئەوەندەی پێ پەیدابببێت قەناعەتی پێ دێ وخەرجی دەكات بۆخۆی ماڵ ومنداڵی .

٣) كەسی سێ یەم: كەبەهەشتیە دڵ نەرم وخزمایەتی بەجێ هێنەرە بۆخزمان وهەر موسوڵمانێكی تر .

٤) دۆزەخی یەكان ئەمانەن :

یەكەم :كەسێكە خۆی نەزان بێت هەوڵی ئەوەش نەدات فێری زانیاری ئایین ودوونیایی ببێت هیچ ئاوات خواست بەرزی یەكی نی یە.

دووەم : كەسێكە سروشتی پیسەو بۆگەنە سەردەكاتە هەموو زبڵ خانەیەكدا كەسێكی (خیانەت) كارە لەدەست وزمان ورۆحی پاك نی یە دەروون نزمە هەرچی حەز لێ بوو دەیكا ونایشارێتەوە باكەمیش بێت بێ نرخ وسودایەتیشی تیادابێ بۆی ئەو هەرناپاكی خۆی لێدەكات.

---

١. بێجگە لەو سێ كەش خەڵكانی بەهەشتی زۆرن، بەڵام لێرەدا تەنها هەندێك لەو كەسانە باس كراون؛ نەك تەنها بەهەشتیەكان بریتی بن لەوئەوسێ كەسە.ئاگاداری ئەم جیاوازیە بە.

<u>سێ یەم</u> : کەسێکە ئاژاوەچی بێت کەسێکە کەهیچ بەیانی وئێوارە ناکاتەوە ئەگەر فێڵ وتەڵە کەیەکت بۆدروست نەکات لەخۆت ومالْ ومندالْ وخێزانت. لەنێوان کەس ومالْ ومندالْ هەر خراپەیەکی تر کە دژ بەخەڵکانی دەکات .

<u>چوارەم</u> : چاوچنۆکە چونکە ئەومالّەی خودای گەورە پیّ ی بەخشیوە نەخۆی دەیخوات نە خێری پیّ دەکات نەدمیەڵێت خەڵکی سوودی لیّ وەرگرن وەك خێزان ومندالْ و خزمانی تر .

<u>پێنجەم</u> : کەسێکە بەدرەوشت بێت لە کردەوەو ووتە هەڵە کارەبەرانبەر هەموو کەسێك بێسنوور هەڵە و زمان پیسە بەرانەر خەڵکی. هیچ جۆرە هەڵەیەك قەت ریّ ی خۆی هەڵە ناکات بۆلای ئەم جۆرە کەسانە .

١) ئەگەر ئەتەویّ بەهەشتی بی؛ لە یەکێك لەوکارانەدا جێگەی خۆت بکەرەوە .

٢) ئەگەر ئەتەویّ دۆزەخی نەبی ئەوا خۆت لەوشتانە بپارێزە کەپێنج رەوشتی دۆزەخی یە .

- ئەگەر دەروونەکان گەورەبن، ئەوا لاشەکان ماندوو دەکات بۆگەیشتن بە ئاواتەکانی. ((المتنبی)).
- ئەگەر بچوکێك یەکەم سەبر بگرێت لەوانەیە خۆی لەخۆیدا گەورەبێت : بۆخەڵکی وا دیاربێت بچووك بێت وەك چۆن ئەستێرەکان خۆیان بە بچووکی نیشان و پیشان ئێمە دەدەن لە کاتێکا کە خۆیان زۆر گەورەن.. ﴿ توهامی ﴾

## ((وسوسة الشيطان ليكفر الانسان))

عن انس بن مالك- رضي الله عنه-عن رسول الله( صلى الله عليه وسلم) قال : ((قال الله – عزوجل :- ان امتك لايزالون يقولون ماكذا؟ ماكذا؟ حتى يقولوا : هذا الله خلق الخلق، فمن خلق الله؟)) رواه الامام مسلم (١)

## ((دوودڵی (شەیتان) بۆئەوەی باوەڕداری پێ (کافر)بکات ))

٢٤-لە ئەنەسی کوڕی مالك- رەزای خودای لێ بێ - لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی خودای گەورە دەفەرموویێت (( نەتەوەکەت دەڵێن ئەوەچی یە؟ ئەوەچی یە هەتاوایان لێ دێت ئەوە خودا ((کەئەم شت و
بوونەوەرەی دروست کردووە ((فمن خلق الله)) ؟ کێ خودای دروست کردووە) . پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت کاتێ مرۆڤ گەیشتە ئەوحاڵەتە ((فليقل :آمنت بالله)) بابڵێت باوەڕم بەخودا هێناوە یان پێغەمبەر (صلى الله عليم وسلم) دەفەرموێت ((فاذابلغ ذلك فليستعذ بالله)) ئەگەرپرسیارەکانت لەخۆت گەیشتە ئەو رادەیە بابڵێت پەنا بەخودا ((ولينتهِ)) . (٢) باوازبهێنێ .

---

(١) اخرجه في كتاب الايمان –باب الوسوسة في الايمان، وما يقوله من وجدها برقم : (٢١٤ –(١٣٤) ،واخرجه البخارى في كتاب بدء الخلق –باب :صفة ابليس وجنوده .

(٢) اخرجه مسلم في كتاب الايمان –باب : الوسوسة في الايمان ، ومايقوله من وجدها برقم : (٢١٢-١٣٤) واخرجه ابوداود في سننه .

## ((لێکدانەوەی زاناکان))

ئیمامی (نەوەوی) لەماوەردیەوە -رەحمەتی خودایان لێ بێ- )) دەڵێت رووکەشی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ کەشەیتان وەسوەسەی خستە دڵی موسوڵمانەوە بەوشێوەیە، با فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجێ بهێنێ ((کە لەهەردوو فەرموودەکەی موسلیمدا هاتووە)) یەکسەر پاڵ بنێت بەوجۆرەو وسوەسەیە بەوەی کەهیچ گوێ نەداتە ئەوجۆرە وسوەسانە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە وەستان وبیرکردنەوەی لێ بکرێ .

**هەربۆیە ئیمامی (نەوەوی) دەڵێت: وەسوەسەی دڵ وبەدڵ هاتندا دووجۆرە :-**

**یەکەم** : وسوەسەیە کیان ئەوەیە کە جێگیر نی یە ئەم جۆرەیان بەپشت لێ هەڵ کردن وگوێ نەدان لەم جۆرە دوودڵی ودڵە راوکێ یە دەڕوات .

**دووەم** : دڵەراوکێ ی جێگیرو راگیر کە بەهۆی ((شوبهەوە))دوودڵی خستنەناو دڵەوە دروست دەبێ ئەم جۆرە دەبێتبەهۆی بەڵگەهێنانەوە لای بدات مەبەست لە ((فیلستغذ بالله)) ،ولینتە)) واتاکەی ئەگەرئەم جۆرە وەسوەسە ((دوودڵی یە)) کەوتە دڵی مرۆڤەوە ، باپەنابەخودا بگرێت بۆئەوەی خودا پەنای بدات ،لەخراپەی ئەوجۆرە خراپی یەی لێ لادا ، بابەهیچ شێوەك بیروهزری خۆی سەرقاڵ نەکات ، بابزانێت ئەم جۆرە (هاتن بەدڵەدا) ((الخاطر)) لەدوودڵی خستنی شەیتانەوەیە ، بۆیە ئەمەشی لێ بە بەسەردەهێنێ چونکە دەیەوێ تێك بچێت وبەرەوخراپدا بوونی ببات بۆیە بابەهیچ شێوەیەك گوێ نەداتە ئەوجۆرە دوودڵی یە ؛ بەڵکو نەهێڵێت ودەرفەت بۆئەم جۆرەدوو دڵی یە نەدات واتاو لێکدانەوەکەی ((نەوەوی))تەواوبوو.

**(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)**

١) خودای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لەرێ وشوێنی (شەیتان) کەچۆن وورده وورده هەنگاوهەڵ دەنێت بۆتەفرەدانمان.

٢) لەهەنگاوەکانی (شەیتان) بۆدوودڵی خستنەدڵمان ئەوەیە لەهەنگاوی باش وخێرەوە هەنگاو هەڵ ئەنێت هەتا دەتخاتەسەر ئەوشوێن وهەڵ دێرەی کەهەڵت دەدێرێ بەدوودڵی یەکانی لەپرسیاری بێ سنوور کەهزرو زانستی مرۆڤ پەی پێ نابات.

٣) خودای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لەرێ وشوێنی شەیتان کەچۆن وورده وورده هەنگاوهەڵ دەنێت بۆتەفرەدانمان.

٤) لەهەنگاوەکانی شەیتان بۆدوودڵی خستنەدڵمان ئەوەیە لەهەنگاوی باش وخێرەوە هەنگاو هەڵ ئەنێت هەتا دەتبانەسەر ئەوشوێن وهەڵ دێرەی کەخۆی هەڵت دەدێرێ بەدوودڵی یەکانی لەپرسیاری بێ سنوور کەهزرو زانستی مرۆڤ پەی پێ نابات.

٥) دروستە مرۆڤ بیر لەدروست کراوەکان و بوونەوەر بکاتەوە دەسەڵات وگەورەیی خودای لێ بخوێنێتەوەو لێ ی بەدی بکات

٦) بەڵام بیرکردنەلە چۆن یەتی خودا گەورە بەهەمووشێوەیەك قەدەغەیە بەتایبەت ئەگەر واگومان ببرێت کەخودا چ هاوشێوەو هاو وینەی هەبێت پەنابەخودا چونکە ئەم جۆرە زانستە (خودای گەورە ) ئاستی مرۆڤی لێ سنووردارکردووە وەك کاتێ (موسا)فەرمووی: (قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَـكِنِ انظُرْإِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ موسَى صَعِقًا السورة الاعراف الآية١٤٣ واتاکەی بەکورتی (موسی)((پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای لەخودای گەورە کرد کە پێ ی خۆشەخودا ببینێ بۆیەفەرمووی ئەی خودایە نیشانم بدە چۆن بڕوانمە زاتی تۆ ؟ خودایش وەڵامی دایەوەو فەرمووی تۆناتوانی من ببینی بەڵام بڕوانە ئەو کێوە ئەگەرخۆی ڕاگرت ئەوا تۆ من دەبینی . کاتێ خودای گەورە خۆ...

پی نیشان کێوەکەدا کێوەکە هەژاو لەرزی کاتێ (موسا) (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی دی یەکسەر لەخۆچوو)) .

ئەمەحاڵەتی هەموو مرۆڤێکە توانای ئەوەی نی یە لەم ژیانەی دوونیاماندا خودای گەورە ببینێت ولەزەت وخۆشی لێ وەرگرێت .

٧) ئەوەی شەیتان هەوڵی دوودڵی کردنی دەدات باوەڕدارانە چونکە لەڕێگەی ترەوەنەیتوانیوە سەرکەوێ زەفەریان پێ ببات بۆیەتەنها ڕێگەی شەیتانا بۆزەرەر لێ دانی مرۆڤی باوەڕ ئەم ڕێگەیەیە

٨) بەوەی کەشەیتان ئەم بیرۆکەی بیرکردنەوە لەدروست بوونی خودای گەورە تاوان نی یە بەمەرجێك یەکسەر پە نابەخودا بگرێت بەڵام ئەگەر بەردەوام هەرلەبیرۆکە دابێت ئەوا شەیتان توانی زاڵ ببێت بەسەرموسوڵمانەکەدا.

٩) شەیتان کۆڵ نادات بۆزەرەروو زیان گەیاندن بەمووسوڵمان تەنها ڕێگەیەك کەشەیتان بتوانێ کەسواری خۆی لێ تاودا ئەومیە دوودڵی بخاتە دڵی موسوڵمانانەوە.

١٠) خودایش هەردەم لەلێ خۆشبوونی بەندەکانی بەردەوامە بەراستی بۆلای ئەوبگەرێنەوە وەماندو ونابێ .

١١) ئەم جۆرە دوودڵی یە نیشانە و شوێنەواری باوەڕداری یە ئەگەر هاتوو ئەمەی لێ بەسەرهات ئەوابامژدەبێ لێ ی کەباوەڕدارە، باناگای لەخۆی بێ ئیمانی خۆی نەدۆڕێنێ .

---

- . ئەگەر خۆت خستە مەترسی بۆ بەدەست هێنانی ئاواتی شەرەف مەندایەتی وپیاوەتی، رازی مەبە بە کەمتر لە ئەستیرەکان تام وچێژی مردن لە شتی هیچ وپڕو پووچ هەر هەمان تام وچێژی مردنە لە شتی بەرێزوبە نرخ. ((المتنبی)).
- . ئەگەر خواستت بۆ مەبەستێکت چوو ئەوا پۆشاکی ئاوات وخواستەکان دەپۆشی هەموو مەترسی یەکان لەبەر چاو ناگرێت ئەگەر کەسێ حەز نەکات بە سەرکەوتنی بۆ لووتکەی چیاکان، هەردەم دەچێ بو نێوان چاڵی وچۆلی وکەلێنەکاندا. ((ئەبو ئەلقاسم الشابی)).
- هەر کەسێ ئاوات ومەبەستێکی هەیە بۆی هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی بە دەستی بهێنێ، مرۆڤی هۆشمەند وسەربەست ئاوات ومەبەستەکانی لە بەرزی یەکاندا دەبێتەوە.((ووتە عەرەبی یە)).

## ((حرمة تقنيط الانسان من رحمة الله))

٢٥-عن جندب- رضى الله عنه-ان رسول الله-صلى الله عليه وسلم-حدث : ((ان رجلاً قال : والله لايغفرالله لفلان ،وان الله تعالى قال: من ذ الذي يتألى عليَّ ان لااغفر لفلان فاني قد غفرت لفلان، واحبطت عملك)) رواه مسلم في (١) صحيحه

## (قەدەغەوتاوانی دروست كردنی بێ هیوایی لەمرۆڤدا بۆمیهرەبانی خودایی)

٢٥- لەجوندەبی كوڕی جەنابەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی ئەوەی كرد كەكابرایەك ووتی ((والله لايغفرله لفلان)) سوێند بێت بەخوا خودا لەفلاَن كەس خۆش نابێ، ((وانا لله تعالى يقول من ذالذي يتالى على ان لاغفر لفلان )) كێ یەسوێندبەمن دەخوات كەمن لەفلاَن كەس خۆش نابم ؛ ((فإني قدغفرت لفلان )) خودا دەفەرموێت ((ئەوا من لەوكەسەی كەتۆ پێی دەڵێیت خودا لێی خۆش نابێ! ئەوا من لێ ی خۆش بووم ؛ ((واحبطت عملك)) بەڵكولەتۆخۆش نابم و كردەوەچاكەكانتم پووچەڵ كردەوە .

## لێكدانەوەی زاناكان

ئەوەوی دەفەرمووێت (يتألى) سوێند خواردنە هەر ئەوەوی دەڵێت ئەمەش بەڵگەیە لەسەر راوبۆوچونی (ئەهلی سوننەوجەماعەت)) بۆلێخۆش بوونی خودای گەورە بۆتاوانەكان تەناتەت با (تەوبەو) گەڕانەوەی نەكردبێت ئەگەرخودا خۆی حەزی لێ بێ لێ ی خۆش دەبێ .

بەڵگەی ((موعتەزیلییەكان)) المعتزلة) ئەم فەرموودە بەڵگەیانە لەسەر ئەوەی كەخودا كارەكانی چاك وباش بەتاڵ وپووچەڵ دەكاتەوە بەگوناهی گەورە .

---

(١) أخرجه مسلم فى كتاب البروالصله والاداب –باب : النهى عن تقنيگ الانسان من رحمه الله تعالى برقم : ١٣٧(٢٦٢١) .

بەلأم ((رای ئەهلی سوننەو جەماعە)) ئەوەیە کەدەڵێت کردەوەی چاك پووچەڵ نابێتەوە ئەگەر ئەگەرمرۆڤەکەخۆی کافرنەبێتەوە. کەواتە بەکافربوون هەمووکردەوە وچاکەکانی پووچەڵ دەبێتەوە . هەربۆیە دێن ئەم فەرموودەیە والێك دەدەنەوە کەگوایە مەبەست بەپووچەڵ بوونی کردەوەکانی ئەوەیە کەچاکەکانی بەرامبەر خراپەکانی پووچەڵ بووتەوە ئەمە خالێك.

**خاڵی دووەم** : دەڵێن رێ ی تێ دەچێ کەگوناهێکی نزی کردبێ سەری بۆکافربوونی راکێشابێ .

**خاڵی سێ یەم** : دەڵێن لەوانەیە ئەمەش بۆشەرع وبەرنامەی پێش هاتنی ئیسلام بێت تایبەت مەندی ئەوان بێت ' یان ئەم جۆرە حوکمە لە یاسای ئەواندا هەیە. ((ووتەی ئەوەوی تەواو بوو))

**بەندەی هەژار دەڵێت** :- (لەوانەیە ئەو جۆرە گوناهە وەك شیرك بێت چونکەبانگێشەو لاف و گەزافی زانینی نهێنی یەکە (( عالم الغيب )) کە تایبەت مەندی خودایە بۆیە جۆرێکە لە هاوەڵ پەیدا کردن وهەمان حوکمیشی هەیە لە ئاینی پێغەمبەری خۆماندا وەك خودا دەفەرموویێت: ((قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ)) سورە النمل الایە ٦٤واتە: هیچ کەسێك نهێنیی یەکان نازانێ بێجگە لەخودا . ئەمە لەلایەك.

لەلایەکی تریشەوە ئەو کەسە چۆن خۆی بەباش دەزانی خەڵکانی تر بە خراپ لە کاتێکا کە خودا دەفەرموویێت : (( ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ اللّهِ فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾ )) الاعراف الایة٩٨.

**(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

**١) گەورەیی( سوێند) خواردن بە (خودا) لە کاتێکا کە مرۆڤ نەتوانێ ئەو کارەی کەسوێندی لەسەر خواردووە بەجێی نەهێنێ .**

**٢) کەس خۆی لە خەڵکی تر پێ باشتر نەبێت با بە بەروو گەشیش کردەوەی چاکتری لە خەڵکانی ترزیاترو و چاکتر هە بێ .**

**٣) کەسیش لە خۆی بە خراپتر نەزانێ با خراپە کاری یە کانیش دیارو ئاشکراش بێ.**

**٤) ئەگەر کەسێکت لە خراپەکردن دیت بیپۆشە بۆ ئەوەی خودا نهێنیت بپۆشیت .**

**٥) کاتێ خراپە کارێك دەبینی بێ هیوای مەکە لە میهرەبانی خودا بەڵکو مژدەی ئەوەی پێ بدە کە خودا لێ خۆش بووە . بۆهەر کەسێك کە بگەڕێتەوە بۆلای خودای گەورە .**

**٦) جاری وادەبێت مرۆڤ ووتەیەك کە هیچ کێشی بۆ دانا نێت ئایندەی مرۆڤ و دوا ڕۆژی پوچەڵ دەکاتەوە .**

**٧) جاری وادەبێ بەهۆی ووتەیەك یان کارێکی باش خودا لێت خۆش دەبێت .**

**٨) کاتێ خراپەکارێك دەبینی هەوڵ بدە پاساوی بۆ بهێنیتەوە بەوەی لەوانەیە نەزانێ ئەوە خراپەیە وگوناهەو تاوانە .**

**یان لەوانەیە نا چاری ئەو گۆناهە ی پێ بکات یان هەر بیانوویەکی تری هەبێ.**

**٩)خودای گەورە بە هەرەشە دەفەرموێت کێ یەئەو کەسەی کە دەڵێت من لەفلان کەسی تر خۆش نابم ؟!! بۆیە بەم شێوەیە دەفەرموێت بۆ ئەوەی ئێمە نەکەوینە هەمان هەڵەوە کە بڵێین خودای گەورە لێت خۆش نابێ بەم وتنەش زیاتر بەرەو تاوانی ببەین بەوەی بڵێت مادام خودا لێم خۆش نابێ من هەمووتاوانێك دەکەم.بەڵکو ئێمە ئەگەر گەیشتین بەهەر کەسێك کە خراپەیەکی کردبێ هیوای بخەینە دڵ یەوەبۆئەوەی بگەڕێتەوەو لەمەزیاتر لەسەرکاری خراپ نەچێت .**

## (( جزاء الصبر على المصائب ))

عن انس بن مالك-رضي الله تعالى عنه -قال سمعت النبي صلى الله عليه وسلم)) يقول : (( ان الله تعالى قال : اذا ابتليت عبدي بحبيبتيه فصبر ، عوضته منهما الجنة )) رواه البخارى( ١) فى صحيحه.

(( **پاداشتی کەسانی دان بەخۆ دا راگر لەسەر بەلاوو موسیبە تەکان** )).

له ئه نەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموو یەتی خودای گەورە فەرموو یەتی ( اذا ابتليت عبدي) ئەگەر بەندەی خۆم تاقی بکەمەوە (( بحبيبتيه فصبر)) بەهەردوو چاوی لێ ی وەرگرمە ولەئەنجامدا دان بەخۆیدا بگرێت ، ((عوضتهُ منهما الجنة)) فەردبووی ئەو دووچاوەی تەنها بەهەشتەلای من ) واتە لەلای خودای گەورە.

## لێکدانەوەی زاناکان

قەستەلانی لە ارشاد السارى فى شرح صحيحالبخارى ج٨ ص٣٨٦ دەڵێت: مەبەست بە((فصبر عبدي)) باوەڕداره ((بحبيبتيه)) یانی هەردوو خۆشەویستەکەی کەبریتی یەلە رووناکی ونووری چاوانی چونکە هەردوو چاو خۆشەویسترین ی ئەندامەکانی مرۆڤەبەلایەوە ؛ چونکە ئەگەر ئەودووچاوە نەمینێ مرۆڤ زۆرتووشی نارەحەتی وبارگرانی دەبێ چونکەبەبینین دەتوانێت زۆرخێربۆخۆی دەست گیر بکات وەك چۆن دەتوانێ بەبینین زۆرناخۆشی وخراپەوبارگرانی لەسەرخۆی لابدات

---

1)اخرجه البخارى في كتاب المرض –باب : فضل من ذهب بصره، واخرجه البخارى في الادب المفرد – باب العيادة من الرمد برقم : (٥٣٥) .واخرجه مسلم والامام احمد بلفظ: ((يقول –تعالى –باب يابن ادم ! اذا اخذت كريمتك فصبرت واحتسبت عند الصدمة الاولى ، لم أرض لك ثواباً دون الجنة)) .واخرجه الترمذى في ابواب الزهد-باب ماجاء في ذهاب البصر برقم : (٢٤٠٢) .واخرجه الامام مالك في الموطأ كتاب العين –باب :ماجاء في اجر المرض نحوه عن عائشة رضي الله عنها:

((فصبر)) ئەم ووشەیە هێنانەوە یادوخستنەوە بیروهزری مرۆڤی باوەڕداره کەخودای گەورە ئەجرو پاداشتێك دادەنێت بۆئەوکەسانەی تووشی بەڵادەبن وئارام دەگرن .

مەبەست لە ((عوضته منهما الجنة)) قەرەبووی لەباتی هەردووچاوی بەبەهەشتی شاد دەکەم (١) ئەمەش واتە ئەم قەرەبووەش گەورەترە لەوبەڵایە چونکە خۆشی بینین ولەزەت وتام وەرگرتن بەچاوان هەرئەوندەیەهەتامرۆڤ ساغە بەمردنی مرۆڤ هەموو خۆشی یەکانی لەبیر دەچێ لەکاتێکا خۆشی بینین وتام کردن لەبەهەشت نەبڕاوە وبێ کۆتایی یە .

**(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) پاداشت وەرگرتنەوە بۆهەرشتێك کە تووشی مرۆڤی موسوڵمان دەبێت .

٢) پاداشت کاتێك دەبێ کەمرۆڤ دان بەخۆیدا بگرێ وچاوەڕوانی پاداشتی خودابێتەوە .

٣) پاداشت وەرگرتنەوە وقەرەبوو کردنەوە زۆرگەورەترە لەهەر بەڵاو موسیبەتێك کەبەسەرمرۆڤی باوەڕداردا دێت .

٤) بەپێی گەورەیی بەڵاکان قەرەبووەکان وپاداشتەکان گەورەترە.

٥) بەڵام ئەگەر مرۆڤ دان بەخۆیدا نەگرێت هیچ پاداشتێك وەرناگرێ بەڵکو رەنجەڕۆی دوارۆژیش دەبێ وەك چۆن لەدونیا رەنجەڕۆ بوو بەهۆی بەڵا کەوە .

٦) کاتی دان بەخۆدا گرتنەکە(سات وکاتی) تووش بوونە بەبەڵاکان وەك دەفەرموێت(انما الصبرعند الصدمةالاولى)

بەهەشت گەورەترین قەرەبووە بۆهەربەڵاوکارو ووشەو چاکە کردنێك تەنانەت بۆخۆ کردنیش لەپێناوی خودا هەر بەهەشت قەرەبووە .

---

(١)- بەندەی هەژار بۆمیهرەبانی خودای گەورە- دەڵێت وەك ئەوەی چۆن لەدوونیا کوێر بووە چاوی بەهیچ خۆشی وجوانی ومرازادەیی وسەوزایی وئاووجۆگەڵەو دەریاکان چیایەکان دەشت ودۆڵ وداروبارەکان هەتادواتر هەڵ نەهێناوە خودا بۆی قەرەبوو دەکاتەوە بەوەی کەبەهەموو خۆشیەکانی بەهەشت شادببێت .

٧) بەلاَم هەرکەس رازی نەبێت بەوبەلاَیە کەبۆی دابەزیوە نەك هەر پاداشت نادرێتەوە بەڵکو تۆڵەو سزاش چاوەڕوانی دەکات بۆیە لەمەرجی باوەڕهێنانی راستەقینەو دروست ئەوەیە باوەڕبوون بەخوداو فریشتەکان وپەڕتووەکەکانی ئاسمانی یە و رۆژی دووای یەو رازی بوون بەهەرفەرمان وبەلاَ یەك کەخودا تووشی مرۆڤەکانی دەکات کەخێربێ یان شەڕ شیرین بێت یان تاڵ بێت .

٨) سۆزوپەیمانی خودایە بۆقەرەبووی چاوان ئەبێت هەر بەهەشت بێ .

٩) مەرج نیە ئەوەیکەخوداچاوی لێ وەرگرێتەوە بەهۆی ئەوکەسەوەبێت.

١٠) دەقەکە دووپاتی ئەوەدەکاتەوە کەئەو جۆرە بەڵاو موسیبەتانە تاقی کردنەوەی خودایە ، بۆیە لەوانەشە ئەو بەڵا بەسەرهاتووە زۆر رێزداربێت لەلای خودای گەورەو پلەو پایەیەکی زۆر گەورەی هەبێت لەبەهەشتدا، کەخودای گەورە بۆی دانابێ ؛ بەڵام ئەوکەسە کردەوەی چاکی زۆری نیە کە بیگەیەنێتە ئەوجێگەو پلەو پایە بۆیە بەڵاو موسیبەتەی لێبەسەردێنێ بۆ ئەوەی بگاتە ئەوپلەیەی کەخودای گەورە بۆی داناوە . ئەمبۆچوونەش فەرموودەی لەسەرە لە (صحیح الجامع الصغیر)دا.

- ئەگەر خودا بی یەوەێ چاکەیەك لە ناو خەلکیدا بلاَو بکاتەوە کە خەلك نەزانن چاکەیە وداپۆشرابێ، زمانی ناحەزێکی لێ دەخاتە گەڕ)). ((أبو تمام)).
- ئەگەر پێویستیت بە گەنجینەو تو ێشوو هەڵ گرتن هەبوو، هیچیت دەست نا کەوێت چاکتر بێت بە تویشووی هەلگریت وەك چاکەکردنەکان. (( الفرزدق)).
- چاکەکردن کورترین رێگەیە بۆ بەرەو ئاسۆ وبلندی چوون. ((هەرفتیس)).
- گەڕانەوەت کەخێری تیادابێ چاکترە لە بەر دەوام بوونت لە هەڵە لە هەڵە کردن ((عەرەبی)).
- رێگە وشوێنی چاکەکردن تەسکە وهەوڵ ماندو بوونی دەوێ بۆ پیادا چوونی، بە پێچە وانەی خراپەکاری رێگەی ناچووخەو پان وبەرینە.(( سەرفانتس)).

## ((ثواب قبض الولد))

٢٧- عن ابى هريرة -رضي الله عنه -ان رسول الله -صلى الله عليه وسلم- قال (( يقول الله تعالى :مالعبدي المؤمن عندى جزاء إذا قبضت صفيه من اهل الدنيا ،ثم احتسبه،الاالجنة)) رواه البخارى (١)

### (( پاداشتی کەسیانێك کەمندالْ وکۆرپەی جەرگیان کۆچ ی دوایی بکات ))

٢٧-لەباوکی هورەیرەو- رەزای خودای لێ‌دەلْێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : خودای گەورە دەفەرمووێت ((مالعبدي المؤمن عندى جزاء)) بۆبەندەی باوەڕداری خۆم هیچ پاداشتێك نی یە داری خۆم هیچ پاداشتێك نی یە شیاووگونجاوبێ بۆکاتێ ((اذاقبضت صفية من اهل الدنيا)) خۆشەویستەکەی لێ وەرگرمەوە لەکەسانی دونیایی ئەودا، ((ثم احتسبه)) لەپاشان ئەو دان بەخۆیدا بگرێ وچاوەڕوانی پاداشت لەمن بکات ((الاالجنة)) تەنهابەهەشت شیاووگونجاوی ئەم کەسەیە.

## ((لێکدانەوەی زاناکان بۆفەرموودەکە))

زاناقەستەلأنی ج٩ ص(٢٤٣) دەلْێت :مەبەست لە((اذا قبضت صفيه)) کاتێ خۆشەویستەکەی کەزۆری خۆش دەویست وەك مندالْی یان برای یان هەر کەسێکی تر لەمرۆڤەکان کەزۆرخۆشەویستەلاي ((من اهل الدنيا)) واتە لەخەلْکانی ئەم دونیایە بێت ((ثم احتسبه)) لەپاشان بەهیوای پاداشت لەخوداوبێت ((الاالجنة)) هیچ پاداشتێك نی

١-اخرجه البخارى في كتاب الرقاق-باب العمل الذي يبتغى به وجه الله تعالى .واخرجه الترمذي في ابواب الجنائز-باب-فضل المصيبة اذا احتسب برقم :(١٠٢١) وحسنه الشيخ الالبانى في صحيح الجامع الصغير برقم (٧٩٥) وراجع السلسلة الصحيحة:(١٤٠٨)واخرجه الامام الاحمدفي المسند ،اخرجه النسائى في كتاب الجنائز ، وتنمي الموت —باب :ثواب من توفي له ثلاثة من الولد ، برقم (٢٠٠٤)اخرجه ابن ماجة فى كتاب الجنائز باب : ماجاء في البصر على المصيببة برقم (١٥٩٥)

یە بۆئەولەسەر ئەوبەڵایەی کەخۆشەویستەکەی لەدەست چووە کۆچی دوایی کردووە لەکاتێکا ئەویش بڵێت خودائەمەم بۆهەڵ گرێ بۆرۆژی دوایی پاداشتی وەرگرمەوە))
.تەنهاپاداشتی ئەوبەهەشت دەبێ .

**(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) تەنها باوەڕبوون بەخودای گەورە جێ ی هەموو پاداشتێکە لەسەر بەڵاکان .

٢) هەرخۆشەویستێك خۆشەویستەکەی لێ بڕوات بەکۆچی دوایی هیواو پاداشتی خودایی هەبێ خوداپاداشتی گەورەیی بۆدادەنێت کەبەهەشتە .

٣) (صفیە) بەگشتی هاتووە واتە هەموو خۆشەویستێك دەگرێتەوە لەدایك وباوك منداڵ وبراو خوشك و خێزان و دۆست وخزمانێك و برادەرێك لەبەرخودا یەکیان خۆش بوێ وخودالەیەکیان بکات (١)پاداشتیان بەبەهەشت دەداتەوە ئەمەش کۆتایترین ئاوات وخواستەبۆهەریەکێك لەئێمەی باوەڕدار .

٤) مەرجە هیوای پاداشتی خودای هەبێ ئەگەرهیوای پاداشتی نەبێ نارازی بێ ئەوا بۆیەکجاری وهەتا هەتاهەتایی لەیەکدا بڕان .

5)خودای گەورە فێری ئەوەمان دەکات دان بەخۆدا گرو هیوای پاداشتمان هەبێت . بۆهەرشتێك گەورەبێت یان بچووك .

٦)پەیمان وسۆزی خودایە کەلەبەهەشتا شادیان کات بەیەك وەك چۆن لەدونیادا لەیەك بوون جیابوونەوەلەیەك تر.

٨)خودا تۆڵەی نی یە هەتاچاك وخراپ روون وئاشکرانەکاتەوە لەرێگەی پێغەمبەرانەوە(صلی الله علیه وسلم).

---

(١) بەندەی پێویست بوو بەمیهرەبانی خوداگەورە دەڵێت :- وەك ئەوەی چۆن خودا لەیەکی کردن لەدونیا نەیان توانی تام وچێژی خۆشەویستی یەکان بەردەوام بێت خوداپاداشتیان بەهەشت دەداتەوە کەخۆشی یەکان ی زۆرگەورە ترەو((لەبنەرەتداهەرناپێورێ بەخۆشی دونیا )) بۆیەخودا کۆیان دەکاتەوە لەبەهەشت بۆئەوەی ئەوپەڕی خۆشی ببینن.

٧)خودابیانووی هەمووكەسێك دەبڕێ لەوەی كەبلێ ئەم زانی وچۆن وچی بكەم .

٨)خودا تۆڵەی نی یە هەتاچاك وخراپ روون وئاشكرانەكاتەوە لەرێگەی پێغەمبەرانەوە(صلی الله علیه وسلم).

٩)هەممو كەسێك لەوانەیە تووشببێت بەجۆرێك لەجۆرەكانی بەڵاو مووسیبەت وتاقی كردنەوە بۆپێویستە هەردەم مرۆڤ خۆی بداتەوە دەستی خودای گەورە رازی بێت بەقەزاو قەدەر .

١٠) بێگومان ئەمەسش تەنهابۆباوەڕداره بەخوداو ڕۆژی دوایی و هیوای پاداشت قررەبووی هەبێت لەخودای گەورە وەك لە فەرمموودەداهاتووە ((ولیس ذالك الا لمؤمن)).

- ئەگەر خاوەن چاكە نەبین كەم وكورتی خەڵك نازانین.
  ((لارو شفوكو)).
- - چاكە تـەنها لـە وەدا نـی یـە كـە خـۆت لـە خراپـە كـردن بـەدوور بگریـت، بـەڵكو لـەوە دایـە كـە لەبنەڕەتـدا حـەزت بـۆ خراپـە نەچێت. ((جۆرج برناردسۆ)).
- - رێگـە وشـۆینی چـاكەكردن تەسـكە وهـەوڵ مانـدو بـوونی دەوێ بـۆ پیـادا چـوونی، بـە پێـچە وانـەی خراپـەكاری رێگـەی ئاچووخەو پان وبەرینە. (( سەرفانتس)).

## ((جزاء الانتحار النار))

٢٨- عن جندب بن عبدالله -رضى الله عنه- قال : قال رسول الله- صلى الله عليه وسلم - ((كان فيمن كان قبلكم رجل به جرح ، فجزع ، فاخذ سكيناً فحزبها يده ، ((فما رقأ الدم حتى مات ، قال الله تعالى -عزوجل -: بادرني عبدي بنفسه حرمت عليه الجنة)) رواه البخاري (١) في صحيحه

## ((تۆڵەی کەسێك کەخۆی بکوژێت بەئاگری دۆزەخ سزادەدرێت ))

٢٨- لەجوندەبی کوڕی عەبدوڵاوە -رەزای خودای لێ بێ- ووتی : پێغەمبەر(صلى الله عليەوسلم) فەرموویەتی ((کان فیمن کان قبلکم )) لەوانەی پێش ئێوەدا ((رجل بة جرح)) کابرایەك برینێکی لێ بوو ((فجزع)) ئۆقرەی لێ بڕاو دانی بەخۆی دانەگرت لەبرینەکەی ((فأخذ سکینا فحز بها یده)) چەقۆیەکی بردو دەستی خۆی پێ بڕی. ((فما رقأ الدم حتی مات))خوێنەکە نەوەستایەوە هەتامردوو کۆتایی بەژیانی خۆی هێنا : ((قال الله -عزوجل :بادرنی عبدی نفسه)) خودای گەورە فەرموویەتی پەڵەی کرد خۆی بەخۆی بۆمردن ((حرمت علیه الجنه)) بەهەشتم لێ حەرام کرد

## ((لێکدانەوەی زاناکان))

قەستەڵانی دەڵێت:((کان فیمن کان قبلکم )) مەبەست لەنەوەی ئیسرائیلی یەکانە یان هەرکەسانێکی تر پێش ئێمە .

((فجزع)) دانی دانی بەخۆی دانەگرت لەسەر ئازارەکەی.

---

(١) اخرجه البخاري في كتاب احاديث الانبياء – باب ماذكر عن بني اسرائل، واخرجه ابخاري ايضاً في كتاب الجنائز.واخرجه الامام مسلم في صحيحه في كتاب الايمان –باب غلظ تحريم قتل الانسان نفسه،وان من قتل نفسه بشيء عذب به في النار برقم :- (١٨-١١٣) والذي اوله: ((ان رجلاً من كان قبلكم خرجت قرحة:_))

((فأخذسكيناً فخربها يده))دەستی خۆی بڕی بەلاّم شێوەی بڕنەکەی باس نەکراوە گرنگ ئەوەیە خۆی بە(ئەنقەست) دەستی خۆی بریندارکرد .

((فمارقأالدم)) خوێنەکەی نەوەستایەوە.

((حتی مات)) هەتا بووە هۆی مردن چونکە هیچ خوێن لەلەشیدا نەما .

((قال الله تعالی: بادرنی بنفسه)) خودای گەورە فەرمووی پەلەی کرد بۆمردن خۆی بەخۆیپێش ئەوەی کەمن تەواوی بکەم.

((حرمت علیه الجنة))واتە: بەهەشتم لەسەرحەرام کرد .

چونکە ئەوەی بەحەلاّلزانی ، بەئەمەش کافردەبێ هەربۆیە بەهەتا هەتایی دەمێنێتەوە لەناوئاگری دۆزەخدا بەهۆی کافر بوونەکەیەوە نەك تەنها بەهۆی کوشتنی خۆیەوە. یان ئەوەتا هەرخۆی لەخۆیداوە لەبنەڕەتدا کافربوو خودایش بەم تاوانەشی زادەڕێت لەسەر کوفرەکەیشی یەوە (١)

---

(١) زانای بەناوبانگ ئیبن حەجەری عەسقەلانی لەپەرتوکی ((فتح الباری فی شرح صحیح البخاري)) دا دەڵێت :حەوت شێوەو شێواز هەیە بۆئەوکەسەی کەخۆی کوشت:-

**یەکەم** : ئەوکەسە ئەم ئەم خۆکوشتنەی بۆخۆی بەحەلاّل وەدوا زانی وبۆیە خۆی کوشت بەئەمەش کافردەبێ .

**دووەم** : هەرلەبنەڕەتدا کافرووبێ بڕوابووە خودایش تۆڵەی ئەم تاوانەشی لێ دەکاتەوە سەرە ڕای تۆڵەو سزای بێ باوەڕی یە کەشی .

**سێ یەم** : یان مەبەست پێ ی : بەهەشتی لەسەر حەرام دەبێ واتا بەهەشت نابینێ لەکاتێك لەکاتەکاندا وەك ئەوکاتەی کەپێشوان ((السابقون)) ((پێش کەوتوان)) دەچنەبەهەشت یائەکاتەی ((موجاهیدەکان)) خاوێن دەکرێنەوە بەهۆی ئاگری دۆزەخەوە بەهۆی ئاگری دۆزەخەوە ولەپاشان بۆبەهەشت دەبرێت .

**چوارەم** : مەبەست ئەوەیە ناچێتەبەهەشتێکی دیاری کراوەوە وەك فیردەوس بۆنموونە .

**پێنجەم** : لەوانەیە ئەووەك ترساندن ولەسەرگرانکردن بێت ، مەبەستی پێ ی شتێکی تربێ .

**شەشەم** : لەوانەیە حەرام بوونی بەهەشت لەسەری کاتێك بێت ئەگەرخودا خۆی نارەزۆی هەبێ .

**حەوتەم** : ئەوەوی دەڵێ :رێ ی تێ دەچێ ئەم کافربوونە بەهۆی کردەوەو تاوانە گەورەکانەوە پاساو پرۆگرام بوو بێت بۆ ئەوان بەلاّم بۆئێمە بەتاوانی گەورە مرۆڤی باوەڕداربێ کافرنابێت .

**(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)**

١. پەندوەگرتن لەنەتەوەو گەلانی پێش خۆمان شوێن پێ هەڵگریان لەپاش ولەدوور کەوتنەوە لەخراپەکان .

٢. دان بەخۆداگرتن لەکاتی ئێش وئازاردا .

٣. . پاراستنی هەمووئەندامەکانی لاشەت چونکە سپاردەی خودایە لات .

٤. تاوانی کەسێك کەئەندامێکی خۆی لەناو ببات .

٥. پاداشتی کەسێك کەپارێزگاری بکات لە لاشەو سەرجەم ئەندامەکانی تر .

٦. پەلەکردن لەشتێك وبۆ بەدەست هێنانی تۆڵەی یەوە لێ دەسێنرێتەوە ناگات بەئاوات وخواستەکە پەلەی لێکردووە .

٧. تەندوتیژی وتۆڵەی خودا بۆکەسێك کەخۆی لەناو ببات .

٨. بەهەشت لێ حەرام بوونی بۆکەسێك لەخۆی بکوژێت .

٩. بەچی وچۆن خۆت ئازار بدەیت خۆت بکوژی هەربۆئەوە تۆڵەی لێ وەر دەگیرێتەوە.

١٠. پەند لەخەڵکان وەرگرە پێش ئەوەی ببیت بەکارەساتێك وپەندێك خەڵکان پەندت لێوەرگرن .

١١.ئەگەر پەندلە هەڵەی خەڵکی وەر نەگریت ئەواخەڵکی پەند لەهەڵەی تۆ وەر دەگرن .

١٢).سوود لەسوود مەندان وەرگرە ئەگەر ناخەڵك سوود لەتۆ وەردەگرن سوود مەند دەبن لەتۆ تۆیش ڕەن.

١٣).کوشتی خەڵکیش هەمان تۆڵەی خودایی هەیە .

١٤).ڕانەوەستان ولادانی لە مافی ڕەوای خودای گەورە .

١٥).میهرەبانی خودای گەورە دەردەخات کەقەدەغەی کردووە لەئێمە خۆمان ئەزیەت هئازار بدەین یان خەڵکی تریش ئازار بدەین یان هاریکاری ئازاردان لەناوبردنی خەڵکانی تریش بین خۆیان داوای ئەومان لێ بکەن .

١٦).گەورەیی وپاداشتی دان بەخۆداگرتن بهێنین چونکە بەرەو خراپترمان دەبات .

١٧).واز لەهات وهاوار ونۆقرە نەگرتن .

١٨).قەدەغەبوونی هەرکارێك کەدەبێتە هۆکار لەئازاردان ولەناوبردنی ئەندامێکی یان هۆکاربێ بۆمردن .

١٩).ئەگەر هەرکەسێك کۆمەکی و یارمەتی هەرکەسێکی تر بدات بۆ خۆکوشتن یان ئازاردانی خۆی هەمان یاسادەیگرێتەوە .

- بێ گومان نرخی زیوو کەمترە لە نرخی زێڕ نرخی زیڕیش کەمترە لە نرخی چاکە. ((هۆراس)).
- - چاکە لە نێوان دوو خراپەدایە. ((ئەرستۆ)).
- چاکەکانی بچووك لەوانەیە سەرنج راکێش نەبێ بەلام بۆ نی گۆلاوی لێ دەرباریَ چونکە تەزوو و هێزی رۆحە.

((مەدام نیکر)).

چاکەی راست و رەوان ترسناکترە لە تیروکەوان.((هیرۆ دۆتس)).

## (( لاغنى لاحد عن فضل الله تعالى))

عن ابي هريرة رضى الله عنه –عن النبي – (صلى الله عليه وسلم ) قال ((بينا أيوب يغتسل عرياناً ، فخر عليه جراد من ذهب ، فجعل أيوب يحتثي في ثوبه ، فناداه ربه : يا أيوب ! الم اكن اغنيتك عما تراه؟ قال :بلى :وعزتك :ولكى لاغنى بي عن بركتك )) . رواه البخاري (١) في صحيحه.

## ((كەس نیە پێوستی بەبەرەکەتی خودانەبێت ))

لەباوکی هوریرەوە -رەزای خودای لێ بێ- لەپێغەمبەرەوە (صلى الله علیەوسلم) فەرموویەتی : ((بینا ایوب یغتسل عریانا )) لەکاتێکا پێغەمبەر (ایوب) (صلى الله علیەوسلم) خۆی دەشۆرد بەرووتی و بێ جلێ وبەرگ بوو ((فخرعلیە جراد من ذهب)) کوللەی زێڕینی بەسەردا باری ((فجعل ایوب یحتثي في ثوبە)) ئەیووب پێغەمبەر کۆی دەکردنەوەو فرەی دەداناو کراسەکەی ((فناداه ربە)) خودای گەورە بانگی لێ کرد : ((یاایوب !)) ئەی ئەیووب ! ((ألم اکن اغنیتك عما تری؟ ئەی ئایا تۆم لەوە دەوڵەمەند ترنەکردووە لەوەی کەتۆدەیبینی ؟(( قال : بلى )) ئەیووبیشیی فەرمووی بەڵێ ،(( وعزتك ))واتە ( سوێند بەگەورەیی تۆ! تۆمنت دەوڵەمەندکردووە.لەهەمووشتێك. ((ولکن لاغنی بی عن برکتك )) واتە((.بەڵام من هەر هەژاری پیرۆزی وبەرەکەت و چاکەی تۆم هەردەم )) .

---

1)اخرجه البخارى فى كتاب الغسل : باب :من اغتسل عريانا وحدة في الخلوة .

واخرجه البخاري ايضاً في كتاب أحاديث الانبياء باب قول الله تعالى : ((وايوب اذ نادى ربه اني مسنى الضروانت ارحم الراحمين.وأخرجه النسائى في كتاب الطهارة –باب الاستتار عند الاغتسال (١-١١٥-٢٢٨-٢٢٨)

((لێکدانەوەی زاناکان بۆئەم فەموودەیە))

**قەستەلآنی دەڵێت ج١ ص(٢٣٣)**

**ئایا ئەو(کوللانە)راستی بوون وخاوەن رۆح و گیان لەبەر بوون لەزێربووبن ، یان تەنها لەشێوەی کوللەی بوو بەلآم زێڕ بوو وبێ روح وگیان بوون هەرقەستەلآنی خۆی دەڵێ ئەوەی ئاشکرایە زیڕی لەسەرشێوازی (کولله) بووە**

**((یحتثي في ثوبه)) بەهەردوو دەستی هەڵی دەگرتەوە و فڕەی دەدایە ناو کراس و جل وبەرگەکەی .**

**((فناداه ربه)) خودای گەورە بانگی لەئەیووب کرد بەشێوەیەك چۆن قسەو ووتەی لەگەڵ (موسا) -صلی الله علیه وسلم- کرد بەبێ هیچ پەردەو نێوان وهیچ ناردنی پێغەمبەرێك لەفریشتەبۆلای ، یان بەهۆی فریشتەیەك لەفریشتەکانی کەتایبەت مەندی ئەوەی پێ بەخشراوبێ لەلایەن (خودا)وە نیگا وەرگرێت لەخوداوە لەپاشان دایبەزێنێت بۆسەر پێغەمبەرەکەی**

**((بلی وعزتك)) بەڵێ سوێند بەگەورەیی ودەسەلآتت ئەی (خودا)یە (تۆ)(من)ت دەوڵەمەند کردووەو لەهەموو شتێکت پێ بەخشیووم .**

**((ولکن لاغني بي عن برکتك )) بەلآم من هەرپێویستم بەبەرەکەت و پیرۆزی چاکەی تۆهەیە هەردەم بەسەر مەوە بێت ولێم نەبڕێت .**

**هەرزانا( قەستەلآنی) دەڵێت:- ڕەحمەتی خودای لێ بێ- : ((مەحاڵەو ناگونجێت و شیاو نی یە کە پێغەمبەر(ئەیووب) (صلی الله علیه وسلم ) ئەم ماڵ وسامانە زێڕینە هەڵ گرێت وکۆ کردبێتەوە کەبەهۆی حەزبوون وخۆشەویستی بۆ دونیای بێت ، بەڵکو هەڵگرتنەوەی بۆزیڕەکان وەك خۆی باسی لەدەروونی خۆی کرد ، چونکە بەرەکەت وپیرۆزی یە مادەم لەلای خوداوەیە بۆی ، بەتایبەت کە تازە دروست کرابێ لەلایەن خودای گەورە خۆیەوە .**

یان ئەوزێڕە هەرخۆی بەخۆی بەهرەیەكی تایبەتی خودای گەورە بۆ پێغەمبەر(ئەیووب) (صلى الله علیه وسلم) كەبەڕاستی شتێكی سەرسوڕهێنەرە ولەتواناو دەسەلاّت ونەریتی خەڵك بەدەر بوو ، هەر بۆیە پێویستە (چاك)كۆشی جل وبەرگی بۆهەڵ مالّێ ویەك بە یەك كۆی كاتەوە و هیچی لێ جێ نەمێنێ ئەمە لەكاتێكا كەهەڵگرتنەوەی بەش وبەهرەی خودای گەورە سوپاس وپێزانینە بۆبە هرەكان وبۆخودای گەورەش كەبەخشیوویەتی ، بەگەورە زانی دەسەلاّت وبەهرەی خودایە كەرێزی لێ بگیرێ ، بەپێچەوانەش ئەگەر بێتو پشت لە بەهرەو پیرۆزی وچاكەی خودای گەورە هەڵ بگرێت ئەوا كافر بوون وپێ نەزانینە بە بەهرەكانی خودای گەورە ، پەرچ دانەوەو وەرنەگرتن وپەسەند نەكردنی بەهرەی خودای گەورەیە بۆمرۆڤ.

**(گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی *كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) دروستە مرۆڤ خۆی بشوات بەبێ ئەوەی هیچ جل وبەرگی لەبەر بمێنێت بەلاّم بەمەرجێك كەس نەیبینێ . ئەگەر جێ ی ئەوبێ كەسێك دەبینێ ئەوا حەرامە و قەدەغەیەمرۆڤ بێ جل وبەرگ بێت تەنانەت بۆ خۆر شۆردنیش بێت چونكە پێغەمبەر- صلى الله علیه وسلم-لە وەڵامی هاوەڵێكیدا فەرمووی((فان استطعت ان لا یراك احد فافعل)) واتە ((ئەگگەرپێت كرا كەس نەتبینێت ئەواباكەس نەت بینێ تەنانەت لە خۆشۆردنیشدا)) .

٢) ئەگەر پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) پێوستیان بە بەهرەو پیرۆزی خودا بێت كەخودا هەمووشتێكی پێ بەخشیوون ئەوا ئێمە زیاتر گەورەترە و باشتر.

٣) وچاكتر پێویستیمان بەهەر بەهرەیەك لەلایەن خوداوە بێت بەبێ ئەوەی ساتێك یان چركەیەك دابێت ئێمە پێویستیمان نەمێنێ بەبەهرەی خودای گەورە .

٤) ئەمەش موعجیزەی پێغەمبەر (ئەیووبە)-سەلامی خودای لێ بێ - كەزێڕی بۆدەباریّ .

٥) جۆرێك لەنیگای خودا بۆپێغەمبەران (صلی الله علیه وسلم) ئەومیە ((موباشر)) یەکسەر ((ئیکسپریس)) خودای گەورە قسە لەگەڵ پێغەمبەران دەکات .

٦) هەرچەندە خاوەن بەهرە بیت و دەوڵە مەند بیت ئەبێ هەر بەهرەیەك لەخودای گەورەبێت ئەوا تۆ پێ زان بیت پێی.

٧) سروشتی مرۆڤ ئەوەیە هەتا لەدونیادا مابێت هەر حەزی بەخۆشی یەکانی دونیا هەیە و دەمینێ .

٨) مرۆڤ هەوڵ بدات بۆ بەدەست هێنانی سەروت وسامان بەرێگەی حەڵاڵ .

٩) دروست بوونی سوێند خواردن بەگەورەیی و دەسەڵاتی خودای گەورە .

١٠) گفت وگۆلەنێوان خودای گەورەو (ئەیووب)دا فێری ئەمانەی لێدەبین:-

أ) پادشاکان لێ پرسینەوەیان هەبێت لەگەڵ ئەوکەسانەی کەلەژێردەستیانن بەهەمان شێوە هەربەرپرسێك بۆڵێ پرسراوانی هەتادوایی ... .

ب) ئەگەرهەڵەیەك کرا پێویستە داوای ڕوون کردنەوەی لێ بکرێ .

ج) بەرپرسان وکاربەدەستان زیاد لەمووچەو ماف و پێویستی هەرکەسێك بدات بەشێوەیەك لە پێویستی وجوانکاری یەکانیشیان زیاد بێت .

د) بەزەیی (کاربەدەستان) بە(ژێردەستە کانیان)لەوپەڕی میهرەبانیدابێت .

ه) گوێرایەڵی وفەرمان ڕەوایی ژێردەستەکان بۆ بەرپرسان لەسنورێك لەفەرمانی خودا دەرنەچێت .

و) ئاگادارکردنەوەی ئەوکەسەی کەهەڵەدەکات نەك یەکسەر سزاو تۆڵەبدرێت .

ز)لەسەر(ژێردەستەکان)ە گوێڕایەڵی و پەسەندکردنی یاساکان پابەندپێیانەوە.بەمەرجێلەفەرمانی خودای گەورە دەرنەچێ.

---

- ئەو هەڵەیەی کە ئێمە لێ ی پەشیمانین زۆر جار دەبێتە هۆی گەڕانەوەمان بۆچاکە کردن بەڵام زۆر جارئەو چاکەی کە شانازی پێوە دەکەین دەبێتە گەورەترین هەڵە بۆمان. ((دانتی)).
- - مرۆڤی هەستیار وخاوەن رێز بیرکردنەوەی پێش قسە خستنی دەخات، چاکەش لە پێش بیرکرنەوە وهزر دادەنێت. ((فینلنۆن)).
- -زۆر جوانی یەك پێویستی بەکاری چاك هەیە، بەڵام چاکەکاری هیچ جاروکات پێویستی بە جوانی وجوان کاری نی یە ونەبودو نابێ. ((ئەمین ئەل رەیحانی)).

## ((وما قدروا الله حق قدره))

عبدالله رضي الله -قال جاء حبر من الاحبار الى رسول الله (صلى الله عليه وسلم )، فقال : يامحمد !انا نجدان الله يجعل السموات على اصبع ، والارضين على اصبع والشجر على اصبع والماء والثرى على اصبع ، وسائر الخلائق على اصبع فيقول : انا لملك ، فضحك النبي (صلى الله عليه وسلم ) حتى بدت نواجذه ، تصديقاً لقول الحبر ،ثم قرأ رسول الله (صلى الله عليه وسلم ) اقوله تعالى (( وما قدروا الله حق قدره والارض جميعاً قبضة يوم القيامة والسموات مطويات بيمنه سيبحانه وتعالى عما يشركون)). (الزمر( ٦٧) رواه مسلم (١) في صحيحه .

وفي رواية ((ثم يهزهن ، ثم يقول انا الملك انا الملك )) وفي رواية اخرى (( انا الملك اين الجبارون ؟ اين المتكبرون ))

---

1)أخرجه مسلم في كتاب صفات المنافقين واحكامهم ، برقم : ١٩(٢٧٨٦) أخرجه مسلم في كتاب صفات المنافقين واحكامهم ، برقم : (٢٠(٢٧٨٦)واخرج هذ الروايات وغيرها الامام البخاري في كتاب التفسير -سورة الزمر-باب : قوله ((والارض جميعاَقبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه)) . وأخرجه البخاري ايضاً في كتاب الرقاق -باب يقبض الله الارض يوم القيامة .وأخرجه البخاري ايضاً في كتاب التوحيد -باب قول الله :((لما خلقت بيدى)) .وأخرجه النسائي في كتاب التوحيد -باب :الملك برقم (٧٦٩٢) وأخرجه النسائي ايضاً في كتاب التفسير-سورة الزمر-باب قوله تعالى : ((والسموات مطويات بيمينه)) برقم : ((١١٤٥٥)) .وأخرجه ابن ماجه في المقدمة -باب :فيما انكرت لجهمية برقم : ((١٩٢))وأخرجه ابوداود وابن ماجه وابن ابي عاصم .وأخرجه الترمذي في ابواب التفسير -سورة -الزمر برقم (٣٢٢٨) .وأخرجه ابوداود في كتاب السنة -باب : في الرد على الجهمية ، برقم : (٤٧٣٢) .وأخرجه ابن حزيمه في كتاب التوحيد ، واثبات صفات الرب عزوجل -باب: ذكر امساك الله تبارك وتعالى السوات والارض وماعليها على اصابعه .

**(ئەوان ڕێزی دەسەڵاتی تەواوەتی خودا نلگرن ونەگرتووە کەبکاتە ئەوناستەی خۆی کەپێویستە پیّ بکات )**

٣٠- لەعەبدڵلاوە رەزای خودای لیّ بیّ دەڵێت : ((جاء حبر من الاحبار الى رسول (الله صلى الله عليه وسلم) زانایەك لەزاناكانی بەنی ئسرائیل هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : (( فقال يامحمد ! ئە ی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : ((انا نجد ان الله يجعل السموات على اصبع)).

واتە(( ئێمە دەبینین کەخودا ئاسمانەکان لەسەرپەنجەیە ك ڕاگرتووە ، (( والشجر على اصبع) دارەکانی لەسەر یەك پەنجە ڕاگرتووە .

(( والماء والثرى على اصبع )) ئاوو گلێشی لەسەر یەك پەنجە ڕاگرتووە .

(( وسائر الخلائق على اصبع)) هەموو دروست کراوانی تریش لەسەر یەك پەنجە ڕاگرتووە.

((فيقول :اين الملك )) لەپاشاندا خودا دەفەرمووێت منم پادشای ڕاستەقینە ، **فضحك النبي- (صلى الله علية وسلم) .**

((حتى بدت نواجذه)) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێکەنی هەتا ددانەکانی پێشەوەی بەدەرکەوت ودیاربوو .

((تصديقاً لقول الحبر)) ئەوکەسەی فەرموودەکەی گێڕایەوە دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆیە پێکەنی چونکە ئەم ووتەیەی زانا ئیسرائیلی یەکان بەراستی وبە پەسەند لەپێنووسدا، ((ثم قرارسول الله (صلىٰ الله علية وسلم) لەپاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندکە خودای گەورە دەفەرمووێت ((وما قدروالله حق قدره والارض جميعاً قبضته يوم القيامة والسموات مطويات بيمينه سجانه وتعالى عما . عما يشركون )) .سورة الزمر: (٦٧)

واتە ((بیّ باوەڕو هاوەڵ پەیداکاران ڕێزی گەورەیی خوایان نەگرتووە بەتەواوی لەکاتێکا گەورەیی خودا لەوەدایە کەبۆ ڕۆژی (قیامەت) تیاچوونی دونیا خودا هەموو

زەوی لەچنگ ولەپی خۆ دەگرێ لەرۆژی هەڵسانەوەی بوونەوەر ((هەمووئاسمانەکانیش دەپێچرێتەوە بەراستی خودای گەورە پاك وبێگەردی هەربۆخودایە لەوەی کەهاوەڵ پەیداکاران بۆخودای دادەنێت . ))

## ((لێکدانەوەی زاناکان))

زانا ((ابن حجرالعسقلانی)) دەڵێت ((انا نجد)) واتە: لەتەوراتدا هاتووە ((فیقول انا الملك)) واتە :لەوڕۆژەدا بەس خودای گەورە خاوەن موڵك سامان ودەست ڕۆیی ودەسەلأتە ((وماقدروالله حق قدره)) خوێندنەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆئەم ئایەتە بەڵگەودان پیانانە لەراستێتی ئەوەی کە لەتەوراتداهاتووە وەك چۆن پێکەنینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەمان مەبەست واتای ئەوراستێتی یە دەگەیەنێ ((نەوەوی کۆتای هات لەقەستەلأنی یەوە ))

((ان الله یجعل السموات علی اصبع)) زانایان جیاوازیان هەیە لەسەلماندنی ووشەی ((اصبع)) پەنجە کەبدرێتە پاڵی خودای گەورە بەم شێوەی خوارەوە :-

یەکەم :زانا خەتتابی دەڵێ ووشەی ((اصبع)) لەقورئاندا نەهاتووە نەلەفەرموودەی باوەرپێ کراو دا بەهەمان شێوە .

هەر خەتتابی دەڵێت مەبەست بەپاڵ نانی دەسەلأت بۆلای خودا بێ گومان وەك دەستی هیچ کەسێکی تر یان شتێکی تر هەتا گومان ببرێ بەوەی پەنجە بۆخودا دابنرێ ، بەڵکو ئێمە دەبێت راوەستین لەوشتانەی کە خودای گەورە وەك ((سیفەت)) دەیداتە پاڵی خۆی بۆمان نی یە چەند وچۆنی لێ بکەین یان بیگونجێنین بەهەریەك لەدروست کراوانی خودای گەورە .

هەرئەو دەڵێت لەوانەیە ئەمە هەڵەی یەهوودو نەوەی ئیسرائیلی یەکان بێت ئەمەش هەڵەی ئەوانە : ئەوەی جێ ی باسە قورتوبی لە ((المفهم )) دا هەمان بۆچوونی هەیە بۆیە دەڵێت پێکەنینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆسەرسوڕمان بوو لەنەزانی

كابرای بەناو زانای یەهودی ، هەربۆیەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوكاتەدا ئەوئایەتەی خوێند ((وما قدرو الله حق قدره)) .

زۆر بەتوندی دەوەستێ دژی ئەوكەسەی كە فەرموودەكەشی گێڕاوەتەوە كەتیایدا دەفەرمووێت ((وتصديقاً له)) واتە : پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوئایەتەی خوێندەوە بۆراستكردن و دان پیانانی بەو راستی یە ، دەش لێ ئەم جۆرە بۆچوونە ووتە گێڕاوەیە وبەهیچ ناچێت وپوچەڵە چونكە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ((شتێكی مەحاڵ بەراست ناكاتەوە ) ئەم جۆرە وەسف وسیفەتانە دەر هەق خودای گەورە محاڵە وناگونجێ ، چونكە ئەگەر خودا دەستی هەبێ وپەنجەی هەبێ كەواتە وەك هەریەك لەئێمەی لێ دێ .

ئەگەر واش بوو ئەوا محاڵەكەخودای گەورە وابێ كەواتە ووتەی یەهودی یەكە محاڵە و درۆیە ئەمە هەموو ووتەی فورتوبی یە لە(المفهم)دا.

دووەم : ووتەی زۆربەی زانایانی فەرموودەیی وەك ئیبن ((-صەلاحی- شارەزووری وئیمامی بوخاری- ومسلم، ئیمامی أحمد كوڕی حەنبەل ئیمامی شافیعی زۆرئیمامەكانی تریش .

(( ئیبن الصلاح شارەزووری)) دەڵێت: (( ئەم جۆرە ریوایەتە لەئیمامی (خاری ومسلم) گێڕاوەتەوە ئەمەش خۆی بەخۆی وەك ((متواتره)) لەفەرموودەدا یەكسەر وەر دەگیرێ بەپێی هەموویاساكانی فەرموودەیی كە كاری پێ دەكرێت.

هەربۆیە زانا (قەستەلانی )بەدواداچوونی فورتووبی وخەتتابی وئەو كەسانەش كەهاوبیروبۆچوونی ئەونن دەكات ودەڵێت :- فەرموودەهاتووە كەباس لەپەنجەكانی خودای گەورە دەكات.لەوانە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتی یەوە ((ان قلوب بنی آدم كلها

بين اصبعين من اصابع الرحمن )) (١) هەرقەستەلانی دەڵێ ئەمەش بەتەواوی تابێتە بەڵگە ؟!

هەخۆی دەڵێت بەڵێ راستە ابن الصلاح ئەو ووتەی هەیە کەبوخاری وموسلیم ))وەك ((متواترن)) ونابێت وریگەی تێناچێت بەهیچ شێوەیەك كە هەرهەموویان لەفەرموودەی عەبدڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاسەوە خودایان لێ رازی بێ ریوایەتیان پەرچ بدرێتەوە و گومانی لێ دروست بكرێت ئەو هەواڵانەی كەئەوان گێڕاویەتیانەتەوە وەك هیچ هەواڵێكی تر نی یە كەدەفەرتی ومرنەگرتن و پەرچ دانەوە بدرێت . ئەگەر بەقسەی (( قورتووبی وخەتتابی)) بێت لەوەی كەگوایە ئەوە تێگەیشتنی راوی یەكەیەكەوگومانی بەو شێوە بۆچووە : ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ دەنگ بووە لەهەڵەی كابرای یەهودی ئەم جۆرە بێ دەنگی یەش لەگۆڕینی خراپ وهەڵە لەلایەن پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هەرخۆی بەخۆی مەحاڵە ؟!!!

هەربۆیە ((زانای بەناوبانگی فەرموودە ((ابن خزيمه)) بەتوندو تیژی بەر پەرچی هەریەك ((قورتووبی و خەتتابی و كەسانی تریش )) دەداتەوە بەم شێوەی خوارەوە كەدەڵێت:- ((بێ گومان یاوەران وهاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و رەزای خودا لەوانیش بێت لەهەمووكەس زاناترن بەوەی كەدەیگێڕنەوە هەربۆیە هاوەڵان دەڵێن پێكەنینەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆدان پیانانی بووە بۆئەم راستی یە: ئەی چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوێی لەكەسێك بێت وەسفی خودای ئەو بكات بەشتێك كەنەگونجاوبێت بێ دەنگ دەبێت لێی .؟!

لەپاشاندا ((ابن خوزەیمە)) دەڵێت :- ئەگەر ئەم شتانەی كەئێمە باس مان كرد سەلمێنرانەوە بزانە كەهەر وەسفێكی خودای گەورە لە ((چاو ودەست وپێ هتد..)) ئەوا لەزانای بەناو بانگ ((القاضى)) یەوە هاتووە كە دەڵێت: (ئێمە باوەڕبەخوداو

---

(١) اخرجه مسلم في كتاب القدر- باب :تصريف الله تعالى القلوب كيف شاء برقم :١٧-(٢٦٥٤) .واخرجه الامام احمد : ((٢-١٦٨-١٧٣) والطبري : ((ج٦ رقم ٦٦٥٧ صفحة : ٢١٩ ))

بەسیفەتەکانی دەهێنین بەلاّم لەگەلّ کەسی تری ناگونجێنی ناوێنین، نەکەس بەخودا ، نەخوداش بە کەس ناوێنرێ چونکە هیچ هاوێنەی نی یە وبیسەرو بینەرە ((لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ (١١الشورى) ئەوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بفەرمووێت ئەوەراستەو رەوایە ، ئەگەر دەرکمان پێ کرد ئەوا بەهرەی خودایە لەسەرمان ، ئەگەر لێمان دیارو ئاشکرا نەبوو ئەوا ئێمە بڕوامان بەخودا هەیە بەوسیفەتە چۆن یەتی یە کەی دەدەینەوە پالّ خودای گەورەی .

***(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)***

١) ئایینە ئاسمانیە کان یەکتر بەیەکتر راستکار تر دەکەن پشت یە پشتی یەك پتەودەکەن .
٢) بیروباوەڕی هەموو پێغەمبەران هەریەکە بەلاّم لایەنی یاسایی وبەرنامە تەشریعی جیاوازی تێدایە .
٣) گەورەیی ودەسەلاّتی خودا ی گەورە مان بۆدیاردەکات .
٤) ئەم جۆرە گەورەییانەی خودای گەورە بۆنزیك کردنەوەیە لەهزروتێگەیشتنی مرۆڤ چونکە خودا خۆی دەفەرمووێت: ((إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ }٨٢{ )) سوره يس)") واتە: فەرمانی خودا کاتێك هەر فەرمانێك دەربکات هەر ئەوندەیە کەخودا دەفەرمووێت بەستەکە ببەدەبێت .
٥) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ویارانی گوێ بیستی پەرتووکەکانی خۆمان دەبوونەوە بۆئەوەی لەراستی پشتیان بگرێت ئەگەر ئەوان لەبۆچونیان بۆتێگەشتنی ئایینەکەیان هەلّە بوونایە بۆی راست دەکردنەوە .
٦) زانا بۆی هەیە گوێ بیستی ئەو کەسبێت کەلەئەو کەمتر زانینی پێ بێ .
٧) دان نان بەهەرشتێکی هەق دراست و رەوا لەر کێ ئێمە وە بێت .
٨) خاوەن دەسەلاّت ومۆلّك لە رۆژی قیامەت هەرخودایە .

٩) هەمووکەس بێ کەس کارو بێ مۆڵك دەمێنێ لەو رۆژەدا .

١٠) کەس نی یە وەڵامی ئەوپرسیارەی خودا بداتەوە کەدەفەرمووێت ((این الملوك )) کوان لەکوێن پادشاکان وخۆ بەگەورە زانان .

١١) تەنها خودای گەورە خۆی وەڵامی خۆی دەداتەو بەدووشەی: ((لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿١٦﴾) سورة الزمر

١٢) هەرکاتێك شتێکی خۆش و دڵ شادکار گۆێ لێ بێ سووننەتە پێ بکەنێ چونکە پێغەمبەرت (صلی الله علیه وسلم) پێکەنی هەتا ددانەکانی پێشەوەی دیار بوون .

١٣) لەگەڵ ئەوزانین وزانستەی کەلای ئەهلی کتابەکان هەبوو واش گەورەیی خودایان نەسەلماندووە .

١٤) هەمان بیرو باوەڕی تەوارت لەم کارەدا هەمان واتای قورئانە: (( ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧سورة االزمر) .

١٥) بەزانین وناسینی گەورەیی خودا ئەبێت زیاتر لێ ی بترسین بۆئەوەی وەك یەهودەکان نەبین دانیان بەگەوریی خودابە تەواوەتی نەدەنا .

---

- ((وقولوا للناس حسناً)) سورة البقرة:

. واتە: ووشەی جوان وپاك بە خەڵك بڵێن وفێر بکەن.

- ((فبما رحمة من الله لنت لهم، ولو كنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولك)) سورة آل عمران:.واتە : لەسۆزو میهرەبانی خوداوەیە کە تۆ ئەی محمد لە گەڵ ئەوان نەرم لەسەر خۆی ئەگەر بەهاتایە تۆقسەو دڵ رەق بوویتایە ئەوانەوان بەچوار چێوەی تۆدا نەدەمان
- هەر کەس ناتوانێ کاری چاك ئەنجام بدات با چاکە کردنەکەی ئەوە ندەش بێت کە خراپە وازلێ بهێنێ. ((ئەرستو)
- چاکە تەنها چاکە کاران دەیناسنەوە. ((عەرەبی)).

## ((شهادة محمد صلى الله وامته على الانبياء ومتبعيهم على تبليغم الدعوة))

٣١-عن ابي سعيد الخدري- رضي الله عنه -قال :قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) -(يجيء نوح وامته، فيقول الله تعالى :هل بلغت؟ فيقول :نعم، اى رب ! فيقول لامته: هل بلغكم ؟ فيقولون: لاماجاء نا من نبي فيقول لنوح: من يشهد لك ؟ فيقول :محمد (صلى الله عليه وسلم) فتشهد انه قد بلغ وهوقوله جل ذكر ه ((وكذلك جعلناكم امة وسطاً لتكونوا شهداء على الناس ))، البقرة: ١٤٣- روالبخارى في صحيحه (١)

**((پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و نەتەوەکەی شایەتن لەسەرئەوەی نوح (صلى الله عليه وسلم) وسەرجەم پێغەمبەرانی تریش پەیامەکەیان بەنەتەوەکانی خۆیان گەیاندووە ))** .

**لەباوکی سەعیدی کوڕی ئەلخودریەوە- رەزای خودای لێ بێ- ولە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت ((یجئ نوح وامته)) پێغەمبەرنوح (صلى الله عليه وسلم) ونەتەوەکەی دەهێنرێ لەرۆژی قیامەتا)) فیقول الله تعالى : ((هل بلغت ؟))خودای گەورە لە((نوح)) دەپرسێت ئایا پەیام ونیگای منت بەخەڵك گەیاند؟ (فیقول:نعم،ای رب !) ((نوح)) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەڵێت بەڵێ ئەی خودایە ! (فیقول لامته: هل بلغکم) خودای گەورە لەنەتەوەکەی نوح (صلى الله عليه وسلم) دەپرسێت ئایا نوح (صلى الله عليه**

---

(١) اخرجه الامام البخارى في كتاب احاديث الانبياء باب :قول الله -عزوجل ((ولقدارسلنا نوحاالى قومه ...))واخرجه البخارى ايضاً في كتاب التفسير سورة البقره-باب قول تعالى: ((وكذلك جعلنا كم امة وسطاً.))واخرجه الترمذي في ابواب التفسير -سورة البقرة برقم (٣١٤٠) واخرجه ابن ماجه في كتاب الزهد-باب :صفة امة محمد (صلى الله عليه وسلم) برقم (٤٢٨٤) واخرجه النسائي في كتاب التفسير -سورة البقرة -باب :قوله تعالى: وكذلك جعلناكم امة وسطاً برقم (١١٠٠٧) .

وسلم) پەیامی منی پێ گەیاندن؟ (فیقولون: لاماجاء نا من نبي))، نەتەوەکەی دەڵێن نەخێر ، لەبنەڕەتدا پێغەمبەرم (نوح)مان (صلی الله علیه وسلم) هەربۆنەهاتووە ، (فیقول لنوح :من یشهد لك؟) خودای گەورە بە نوح (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێت کێ یە کەشایەدی ئەوەبدات کەتۆنیگای منت گەیاندووە ؟ (فیقول نوح محمد (صلی الله علیه وسلم) وامته- (صلی الله علیه وسلم) دەڵێت بەڵێ شایەدی من محمد (صلی الله علیه وسلم) ونەتەوەکەیەتی کەمن پەیامی تۆم بەنەتەوەکەم گەیاندووە، (فتشهد انه قدبلغ)) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەی شایەتی دەدەن کەنوح (صلی الله علیه وسلم) پەیامەکەی گەیاندووە بەنەتەوەکەی خۆی ((وهوقوله جل ذکره)) ئەوەش ئەوئایەتەیە کەخودای گەورە دەفەرمووێت: (({١٤٢} وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْشُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا))سۆرةالبقرةالاية

واتە:(ئابەوشێوەیە ئێوەمان کردووە بەگرۆو نەتەوەیەکی دادپەروەر بۆئەوەی بین بەشایەد لەسەر خەڵکانی تر )) .

### (گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)

١) حاکم حووکم ناکات بەوەی کەخۆی دەیزانێ بەڵکو پێویست بەوە دەبێت کەشایەدی تر هەبێت .

٢) خودای گەورەلێپرسینەوەیش تەنانەت لەپێغەمبەرانیش(صلی الله علیه وسلم) دەکاتەوە کەئایا پەیامیان گەیاندووە لەکاتێکا خۆی لەهەمووکەس باشتردەزانێ .

٣) کاتێ حاکم ڕاست گۆی ی کەسێکی بۆدەرکەوت یان ئەیزانی ڕاست گۆیە ئاشکرای نەکات هەتا شایەدی ترنەبێت .

٤) حوکم نەدان بەسەر ئەوکەسەی کەلەسەری نووسراوە هەتا پرسیاری لێ نەکرێت .

٥) کاتێ دووکەس هەریەك دژبەیەك تر بلێن پێویستە شایەتی دەرەکی هەبێت بۆپەسەندکردنی یان پەرچ دانەوەی هەریەکێکیان لەو دوولایەنە .

## ٦) گەورەیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وامتە کەی لەم خاڵانەدایە .

أ) باوەڕو جێ ی ئەمینداریێتی پێغەمبەرانن (صلی الله علیه وسلم)

ب) خودای گەورە پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەی بەدادپەروەری لەقورئان تۆمار کردووە بۆمەبەستێك کەلەخاڵی ((ج)دا دیاربێت .

ت) بۆئەوەی شایەدی حاڵی پێغەمبەران بن بۆگەیاندنی پەیامەکەیان .

پ) پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەشی لەوئاستەن کەخودا ئەوانی بۆ هەڵبژاردووەودناوە.

ج) خودا شایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەی پەسەند دەکات پێغەمبەران بەراست دەکاتە بەهۆی شایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەی بەهەمان شێوە درۆ وگەزافی نەتەوەکانی تر ئاشکراو هەڵ دە ماڵێ .

ح) دەرفەتی دان بەتاوان باران بۆداکۆکی کردن وهێنانەوەی پاساو بیانووی خۆیان.

١. (الاحسان ان تعبدالله كانك تراه ، فان لم تكن تراه فانه يراك ) ﴿حديث﴾

واتــە : (چاکە کردن ئەوەیە تۆ خودا بپەرستی وەك ئەوەی تۆ خودا دەبینی ئەگەر تۆیش ئەو نەبینی ئەوا خودا تۆ دەبینێ) .

٢. (خيربيت بيت فيه يتيم يحسن اليه) ﴿حديث﴾

واتــە : باشترین ماڵێك ئەو ماڵەیە کە هەتیوێکی لێ بێ و چاکەی لەگەڵ بکرێت .

٣. پاداشت نی یە بۆ کەسێك نەبێت چاکە کار بێت ) ﴿ئیمامی عومەر﴾

٤. بە چاکە کردنت لەگەڵ خەڵکی قەرزاری خۆتیان بکەن ، خراپەی بەوە لە خۆت لادە کە هەدیەیان بکەیت .
﴿ ئیمامی عەلی ﴾

٥. ئەمڕۆ چاکە بکەن کە دەتوانی ، چونکە توانانی بەسەر چاکە کردنا بەردەوامی نابێت . ( .......... )

**((النجوى بين الله سبحانه وتعالى وبين المؤمنين وذلك لاقرار هم على ذنوبهم ولسترهم بين الخلائق ))**

عن عبدالله بن عمر-رضي الله عنهما- قال :سمعت النبي (صلى الله عليه وسلم) يقول ((يدني المؤمن من ربه حتى يضع عليه كنفه فيقرره بذبه تعرف ذنب كذا ؟ يقول :اعرف يقول: رب اعرف مرتين فيقول سترتهافي الدنيا واغفرها لك اليوم، ثم تطوى صحيفة حسناته ؛ واماالأخرون- أوالكفار-فينادى على رؤوس الاشهاد: ((هؤلاء الذين كذبوا على ربهم الالعنة الله على الظالمين )) رواه الامام البخارى في صحيحه(١)

**((چپەو جفە کردنی خودای گەورە لەگەڵ باوەڕدار بۆدان پیانانی خراپە کانی وپۆشین لەناو خەڵکاندا))**

لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابەوە رەزای خودای گەورەیان لێ بێت دەفەرمووێت گوێم لەپێغەمبەر بووە(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو : ((يدني المؤمن من ربه)) مرۆڤی باوەڕدار لەرۆژی قیامەتا نزیك دەكرێتەوە و دەبێتەوە لەخودای گەورە ((حتى يضع عليه كنفه )) هەتاخودای گەورە لای بەلایەوە دەنێت ((فيقرره بذنوبه)) دانی بە خراپە وتاوانەکانیا پێ دەنێت ((لەکاتێکا کەبەنهێنی یەوە بۆئەوەی کەس لەوخەڵکە زۆرانە ئاگاداری تاوانەکەی نەبێت )) . ((تعرف ذنب كذا؟)) خودای گەورە لێ ی دەپرسێ ئەو تاوانەت لەبیرەو دەیناسیتەوە ؟

---

١)اخرجه الامام البخاري في صحيحه في كتاب التفسير –سورة هود-باب قوله تعالى: ((ويقول الاشهاد هؤلاء الذين كذبوا على ربهم الا لعنةالله على الظالمين..) الأيةواخرجه البخاري ايضاً في كتاب المظالم-باب: قول الله تعالى ((الالعنة الله على الظالمين))واخرجه البخاري أيضاً في كتاب التوحيد –باب كلام الرب –عزوجل يوم القيامة مع الانبياء وغيره .واخرجه البخاري ايضاً في الادب المفرد-باب ستر المؤمن على نفسه وغيره واخرجه مسلم في كتاب التوبة-باب :قبول توبة القاتل، وان كثر قتله برقم: ٥٢-(٢٧٦٨)واخرجه النسائي في كتاب التفسير –سورة هود –باب: قول الله : ((ومن يكفر به من الاحزاب فالنار موعده)) برقم ((١١٢٤٢)) واخرجه بن ماجه في المقدمة –باب : فيما انكرت الجهمية))

((یقول: اعرف یقول رب اعرف أعرف مرتین))

وەلأم دەداتەوە ودەلێت بەلێ ئەی خودام ! دەینا سمەوە ، بەلێ ئەی خودام دەیناسمەوە ((دووجار دووبارەی دەکاتەوە ))

((فیقول الله:سترتها في الدنیا)) خودای گەورە دەفەرموویت من ئەم نهێنی یەی تۆم بۆتۆ دا پۆشی لەرۆژەکانی دوونیا ، ((واغفرها لك الیوم)) وائەم رۆش لێت خۆش دەبم ،((ثم تطوی (صحیفة حسنه) لەپاشاندا پەڕاوی چاکەکانی پێ دەپێچرێتەوە . ((واما الاخرون- اوالکفار) بێجگە لەباوەڕداران یان بێ بڕوایان ((فینادی علی رؤوس الاشهاد)) لەسەر سەری ئەو هەمووە خەلکانەوە بانگ دەکرێت و دەوترێت : (( هؤلاء الذین کذبوا علی ربهم الا لعنة الله علی الظالمین )) ئەم کەسانە ت کە درۆیان بەسەرخوداوە کردوو باوەڕیان نەهێناوە، هەموو نەفرین دووری یەك لەمیهرەبانی خودا بۆستەم کاران))

## (گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)

١) گەورەیی ومیهرەبانی وسۆزو لێ بووردەیی خودایی لەداپۆشین ودانە مالێنی ئەو تاوانانە کەبەنهێنی ئەنجام دراوە لەدونیادا .

٢) نزیك بوونەوەو نزیك کردنەوە (بەندە) لە(خودا)ی گەورە بۆنەم مەبەستانەیە:

أ) بۆدەرخستنی میهرەبانی خودایە بۆ باوەڕدار .

ب) رێزی باوەڕدار لەلای خودای گەورە .

ت) نهێنی یەکان تەنانەت لەفریشتەکانیش دەشارێتەوە .

پ) بۆشاردنەوەی تاوانەکان لە سەرجەم خەلکانی ئەورۆژە .

ج) بۆدان پیانانی ((اقرار)) پێ کردنی باوەڕدارە لەسەرتاوانەکانی .

٣) تاوانکاری باوەڕدار دان بەتاوانەکەیدا دەنێت لەباتی جارێك دووجار.

٤)خودای گەورە تاوانەکانی چۆن لەدوونیا پۆشی لەورۆژەشدا لێ ی خۆش دەبێ.

**٥) تاوانی ئاشکرا لەدوونیا خودای گەورە نا یپۆشیٚ چونکە : -**

**أ) سوکایەتی کردن زیاتری تیادایە بەشکاندنی وبەزاندنی سنوورەکانی خودای گەورە .**

**ب) خەڵك چاولەئەو دەکەن بۆخراپەکردن .**

**ت) خراپەکردن ئاسان دەبێت لەپێش چاوی خەڵکی .**

**پ) سۆزو هەستی لەخودا ترسانی پیٚ دەشکیٚ .**

**ج) لایەنی دووژمنان خودای گەورە وەخراپەکارانی پیٚ بەهێز دەبیٚ .**

**٦) لەرۆژی قیامەت سەرزەنشت کردن لەسەر خراپەکان دەکرێت لەپاشان مافەکانی تری پیٚ دەبە خشریٚ لەپاداشتی دانەوەی بۆچاکەکان.**

**٧) هەرکەس خراپەکاربێت بەئاشکرا خودای گەورە لەرۆژی دووای رسوا تری دەکات بەپێش چاوو لەسەر وهەموو خەڵکانەوە هەرلەئادەمەوە هەتا دواین مرۆڤ خەڵکی لیٚ ئاگادار دەکات خەڵکان وفریشتەکان وخودای گەورە خۆیشی نەفرینی لیٚ دەکەن .**

**٨) چۆن لەدوونیا شانازی بەخراپەوە کردووە بەهەمان شێوە شانازی وخۆبەگەورە زانینەوچاو نەترسانەی ، بەسەر شۆری پیٚ کردن بیٚ نرخی بۆدانان ورسواکردن لەخزمەت خوداو فریشتەکان وپێغەمبەران وسەرجەم کەسانی زانا و دانا وپیاو ماقوڵان ونزیك ترین کەسی خۆی کەئەو حەزی بەوەنیە ئەوان ئاگاداری تاوان نهێنی یەکانی بنوتاوانەکانی هەڵ ماڵێنبەڵام خودای گەورەلێیان ولەسەریان هەڵ دەماڵیٚ .**

**٩) گەورەترین سزاو تۆڵەش چاوەروانی لیٚ دەکات .**

**١٠) لایەنی دەروونی وهەستی و رۆحی ئازاری دەدرێت لەپاشان ئازار نەبراوە ی جەستەیی دەست پیٚ دەکات .**

بـە یادکردنــەوەی خــودا هــەوری رەشـی قـورس و نیگـەرانی و غـەم و پـەژارە پـەرت و بـڵاو دەبێتــەوە ، بـا وەك چـیاگەورەکانی رووی ئـەم سـەر زەویـەش بێـت ، بەراسـتی جێـی سەرسـوڕمان نیـە ، کـە حەوانـەوەی دڵـەکان بەشـی ئـەو کەسـانەیە کـە یـادی خـودا دەکـەن ، چـونکە ئەمــە وەعـدی خودایـە تاقیکردنـەوەش باشـترین بەڵگەمانـە . بـەڵام ئـەوەی جێـی سـەرنج و سـەر سـوڕمانە ئەوەیـە ئایـا ئـەو کەسـانە کـە دوور و بـیٚ ئاگـان لـە یادی خودا چۆن ژیان دەبەنە سەر ﴿أَمْواتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ سورة النحل/٢١

واتە: (ئەوانە مردوون ، زینـدوو نـین ، بیٚ ئاگان لەوەش کەی خودا زینویان دەکاتەوە).

## ((لوكان لا هون النار عذاباً ملء الارض ذهباً يفتدي به))

٣٣- عن انس بن مالك- رضي الله عنه -يرفعه الى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ((ان الله-عزوجل-يقول لاهون أهل النار عذاباً: لوان لك مافي الارض من شيء ،كنت تفتدي به ؟ قال نعم ،قال فقد سألتك ماهو اهون من ذلك وانت في صلب آدم: ان لاتشرك بي فابيت الا الشرك )) . رواه البخارى في صحيحه (١).

## ((ئەگەرئەوكەسەی لەسوكترین سزای ئاگری لەسەرە لەدۆزەخدا بەپڕی زەوی زێری هەبوو بایە دەیكردە سەندنەوە خۆی بۆئەوەی رزگاری ببێ لەئاگر و سزاكەی ))

## ((واتای فەرموودە))

لەئەنەسی كوڕی مالكەوە كەدەڵێت گوێم بووە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی ((ان الله —عزوجل —يقول لاهون اهل النار عذاباً )) خودای گەورە دەڵێت بەكەسێك كەسشوكترین سزای لەسەرە:(لوان لك مافي الارض من شيء)) ئەگەر بەپڕاوپڕی زەویت شت ومەكەك وكەل وپەل هەبووایە ((كنت تفتدي به؟)) دەتكردە سەندنەوەی خۆت بۆسزا نەدانت (قال:نعم)ئەویش دەڵێ :بەڵێ دەمكردە كڕینەوەی خۆم بەس لەپێناو ئەوەی لەسزام لەسەر هەل گیرێ (ىقال: فقد سالتك ماهو اهون من ((ذلك))خودای گەورە دەفەرمووێت لەئەمەم ئاسانترو سووكتر داوا لێ كردیت (وانت في صلب ادم)هێشا تۆلەپشتی باوكتا ئادەم بووی:(ان لاتشرك بی) كەهیچ هاوەڵ بۆمن پەیدانەكەیت ودانەنێیت(فابيت الاالشرك)بەلأم گوێت پێنەداوهاوەڵت پەیداكرد بۆمن .

---

(١) اخرجه البخارى في كتاب احاديث الانبياء-باب خلق آدم وذريته . واخرجه البخارى ايضاً في كتاب الرقاق:باب:صفه الحين النار.واخرجه مسلم في كتاب صفات المنافقين واحكامهم باب طلب الكافر الفداء بملء الارض ذهبا برقم :٥١-(٢٨٠٥) واخرجه مسلم في المصدرا لسابق برقم :٥٢-(٠٠ ٠٠)واخرجه مسلم في لمصدرالسابق برقم ٥٣-(٠٠ ٠٠)

**(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)**

١) خودای گەورە قسەوباس دەکات تەنانەت لەگەڵ دۆزەخی یەکانیش .

٢) قسەکردنی خودای گەورە بۆیان بۆزیاتر بار گرانی یانە.

٣) ئەگەر هەموو دونیا بەزێرەوە بۆبێ باوەڕ هەبێت بۆئەوەی خۆی پێ بکڕێتەوە ئامادەیە بۆئەم کارە.

٤) ئەگەر هەموودوونیاوئاسمانەکانیش بدات بۆکڕینەوەی خۆی خودای گەورە لێ ی وەرناگرێت لەکاتێکا هیچ کەس نی یە خاوەنی کەمترین وبچوکترن شت بێت لەورۆژەدا .

٥) خودای گەورە لەدوونیادا داوای ئەمانەی لێ نەکردی .

٦) گەورەترین تاوان کەخودای گەورە لێ بوردەی نیەهاوەڵپەیداکردنەـالشرك بۆخودایە.

---

- ((إن الله رفيق يحب الرفق في الأمر كله))فەرموودە.

واتە: ((خودای گەورە خۆی میهرەبانە وبەسۆزە نەرم ونیانی لە کارەکاندا بە تێکڕا خۆش دەوێ

- ئـەی ئـەو کەسـەی هـاوارت لێ هـەڵ سـاوە ، ئـەوەی کـە خـەوت لێ ناکـەوێت، ئـەوەی کـاتی خۆشـی و ناخۆشـی دەروونـت هـەر مانـدوو و هیلاکـە ، چاوەکانت پـڕ دەبێت لـە گریـان بـەهۆی ئـازار ، لـە خـۆت بێزاریـت لـەو لێ بەسـەر هاتانـەت بـەری تـیری کوشـندەی ناخۆشـیەکان کـەوتووی ، وەرە هـاوار بکـە بـەناوە پیرۆزەکانی خودا ﴿ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا ﴾ سورة مريم/٦٥

واتە : (ئایا هیچ کەسێك دەناسی ناوی پیرۆزی گەورەیی (الله) هەڵ گرێتەوە .

**((من هم الذين يمنعون من شرب الكوثر ؟))**

عن ابي هريرة- رضي الله عنه -انه كان يحدث ان رسول الله- (صلى الله عليه وسلم) قال ((يرد علي يوم القيامة (رهط من أصحابي ،فيجلون عن الحوض ،فأقول :يارب ! اصحابي فيقول: انك لاعلم لك بما أحدثوا بعدك ،انهم ارتدوا على اعقابهم القهقري)) .رواه الامام البخاري (١) في صحيحه .

**((كێن ئەوكەسانەی قەدەغەولادەدرێن لەوەی کە لەئاوی سازگاری بێ وێنە کەوپەربخۆنەوە ؟))**.

**لەباوکی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گێڕاویەتی یەوە هەندێك کەس لەهاوەڵانم کەبروایان بەمن هێنابوو لادەدرێن لەوەی کەئاوی کەوسەر بەدەستی من بخۆنەوە (فأقول: يارب ! أصحابي، فيقول: انك لاعلم لك بما أحدثوا بعدك) . دەڵێم: (( ئەی خودا ئەوانە هاوەڵی منن))(٢) ؟ خودای گەورە پێم دەفەرمووێت: ((تۆنازانیت چیان ئەنجام داوە لەپاشی خۆتەوە ))، (انهم ارتدوا على اعقابهم القهقرى) واتە : ئەوان گەڕانەوە لەوەی کەباوەڕیان هێنابوو بۆدواوە وپاشەکشێ یان لەکارەکان و ووتەکان پەرستنەکان کرد ).**

---

(١) اخرجه البخاري في كتاب الرقاق –باب :في الحوض :وقول الله تعالى: ((إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ {١})).واخرجه مسلم في كتاب الفضائل –باب :اثبات حوض نبينا،(صلى الله عليه وسلم) وصفاته برقم ٣٢-(٢٢ ٩٧) .واخرجه الامام احمد في المسند .

((٢)) - چونکە هاوەڵ پەیدا کردن سووك بوو لە لای موسڵمانان بۆیە شەیتان بەشێوەیەکیتر بۆ موسڵمان دێت ئەویش خۆش کردن وتام لەدوونیا کردنە هەتاوا لەموسڵمانان دەکات کەیەکتری لەسەر بکوژن ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لێ ی ترساوە رووی داوە و روودەدات .ئایا پەندوەرناگرین بەکتر کوشتن تاکەی.

دەڵێم: (( ئەی خودا ئەوانە هاوەڵی منن))(١) ؟ خودای گەورە پێم دەفەرمووێت: ((تۆنازانیت چیان ئەنجام داوە لەپاشی خۆتەوە ))، (انهم ارتدوا على اعقابهم القهقرى) واتە : ئەوان گەڕانەوە لەوەی کەباوەڕیان هێنابوو بۆدواوە وپاشەکشێ یان لەکارەکان و ووتەکان پەرستنەکان کرد ).

## *(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)*

١) دەرئەنجام بۆئاخیر خەیری بەستراوە بە کۆتایی هاتنی لەسەر چاکەو باشەوەولەسەر بیروباوەری راست بمرێت .

٢) زۆرکەسانێك لەوانەیە لەپێش چاوی ئێمە مرۆڤی چاك بن بەلاَم لای خودای گەورە ئەوان دۆزەخین بەهۆی بیر باوەڕی ناوەوەیان یان پاش گەز بوونەوەیان لەدووای بیروباوەڕیان .

٣) ئەوان لەبەر ئەوەی خۆیان بەموسڵمان دەهێننەپێش چاوی خەڵکی ئەوا لەگەڵ موسڵمانان بەرەو کەوسەر دەچن بەلاَم خودای گەورە هیچی لێوون نابێ بۆیە فەرمان دەدات جیادەکرێنەوە بۆدۆزەخ دەبرێن . ) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرەڤانیان لێ دەکات لەبەربەئۆمەتی خۆی دەزانێ

٤) بەلاَم خودای گەورە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کەئەوان لەپاش مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پاش گەزبوونەوە بۆبەرەڤانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆئەو جۆرە کەسانە نی یە کەبێ بڕوابن یان دوو روویان هاوەڵ پەیداکاربن .

---

١) ئەوکەسانە لەوانەویە دوو رووەکان بن کەلەخزمەت پێغەمبەردابوون (صلى الله عليه وسلم) بەلاَم ناویان ئاشکرانەکراوە لەبەر هەرهۆیەك بێت خودای گەورە ناوی باس کردبن بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆنموونە: لەوانەمەترسێ یان بۆنایین وپێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبووبێ لەدوونیادا بۆبە ناویان نەهاتبێ یان بەکەسانێك دەڵێن کە هاتبوونە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەلاَم لەپاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاش گەزبوونەوە وەك موسەیلەمەی ((الكذاب)) .

٥) زانستی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەمووفریشتەکانیش هەرسنووردارە تەنها خودای گەورە شارەزاو زانا وپسپۆڕە بە هەموو شتێك .

٦) هەرکەس لەوئاوە بخواتەوە هەتا هەتایە تیینوو نابێ ، هەرکەسێکیش لەوئاوە بێ بەش بێت هەتا هەتایە هەر تینوودەبێ تێنوویەتی ناشکێ قەت وهەرگیز تێر ئاو بوونی نابێ .

(ئەم ئاوەش تایبەتە بەئومەتی پێغەمبەرەوە. بۆ پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) وەك خەلاَتێکی بێ وێنەی بۆ پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) نەتەوەکەی . نەتەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەدەستی پیرۆز وموبارەکی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) (ئاو)ەگەدەخۆنەوە .

٧) لەباسی ئەو( ئاو)ە هاتووە :-

یەکەم: بووخاری دەگێڕێتەوە لەعەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە زەزای خودایان لێ بێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی ((حوضی مسیرة شهر، ماء ابیض من اللبن ،وریحه اطیب من المسك وکیزانه کنجوم السماء من شرب منه فلایظمأ أبدا)) .

واتە: (نێوان حەوزی کەوسەر رێ ورۆیشتنی مانگێکە، ئاوەکەی سپی وجوانترە لەشیر، بۆن وبەرامی خۆشترە لەبۆنی میسك ،( پەرداخ) و(گلاَس)ەکانی بەئەندازەی (ئەستێرە)کانە هەرکەس لێ ی بخواتە وەتینوو نابێ هەرگیزو هەرگیز .

دووەم : هەرلەبووخاریەوە –رەحمەتی خودای لێ بێ –لەعوقبەی کوڕی باوکی ئەسوەدی جوهەنی- رەزای خودای لێ بێ کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) رۆژێك چووە گۆڕستانی ((بەقیع)) نوێژی بۆمردووەکان دەکرد وەك چۆن ئا ئێستا نوێژلەسەر مردووبکەیت.

لەپاشاندا گەڕایەوە وچووە سەر مینبەرەكەی –وەك ئەوەی (ماڵ ئاوایی وخودا حافیزی بخوازێ لەمردوو زیندووەكانیش فەرمووی : ((انی فرط لكم)) من چاوەڕوانتانم )) مەبەستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) چاوەڕوانی كردنی خۆی لەسەر حەوزی كەوسەر بۆ باوەڕداران.

((واناشهید علیكم)) منیش شاهیدم لەسەرتان )) كەئاینم پێ گەیاندوون ((وانی والله لا نظر الی حوضي الان)).

واتە: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت ((سوێند بە خودا ئا ئێستا من دەڕوانمە حەوزەكە ((من كلیلی خەزێنەكانی زەویم پێ دراوە((أو مفاتیح الارض)) كلیلەكانی زەویم پێ دراوە.

((وانی والله ما اخاف علیكم ان تشركوا بعدی)).

واتە: (( سوێن بەخودای گەورە من لەوەناترسم كەئێوە جارێكی تر هاوەڵ بۆخودا پەیدابكەنەوە (١ ).

بەڵام ((ولكن اخشی علیكم الدنیا ان تنافسوا فیها))

واتە :( بەڵام ئەوەی من دەترسم لێ ی ئێوە بەرامبەر یەك بوەستن لەسەر ئەوەیە پێش بڕكێ بكەن لەسەر دونیا دوارۆژتان لەبیربچێتەوە).

( فتقتلو اعلیها))واتە : ( یەكتری لەسەر بكوژن) .

---

- ((تحرم النار علی كل قریب هین لین سهل)) فەرمودە

واتە: خودای گەورە ئاگری دۆزەخی قەدەغە وحەرام كردووە لە سەرهەركەسێ كە ئەیەوێ بەنەرمی و بە ئاسانی ولە سەرخۆیی بۆ كارەكان بچێت بەهەمان شێوە هەڵسو كەوتی نەرم ونیانە لە گەڵ خەڵكیدا.

- - ((یسروا ولا تعسروا وبشروا ولا تنفروا))فەرموودە.

واتە: ئێوە ئاسانكاری بكەن وگران كاری مەكەن لە سەر خەڵكی مژدە دەر ومژدە هێنەربن لە سەر خەڵكی نەك خەڵك دوورخەنەوە بەوەی لە گفتارو كردارتان بەرامبەریان رەق وتوند وتیژبن.

- نەرم بە تەنانەت لە گەڵ ئەو كەسەش كەتوندو تیژی بووە لە گەڵت بەم كارەت وای لێ دەكەیت كەبەخۆیدا بێتەوە ونەرم بێت لە گەڵت.((ئیمام عەلی)).

**((قول الله تعالى من كان في قلبه متقال حبة من خردل من ايمان فأخرجوه))**

عن ابي سعيد الخدري- رضي الله -ان النبي (صلى الله عليه وسلم) قال : ((اذا دخل اهل الجنة الجنة،اهل النار الناريقول الله تعلى :من كان في قلبه حبة من خردل من ايمان فأخرجوه، فيخرجون قد امتحشوا وعادوا حمما فيلقون في نهر الحياة ،فسينبتون كما تنبت الحبة في حميل السيل-أوقال: حمية(( وقال النبي (صلى الله عليه وسلم) -((الم تروا انها تنبت صفراء ملتوية)) . رواه البخاري (١) في صحيحه

**((خوداى گەورە دەفەرمووێت ئەوکەسەی کەلەقەبارەو قوورسایی وکێش تۆوی دنکە خەردەلێك لەدۆزەخی بهێنەدەر بۆ بەهەشت ببرێت))**

**٣٥- لەباوکی سەعیدی خودری(رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : ((اذا دخل اهل الجنة الجنة واهل النار النار)) کاتێ لەرۆژی قیامەتدا)) ئەوانەی بەهەشتین دەچنە بەهەشتەوە ئەوانەی دۆزەخین دەچنە دۆزەخەوە ((يقول الله تعالى : من كان في قلبه مثقال حبة خردل من ايمان فا خرجوه)) خودای گەورە دەفەرمووێت هەرکەسێ لەناودڵی دا باوەڕی هەبووبێ دەری بهێنن لەناوئاگری دۆزەخدا ((فيخرجون قد امتحاشوا)) سوتاوو رەش بوو بوون ((وعادوا حمماً)) وەك خەڵوز یان لێهاتبووا ((فليقون في الحياة)) دەخرێنە ناو جۆگەلەی ژیان ، ((سينبتون كما تنبت الحبة في حميل السيل )) ئەو گڵ ولیتە تە کەلافاو لەگەڵ خۆی دەیهێنێ کە زۆر بەبەرەکەتە بۆگەشەکردنی تۆوی خەرتەلە کەلەنێوان شەو ورۆژێکداگەش دەبێ**

---

**(١) اخرجه البخاري في كتاب الرقاب-باب :صفه الجنه والنار.**

**واخرجه مسلم في كتاب الايمان -باب : اثبات الشفاعة واخراج الموحوين من النار برقم : (٣٠٤-(١٨٤)**

**.واخرجه الامام احمد وبن خزيمة والاجري .**

كما تنبت الحبة في حميل السيل )) ئەو گڵ ولیتە تە کەلافاو لەگەڵ خۆی دەیهێنێ کە زۆر بەبەرەکەتە بۆگەشەکردنی تۆوی خەرتەلە کەلەنێوان شەو ورۆژێکداگەش دەبێ ودەڕوێ لەناو ئەو جۆرە گڵەو لیتەدا)) (( وقال النبی (صلی الله علیه وسلم) ألم تروا انها تنبت صفراء ملتوية . پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی ((ئەی ئێوە نابینن کە زەردو خوارە))

نەوەوی دەڵێت ، ((ئەوکەسانەی دەخرێنە جۆگەلەی ئاوی ژیان یەکسەر ژیانیان دێتەوە بەر وەك چۆن تۆوی خەرتەلە زۆر زوو دەڕوێت ولەبەر ئەوەی بەخێرایی وبەپەلە دەڕوێت خوارو خێچە وهێشتا هێزی خۆی وەرنەگرتووە لەهەتاوەوە بۆیە زەردە بەڵام زۆری پێ ناچێ هەتا هێزی خۆی پەیدا دەکات وخۆی ڕادەگرێت ، بەهەمان شێوە ئەوکەسانەی کەدەخرێنەناو ئاوی ژیانەوە زۆر زوو وبەپە لە وخێرا ژیانیان دێتەوە بەگیانیان ولاشەیان .

### *(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)*

١) دۆزەخی یەکانبە مەرجێك لەبنەڕتدا باوەڕی هەبێت باکەمیش بیت، جێ ی ئەومیە کە خودای میهرەبانی لەگەڵ بکات رزگاری بکات لە دۆزەخ لەدووای ئەوەی کە چووبێتە دۆزەخیشەوە بەڵام بەهەشتی بەهیچ شێوەیەك نایەتەدەرێ .

٢) خودا پەرستان کەتاوانیان زۆرە وزیاترە و گەورەترە لەچاکەکانیان خودا خاوێنیان دەکاتەوە بەئاگری دۆزەخ بۆئەوەی ئەو ژەنگ وچەپەڵی یەی تاوانیان لەسەر خاوێن بکرێتەوە .

٣) رزگاری دەبێ کەسێك کەتەنانەت باوەڕی بەئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك بێت .

٤) دۆزەخی مردنیان نابێ بەسوتاندن و ئەشکەنجەو ئازاردانیان باهەر چەندە دژواری قورس وگەورەبێت .

٥) بەڵام ئەگەر كەسێك باوەری نەبێ هەرچەندە كردەوەی باش وچاكی هەبێ خودا لێ وەرناگرێ چونكە ئەو چاكانەی بۆ روو پامایی ولەبەرچاوی خەڵكی بەوە هیوای پاداشتی خودای نی یە بۆیەخودایش بەهەمان گومان هەڵسوكەوتی لەگەڵ دەكات .

- بەتەرمی لەسەر خۆیی بەدەستی دێنی ئەوەی كەبەدەستت نەهاتووە بە هەوڵ وتێكوشان.
- -كۆمەكی خۆت بكە بەكارو ووتەی نەرم ونیان ئەگەر نارەحەتی وئاستەنگت هاتە پێش لە وانەوەیە بەنەرم خوازی نارەحەتی وئاستەنگت بۆ ئاسان بێت. ((بەششاری كوڕی بورد)).
- -ووشە نەرم ولەسەرخۆ وەك رۆژێكی نوێت لێ هەڵ بێت لە بەهاردا وایە . ((روسی)).
- - قسەی نەرم ونیان دڵەكان وگرێ بەستەكان دەكاتەوە. ((تاغوور)).
- - بەنەرمی ولە سەرخۆیی بەمەستەكانت دەگەیت. ((الثعالبي))

٢) بەنەرمی ولەسەرخۆیی زۆر شتێك دەكرێت و بە دەست دێت كەبەتووندوتیژی ناتوانرێ بەدەست بیت. ((لافونتین)).

٣) -ئەگەر مرۆڤ نەرم ولەسەرخۆبێت سپی ترو خاوێن تر دەبێ لەبەفری زستان وجوانتریش دەبێ لە گەوهەر ورشتەی مرواری((فرانسیس بایكون)).

**((من قاتل ومن تعلم ومن انفق للرياء والسمعة فماواهم جهنم))**

عن ابي هريرة- رضي الله عنه- قال سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: ان اول يقضى يوم القيامة عليه: رجل استشهد فأتي به معرفه نعمه فعرفها، قال :فما عملت فيها؟ قال :قاتلت فيك حتى استشهدت، قال :كذبت،ولكنك قاتلت لأن يقال: جريء ، فقد قيل :ثم أمربه فسحب على وجهه حتى القي في النار ، ورجل تعلم العلم وعلمه وقرأ القرآن، فأتي به فعرفه نعمه فعرفها ، قال:فيما عملت فيها؟قال : تعلمت العلم وعلمته ، وقرآت فيك لقرآن. قال كذبت ولكنك تعلمت العلم ليقال :عالم ، وقرأت القرآن ليقال هوقارىء ،فقد قيل ، ثم امربهفسحب على وجهه حتى القي في النار ، ورجل وسع الله عليه واعطاه من اضاف المال كله ، فأتي به ، فعرفه نعمه فعرفها، قال فما عملت فيها؟ قال :ماتركت من سبيل تحب ان ينفق فيها الا انفقت فيها لك، قال : كذبت ، و لكنك فعلت ليقال : هوجواد، فقد قيل، ثم امربه فسحب على وجهه ،ثم القي في النار )).

رواه مسلم (١) في صحيحه

---

**(١) اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الامارة –باب : من قاتل لتكون كلمة الله هى العليا ، فهوفي سبيل الله ، برقم :١٥٢- (١٩ ٠٥) واخرجه مسلم عقب الرواية السابقة ((بدون رقم ))واخرجه النسائى في سننه في كتاب الجهاد باب: من قاتل ليقال: فلان جريء : برقم : (٣١٣٧) واخرجه الترمذى في ابواب الزهد –باب :ماجاء في الرياء والسمعة، برقم : ((٢٣٨٢)) .قال المنذري في الترغيب : رواه الترمذي وحسنه، ورواه ابن حبان في صحيحه ، كلا هما بلفظ واحده .وصححه الالباني في سنن النسائي (٢٥- كتاب الجهاد في باب ٢٢- من قاتل ليقال: فلان جريء برقم (٣١٣٧).وصححه الالباني في تصحيحه لسنن الترمذي (٣٤) –الزهد عن رسول (صلى الله عليه وسلم) (٤٣) –باب ماجاء في الرياء والسمعة برقم الحديث (٢٣٨١) .**

**دەروازەی((هەرکەسێ تێکۆشان وجەنگینە کەی وهەر کەسێ فێربوون وفێرکردنەکەی وهەر کەسێ ماڵ وسامانی بەخشینە کەی : ئەمانەمەبەستیان بەرچاوی وگوێ خەڵك لێ بوون بێت جێگەیان دۆزەخە ))**

لەباوکی هورەیرەوە (رەزای خودای لێ بێ ) دەڵێت گوێم لێ بووە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی (ان اول الناس یقضی یوم القیامة علیه رجل استشهد) یەکەم کەسێك کەلەرۆژی قیامەتدا فەرمانی دۆزەخی بۆدەر دەکرێ ئەوکەسەیە کەلەپێناو تێکۆشان وخەبات کردن شەهیدبووە : ((فأتي به فعرفه نعمه فعرفها)) بەهرەکانی خودای کەپێ بەخشی بوو لەدوونیادا دەیهێڵێتەوە یادی ئەویش دەیناسێتەوە ، ((قال :فما عملت فیها؟)) خودای گەورە لێ ی دەپرسێ چیت پێ کردووە؟ ((قال : قاتلت فیك حتی استشهدت)) دەڵێت-ئەی خودایە لەپێناوی تۆدا جەنگیم هەتا شەهیدبووم کوژرام ((قال کذبت، ولکنك قاتلت لان یقال: جريء )) خودای گەورە دەفەرموێت : درۆت کرد ، بەلأم تۆ تێکۆشان وجەنگینەکەت بۆئەوە بوو کەپێت بڵێن لێهاتوو وپاڵەوان ولەخۆ بوردەیە :((فقد قیل)) ئەمەشیان هەرلەدوونیادا پێ ووتی وپاداشتی خۆتت وەرگرتووە (ثم امربه فسحب علی وجهه حتی القي في النار )) لەپاشان فەرمانی پێ دەدرێ کەببرێت و رادەکێشرێ لە سەر روو چاوانی هەتا فڕە دەدرێتە ئاگری دۆزەخ . ((ورجل تعلم وعلمه وقرآ القرآن)) کەسێکی تر کەفێرزانستەکان بووە و خەڵکیشی لێ فێر کردووە ، چاك وباش قورئانیشی دەخوێند((فأتی به فعرفه نعمه فعرفها)) دەهێنرێت بەهرەکانی خودای پێ دەناسرێنێتەوە کەخودای گەورە پێ ی بەخشی بوو ئەویش بەهرەکان دەناسێتەوە ،((قال : فماعملت فیها؟ )) ئەی چیت پێ کرد؟ (قال :تعلمت العلم وعلمه وقرآن فیك القرآن) دەڵێت خۆم فێر زانستەکان بووم و خەڵکانیشم فێرد ، قورئانیشم لەپێناوتۆدا خوێندەوە (قال: کذبت ولکنك تعلمت العلم لیقال: عالم ، وقرات القرآنه لیقال هو قارئ) خودای گەورە دەفەرموێت :درۆت کرد تۆفێر زانست بووی بۆ ئەوەی بڵێن زانایە .

قورئانیشت خوێند بۆئەوەی بڵێن دەنگ خۆش وقورئان خوێنە ((فقد قیل )) ئەمانەت

هەمووپێ ووترا هەرلەدوونیادا ((ثم امربه)) لەپاشاندا فەرمانی پێ دەدرێ ((فحسب على وجهه)) لەسەر رووی ڕادەكێشرێ : (حتى القى في النار)) هەتافڕە دەدرێتەناو ئاگری دۆزەخەوە ((ورجل وسع الله عليه)) كەسێكی تر خودای گەورە فەرمانی پێدراوە ((واعطاه من اصناف المال كله)) لەهەموو جۆرە بابەتێكی ماڵ وسامانی پێ بەخشیوە ((فأتي به)) دەهێنرێت ((فعرفه نعمه فعرفها)) خودای گەورە بەهرەكانی خۆی لەسەری كە لەدونیادا پێ ی بەخشی بوو دەهێنێتەوە یادیو پێ ئاشناو دەناسێنێتەوە ئەویش هەموبەهرەكان دەناسێتەوە ((قال فما عملت فيها؟ )) خودای گەورە دەفەرمووێت ئەی چیت لێ كردن وچۆن خەرجت كردن ؟ ((قال: ماتركت من سبيل تحب ان ينفق فيها الا انفقت فيها لك)) دەڵێت ئەی خودایە هیچ ڕێگەیەكم بەجێ نەهێشتبووكە تۆحەزبكەیت وفەرمانت پێ دابێ لەخێرو چاكەی لێ بكرێت من خێری خۆمم تیادا كردووە پارەو سامانم لەپێناو تۆدا خەرج ودابەش كرد: قال :كذبت )) خودای گەورە دەفەرمووێت درۆدەكەیت : ولكنك فعلت ليقال : هو جواد)) تۆبۆیە ئەم هەمووشتانەت دەكرد بۆئەوەی پێت بڵێن: ئەو سەخی ودڵ فراوانە ودەستی لەموو خێرێكدا هەیە : ((فقدقيل )) ئەمانەش هەمووی بەتۆ ووتراوە لەدوونیا ئەوانە بوونەتە پاداشت بۆت لەدوونیادا بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژی دواییە ((ثم امربه)) لەپاشاندا فەرمانی پێ دەدرێت ((فسحب على وجهه)) ڕادەكێشرێ لەسەر روو ودەم وچاوی (ثم القي في النار)) لەپاشاندا فڕە دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ .

**((ووتە ی ناودارانی ئیسلام دەربارەی تایبەتی نەكردنی هەموو جۆرەكانی پەرستن بۆخودا (پەرستنی دڵان ، پەرستنی رووكەش لەووتەو كارو ئەوەش كەلەناو دڵدایە هەرئەبێ بۆخودا بێ)) .**

**یەكەم** :-خاوەنی پەرتووكی ((حياه القلوب دەڵێت بزانە(( رياء)) كردن بۆبەرچاوی وگوێ لێ بوونی خەڵكی :بریتی یە لەوەی كە مرۆڤ هەوڵ ئەوە بدات لەناو خەڵكیدا پلە وپایەی هەبێت ئەویش بەجوانكاری كردن وڕێكوپێكردنی پەرستنەكان یان هەر كردەوەیەكی تر.

ئەمەش گەورەترین نەخۆشی یە بۆگەن و رزیوی یە بۆ دلآن و هەر كردەوەیەك كە دلی بێت لەكاتێكا ئەم كارانە لەپەرستنەكاندا گاڵتە كردن بەخودای گەورە (١)

**دووەم** :-لەلێكدانەوە پەرتووكی ((الاشباە)) ی حەمەویدا ) هاتووە كەپێناسەی تایبەتی كردنی كارەكانی لەووتەو كردارەكانی لەهەموو جۆرە پەرستنەكان كە دەڵێت :الاخلاص)) تایبەتی كردن وتایبەت بوونی پەرستنەكان نهێنی یە لەنێوان تۆو پەروەردگارت ، هیچ فریشتە لەفریشتەكان دەركی پێ نابات وناكات لەهیچ كات وشوێنێكدا ، نەشەیتانی نەفرین لێ كراو توانایی ئەوەی هەیە كەلێت پووچەڵ كاتەوە. لێت بشێوێنێ نەهیچ ئارەزۆ بازیەكی دەروونی و جەستەیی و دوونیادا یەكەفەرمانت پێ بكات ولات جوان ورازاوەی كاتەوە.

**سێ یەم** :- هەندێك خوداناسان پێناسەی باوەرداری دڵسۆزو تایبەتی كار بۆ خودای گەورە بەو دەكەن كە ئەو كەسەیە كە حەز نەكات گوێ بیست سوپاسی كەس وپیاهەڵدانی خەڵكی هەبێت بۆ هەرشتێكی كەئەنجام دەدات

**چوارەم** :- ئیمامی غەزالی لەپەرتووكی ((الاحیاء)) دا دەڵێت :-بزانە ((ریاء)) كردن حەرام وقەدەغەیە ئەوكەسەی كە مەبەستی خەڵكی بێت لەكردارو كردەوەكانی بێزراوە وخودای گەورەی خۆشی پێ نایەت ، بەڵگەش زۆر لەقورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شوێنەوارو هاوەڵآن وشوێن كەوتوانی زانایانی ئیسلام

---

١) گاڵتەكردنیش بەخودای گەورە گەورەترین تاوانەو لێ خۆشبوونی نی یە گەورەترین هۆكاری بێ باوەری یە لەهەمان كاتدا گاڵتەكردنە بەخۆی چونكە لەبنەرەتدا كارەكەی بۆخودایە بەڵآم چاوەروانی سوپاس وپێزانینی خەڵكیە: { قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا }[١٠٣] { الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا }[١٠٤] سورة الكهف)واتە: ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) تۆبەخەڵكی بڵێ : ئایاپێتان بڵێم رەنجەرۆو زەرەر مەندە هەرلەدوونیا ئەوكەسانەی لەكردەوە دەكەن پووچەڵەو ئەوان بە باشی وچاكی دەزانن بەش بەحاڵی خۆیان)

بەڵگەلەقورئانی پیرۆز دا خودای گەورە دەفەرموویت: ((فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ (٥) الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ (٦) وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ (٧) (٧) الماعون: ٤-٧) .

ب:-بەڵگەلەم فەرموودەدا اخوف ماخاف عليكم الشرك الخفى قالوا وما الشرك الخفى يارسول الله ؟(قال الرياء)

ج-بەڵگەلەشوێنەواردا بەم شێوەی خوارەوە

يەكەم:- دەگێرنەوە كەعومەری كوڕی خەتتاب رەزای خودای لێ بێ چاوی لەكابرايەك دەبێت گەردنی دەجوڵێنێ ((وەك ئەوەی بڵێت بەخەڵكی ئەولەخودا ترسە)) بۆيە عومەری رەزای خودای لێ بێ فەرمووی ((ئەی خاوەن گەردەنەكە ، گەردنت بەرز بكەرەوە لەخودا ترسين لەگەردەنەكاندا نی يە بەڵكو لەخەداترسين لەناودڵەكانداية .

دووەم :- ئيمامی عەلی رەزای خودای لێ بێ دەفەرموويت ئەوكەسەی كەبۆ بەرچاوی خەڵكی پەرستن وكاری چاك ئەنجام دەدات سێ نيشانەی هەيە بۆناسينەوەی :

نيشانەی يەكەم : تەمەڵە بۆپەرستنەكان كاتێ خۆی تەنها بێت .

نيشانەی دووەم : ئەگەرلەناوخەڵكی بوو لەش ولاری سووكە بۆپەرستنەكان لەبەرچاولێكەری خەڵكانی تر .

نيشانەی سێ يەم ئەگەر باسی بكرێت بەباشی ئەوا دڵی بەخۆی خۆش دەبێ كردەوە زياتر دەكات ، بەڵام ئەگەر بێتوو خەڵك سەرزەنشتی بكەن ئەوا ئەو واز لەپەرستنە كانيش دەهێنێ .

پێناسەی پێنجەم :- هەندێ لە زاناو دانا موسوڵمان دەڵێن(قال الرياء) بريتی يە لەوەی لەمرۆڤ پەرستنە رۆتينەكان وازلێ بهێنێ لەترسی ئەوەی خەڵك بڵێن بۆلەبەرچاوی خەڵكی كاری ئەنجام داوە. بەڵام ئەگەر كارێكی بۆ لەبەر خەڵكی كردن بێت ئەوەی خۆی بەخۆی هاوەڵ پەيدا كردنە .

**(گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی *کە لەم فەرمووده پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*)**

١) ئەوەی خۆی بەشان وبالّی خۆی بلّێت حەزبکات خەلّك باسی بکەن لەسەر ئەنجام دانی چاکەکانی ئەوە خۆی بەخۆی پاداشتێکە بەلاّم دوونیایی یە و لەدووارۆژدا هیچ سودێکی پێ ناگات بەلّکو کردەوەکانی هەموو پووچەلّ دەبێتەوە .

٢)گەورەترین کارکردن خۆبەخت کردنە لەگەلّ ئەوەشدا بەس خودا خۆی دەزانێ کێ مەبەستی خودایەو ئایین ودوا ڕۆژە .

٣)ئەوەی خۆی دەدات بەکوشتن ئەگەر تایبەت نەبێ بۆخودا ئەوا لەکیس خۆی جووە لەدوونیادا لەدوارۆژیش هەر ڕەنجەڕۆ دەبێ .

٤)یەکەم کەسانێك کەفەرمانی بۆ دۆزەخ ناردنیان دەدرێت لەناو ئەو هەموو جۆرە تاوانە خەلّکانە(تێکۆشەر،زانا،سەخی یە) .

٥)قورئان خوێن پسپۆڕ لەئایینی ئیسلام دا ئەبێ تەنها مەبەستی خودا بێ هیچ مەبەستێکی تری دوونیایی تیادا جێگە نەبێتەوە بەلّکو وەك ئەرکێکی پیرۆز کرێکار ئەنجام بدات .

٦) هەمووخۆشی وبەهرەکانت پێ ئاشنا دەکرێتەوە وەك چاکەیەکی خودایی لەسەرت .

٧)ئەو چاکانە ئەگەر بۆخودا بەکارنەهێنرا ئەوا دەبێت نەفرین وتۆلّەی زیاد دەبێت.

٨)دەولّەمەند ئەبێت زۆر نهێنی بێت بەتایبەت لەکردنی چاکەو پاداش دابێجگە لەزەکات دان چونکە باشتروایە ئاشکرابێ بۆئەوەی خەلّکیش چاوی لێ بکەن .

٩)تەنانەت ئەومیش کەمزگەوتێك دەکات خودا خۆی دەزانێ نیازی دلّی چۆنە ولەسەر ئەو نیازە پاداشت وەردەگرێت بەخراپ یان بەچاك .

١٠)ئەگەر هەرمەبەستێکی هەبێ لەوخێرو چاکەکردنە ئەوا خودا لێی وەرناگرێ ئەگەر تایبەت نەبێ بەکردەوەکانی .

١١)ئەمانە هەرسێکیان فەرمانی دادگای دادپەروەری خودای گەورە فەرمان دەدات کەفڕە بدرێتە ناو دۆزەخ .

١٢)خودای گەورە لەپێش چاوی ئەو هەمووە بوونەوەرە پێیان دەفەرمووێت درۆتان کرد لەبەرمن خۆتان بەکوشت نەداوە نە لەبەرمن فێربوون وفێرکردن و قورئان وخوێن نەلەبەر منیش خێرو چاکەتان کرد .

١٣)ڕەنجەڕۆترین کەسان ئەم سێ جۆرەن چونکە جێ ی ئەوە بوو پاداشت وەرگرن بەڵام لەبەر ڕیایی دۆزەخیان وەرگرت.

١. هەرکەس چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی بچێنێت دەدروێتەوە خۆشەوستی بەردەوام بۆ خۆی لەوانەوە .﴿ ئەحمەد کەیوانی ﴾

٢. چاکە لەگەڵ خەڵکی بکەن دڵیان بۆخۆت دەکێشی ، زۆر جار وابووە مرۆڤ بە چاکە کردن لەگەڵ دڵی ڕاکێشراوە بۆ لای چاکە کاردا . ﴿ باوکی فەتحی بوستی ﴾

٣. چاکە کردن بچێنە با لە جێگەی خۆیشی نەبێ چاکە چاندن وون نابێ لە هەر کوێ بچێنرێ . ﴿ ئەحمەدی هاشمی ﴾

٤. ئەگەر گەورەیت دەوێ ئەوا پێویستە چاکە کار بیت دادپەروەر بیت . ﴿ کوڕی وەردی ﴾

٥. جوانترین ڕوو لە بوونەوەردا ڕووی چاکەکارە ڕاسترین دەستیش دەستی بەخشینە .

﴿ موتەنەبی ﴾

١٨) چاکە کردن بەرزترین کارە کە مرۆڤ هەڵی گرێت ، سووپاس کردنیشی باشترین شتە کە بە دەست دەدرێت . ﴿ ئیسحاق موسللی ﴾

١٩) ئەگەر شنەبات هەڵ بوو بوو ئەوا بیقۆزەوە ، چونکە بۆ هەموو هەڵبوونێك ڕاوەستانێك هەیە ، بێ ئاگا نەبی لە چاکە کردنت ، چونکە نازانی کەی ڕادەوەستی ئەو بایە .

﴿ ............ ﴾

**((الشفاعة العظمى لسيد ولد آدم محمد (صلى الله عليه وسلم))**

عن انس بن مالك - رضى الله عنه -قال:
قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) : ((يجمع الله الناس يوم القيامة فيقولون :لواستشفعنا على ربنا، حتى يريحنا من مكاننا.
فياءتون (آدم) (صلى الله عليه وسلم) فيقولون : انت الذي خلق الله بيده ونفخ فيك من روحه ، وأمر الملائكة فسجدوا لك ؛
فاشفع لناعند ربنا، فيقول: لست هناكم ، ويذكرخطيئته، ويقول: ائتوا (نوحاً) ،اول رسول بعثه الله .
فيأتونه، فيقول: لست هناكم ويذكرخطيئته، أئتوا ابراهيم الذى اتخذالله خليلاً، فيأتونه ،فيقول: لست هناكم ، ويذكر خطيئته،
أئتوا(موسى) الذي كلمه الله ،فيأتونه ،فيقول لست هناكم ، فيذكر خطيئته ائتوا(عيسى). فيأتونه، فيقول: لست هناكم ،هناكم،
ائتوا (محمد): (صلى الله عليه وسلم) فقد غفرله ماتقدم من ذنبه وما تاخر. فيأتوني، فأستأذن على ربي ،فاذا رأيته وقعت له ساجداً، فيد عنى ماشاءالله .
ثم يقال لى: ارفع رأسك وسل تعطه وقل يسمع ،واشفع ،فارفع رأسي،فأحمد بتحميد يعلمنى ، ثم اشفع فيحد لى حداً ،ثم أخرجهم من النار .
وادخلهم الجنة،ثم أعود، فاقع ساجداً مثله في الثالثة ، والرابعة،حتى مابقي في النار الامن حبسه القرآن)).

قال ابو عبدالله البخارى -رحمه الله:- وكان قتادة يقول عند هذا: اى وجب عليه االخلود)) ا.هـ رواه الامام البخاري (١)في صحيحه.

---

١)أخرجه البخاري في كتاب الرقاق-باب صفة الجنة والنار. وأخرجه البخاري ايضاًفي كتاب احاديث الانبياء-باب: قول الله عزوجل : ((ولقد ارسلنا نوحاً الى قومه)) .واخرجه البخاري ايضاًفي كتاب التفسير سورة البقرة باب قولله تعالى: ((وعلم آدم الاسماء كلها)).واخرجه البخاري ايضاً في كتاب الرقاق -باب :الصراط جسر جهنم. واخرجه البخاري ايضافي كتاب التوحيد-باب :قول الله تعالى ((لما خلقت بيدى)) واخرجه البخارى ايضاًفي كتاب التوحيد-باب : قول الله تعالي : ((وجوه يومئ ذناضره الى ربها ناضرة)). وقد اخرجه البخاري ايضاًفي كتاب التوحيد-باب كلام الرب عزوجل يوم القيامة مع الانبياء وغيرهم. وقداخرجه البخاري ايضاً في كتاب العلم-باب الحرص على الحديث برقم .٢٩٩ .هذا.وقداخرجه مسلم في كتاب الايمان :باب: ادني اهل الجنة منزلة فيها برقم (١٩٤) .وقد اخرجه مسلم في كتاب الفضائل -باب من فضائل موسى (صلى الله عليه وسلم) (١٥٩-(٢٣٧٣) . وقد اخرجه مسلم ايضاً في كتاب الايمان -باب :معرفة طريق الرؤية، برقم : ٢٩٩-(١٨٢) .واخرجه مسلم في كتاب الساجد ومواضع الصلاة-باب فضل صلاتي السجع والعصر والمافظه عليها برقم (٢١١(٦٣٣). وقد اخرجه مسلم في كتاب الايمان -باب اثبات اشفاعة واخرجروج الموحدين من النار برقم : (٣٠٤). واخرجه مسلم ايضاً في كتاب الايمان -باب آخراهل النار خرو جابرقم (٣٠٨). واخرجه مسلم في كتاب التوحيد -باب في الحض على التوبة والفرح بها برقم (٧(٢٧٤٧). وقد اخرجه الترمذي في ابواب ضفه القيامة-باب :ماجاء في الشفاعة برقم : (٢٤٣٤) وقداخرجه النسائى في كتاب التفسير -سورة الاسراء-باب :قوله تعالى : ((ذرية من حملنا مع نوح اله كان عبداً شكوراً)) برقم (١١٢٨٦). واخرجه ابن ماجه في المقدمة -باب الايمان برقم (٦٠) واخرجه ابوداود واحمد ايضاً .

**(تکا کاری و داواکاریە گەورەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەسەردار وسەروەری هەموو نەوەی ئادەمە).**

لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رەزای خودای لێ بێ) دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی (یجمع الله الناس یوم القیامة) خودای گەورە هەمووخەڵکی کۆدەکاتەوە لەرۆژی هەستانەوەی بوونەوەر ئەورۆژەی کەهەمووخەڵك لەیەك دەشتایی وگۆرەپانا کۆ دەکرێنەوە ،هەرکەس هاوار بکات گوێیان لێ دەبێ و چاو هەموویان دەبینێ رۆژنزیك دەبێتەوە لەسەر سەریان هەتا زۆرگەرمایی وتینیان بۆدێ ((فیقولون: لواستشفعنا علی ربنا)) ئالەورۆژەدا داوای تکاکارێك دەکەن بەووشەی ((لو)) کەبۆ خۆزگەبەکاردێت وبۆداواکردن دێت ،وەڵامەکەشی ئەومیە بۆئەوەی داوابکات خودا لەم ناخۆشیانە دەرمان بهێنێ وەك دەفەرموێت ((حتی یریحنا من مکاننا)) هەتا بۆئەوەی رزگارمان کات لەم جێگەوشوێنە نارەحەت وناخۆشە . ئەمەش خۆی بەخۆی داوایەکی راشکاوانەیە بۆتکاکردن بۆدادوەری کردنی خەلکی ورزگاربوونیان لەوەستانە دوور ودرێژە . ((فیأتون آدم)) جابۆئەم مەبەستە روولەباوکمان ئادەم دەکەن ((فیقولون: انت الذي خلقك الله بیده))پێ ی دەڵێن : تۆئەوکەسەی کەخودای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردی بەبێ هیچ هۆکارێك و پەردەیەك ((ونفخ فیك من روحه)) هەرلەرۆحی خۆی فووی بەگیانی تۆدا کردوو روحت هاتە بەر ئەمەش بەبێ نێوان وپەردەیەك بێجگە لەخەڵکی تر کەبەهۆی فریشتەوە رۆحی بەبەردا دێت . ((وامر الملائکة فسجدوا لك)) لەمانەش هەمووی زیاتر خودا فەرمانی بەفریشتەکان کرد کە کوڕنوش بۆتۆ بەرن ئەمەش ئەوپەڕی گەورەیی ورێزی تۆ دیار دەکات لەلای خودای گەورە ((فاشفع لناعند ربنا ، فیقول: لست هناکم) کەواتە تکامان بۆبکە بۆلای خودامان ؟ ئەویش دەفەرموێت من خاوەن گەورەیی نیم لێرەدا کەبتوانم تکا کارم بم تکاکردن لەلای خودای گەورە بکەم لەم رۆژەدا. هۆکارەکەشی ((ویذکر خطیئته)) ئەو گوناهەباس دەکات کەفەرمانی خودای شکاند لەکاتی خواردنی دارەکە :ئەمەش وەك بێ فیزی خۆی دەردەبڕی ئەوەی خەڵك

وازی لێ بهێنن لەداواکردن بۆ تکاکاری ((ائتوا نوحاًاول رسول بعثه الله)) بڕۆن بۆلای (نووح) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ((چونکە ئەو یەکەم پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم) لەدوای دروست بوونی هاوەڵ پەیدا کردن لەناو(نەوە)ی ئادەم دا یان یەکەم پێغەمبەرە لەدوای بوژاندنەوەی مرۆڤ لەسەر رووی زەوی بۆ جاری دووەم )) .

((فیأتوته، فیقول :لست هناکم )) دەچنە لای نووح پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەویش دەڵێت من بۆئەم رۆژەنیم (ویذکر خطیئة)) باسی هەڵەکەی خۆی دەکات وەك بیانوویەك هێنانەوە بۆپاساوکردن لەوەی کەناتوانێ کەتکا کاربێ لەلای خودای گەورە بۆ تکاکردن لەرزگاربوونیان لەم رۆژەدا ((هەڵەی نووحیش ئەوەبوو کەداوای کرد خودا کوڕە بێ بڕواکەی رزگاربکات لەنوقوم بوون وەك دەفەرموێت : (({٤٤ {وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ }٤٥{)) سورة هودالایة ١١٠.

((ائتوا ابراهیم الذي اتخذه الله خلیلاً)) بڕۆن بۆلای ابراهیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم))ئەوکەسەیە کەخودا بە ئەوپەڕی خۆشەویستی خۆی هەڵی بژاردووە((فیأتونه)) دەچن بۆلای ئیبرهیم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

(فیقول: ((لست هناکم )) ئەویش دەفەرمووێت من بۆئەم رۆژەنیم کەبتوانم تکاکاریم ((ویذکر خطیئته)) هەڵەی خۆی بەبیانوودەهێنێتەوە

((کەهەندێ ریوایەت دەڵێن (سێ درۆم کردووە (١)

( اتوا موسی ،الذی کلمه الله)) بڕۆن بۆلای (موسی) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ، فیقول :لست هناکم )) من بۆ ئێرەنیم وباس لە گوناهەکەی دەکات کاتێ بەهەڵە (فیبتی

---

(١) ئەمانەبەس بەناودرۆیە چونکە ئەم جۆرە درۆیانە بۆخزمەت کردنی مرۆڤایەتی بووبۆنەوەی بێنەوە سەر هۆشی خۆیان :چونکە پێغەمبەران سلامی خودایان لێ بێ درۆکارنین : یەکەمیان: ووتم نەخۆشم. دووەمیان: ووتم گەورەی بتەکان رووخاندوونی . سێ یەم: بەخێزانەکەی خۆی ووت خوشکە مەبەست پێ ی خوشکی ئاینی یە لەگەڵ ئەمانەش هەموو خودای گەورە هیچ سەرزەنشتی لەسەر ئەمانە بۆنەکرد واش پێغەمبەر ابراهیم (صلی الله علیه وسلم) لەخۆی دەترسێ دەفەرمووێت من بۆ ئەم رۆژەنیم .

یەکی) (القبطي) کوشت ((ائتوا (عیسی) بڕۆن بۆلای ((ائتوا (عیسی) بۆن بۆلای (عیسی) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ،((فیأتونه دەڕۆن بۆلای (عیسی) (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت باسی هیچ تاوانێکی خۆی نەکرد لەبوخاریدایە. ((ائتوا محمد (صلی الله علیه وسلم) فقد غفر له ما تقدم من ذنبه وماتأخر )) بڕۆن بۆلای ((محمد)) (صلی الله علیه وسلم) خودا لەگوناهی پێش پێغەمبەرایەتیشی (صلی الله علیه وسلم) خۆش بووه ، فیقول :لست هناكم )) من بۆ ئێرمنیم وباس له گوناهەکەی (دەکات کاتێ بەهەڵە ((قیبتییەکی ((القبطي))کوشت ((ائتوا (عیسی) بڕۆن بۆلای ((ائتوا (عیسی) بۆن بۆلای (عیسی) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ((فیأتونه دەڕۆن بۆلای (عیسی) (صلی الله علیه وسلم) (دەفەرموێت باسی هیچ تاوانێکی خۆی نەکرد لە(بوخاریدایە) ((ائتوا محمد (صلی الله علیه وسلم) فقد غفرله ما تقدم من ذنبه وماتأخر )) بڕۆن بۆلای محمد الله علیه وسلم) خودا له لەگوناهیپێش پێغەمبەرایەتیش لەباش پێغەمبەرایەتیشی خۆش بووه(١) ئەوەندەی خودا خۆی حەزبکات من بەوشێوەیە سەر لەسەرزەوی دابمێنێمەوە ((ثم يقال لي )) لەپاشاندا پێم دەڵێن ((ارفع رأسك )) سەرت بەرزبکەوە و((سل تعطه)) داوابکە پێت دەبەخشرێ و((وقل يسمع)) بڵێ دەبیسرێ و((واشفع تشفع)) تکا بکە تکاکردنەکەت پەسەندەو وەردەگیرێ ((فارفع راسی)) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت ((ئینجا سەر لەسەر زەوی بەرزدەکەمەوە) .((فأحمد ربی بتحميد يعلمنی)) دەست بەسوپاس پێزانینێك دەکەم کەخودا خۆی فێرم دەکات ((ثم اشفع)) لەپاشاندا تکاکاری دەکەم خەڵك رزگاری ببێ ودادوەری خۆی بەجێ بهێنێ تابەم شێوە هەر تکا کاردەبێ خودا تکای لێ وەردەگرێ هەتا خودای گەورە ((فیحدلی حدا)) سنوور تکاکاری دەکەم خەڵك رزگاری ببێ ودادوەری خۆی بەجێ بهێنێ تابەم شێوە هەر تکا کاردەبێ

((فیأتونی)) پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت خەڵکان روو لەمن دەکەن دێن بۆلام ((فأستأذن ربي)) داوا دەکەم لەخودام کەئەم پلەو پایەیە بە(من) بدات لەم جێگەدا ((فاذا رأيته وقعت له ساجدا)) کاتێك خودام دەبینم یەکسەر سەرم لەزەوی دادەنێم بۆخودام ((فیدعني ماشاء الله))تابەوشێوەیە سەر لەسەر زەویدا دەمهێڵێتەوە

خودا تكای لێ وەردەگرێ هەتا خودای گەورە ((فيحد لي حدا)) سنوور بۆتكاكانم دادەنێت ((ثم اخرجهم من النار)) لەپاشاندا تكادەكەم باوەڕداران ئەگەر بۆتكاكانم دادەنێت ((ثم اخرجهم من النار)) لەپاشاندا تكادەكەم باوەڕداران

١)ئەمەلە كاتێكایە كە هەمووپێغەمبەران پارێزراوون المعصومون بەڵام هەرشەرەف مەندایەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆدەردەخات.

ئەگەر لەدۆزەخ بن بهێنرێنە دەرێ .

((وادخلهم الجنة)) بیانخە مە بەهەشت بەتكاكانم ((فاقع ساجداً مثله)) بەهەمان شێوە جارێكی تر سەر لەزەوی دادەنێم ((حتى مابقي في النار الامن حبسه القرآن))هەتا كەس لەخودا پەرستان لەدۆزەخ نامێننەوە تەنها كەسانێك نەبێت كەقورئان بەندی كردوون واتە ئەوكەسانەی بەدەقی قورئان دەفەرمووێت دەربارەیان هەتاهەتایی لەدۆزەخ دەمێننەوە( ١) .

## (گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی *كە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*)

١. گەورەیی خودای گەورە ودەسەڵاتی ئەو دەردەخات كەدەتوانێ لەپاش زیندووكردنەوەی هەموو بوونەوەر لەئادەمەوە هەتا دواین مرۆڤ زیندووبكاتەوە لەیەك جێگەو شوێن دا هەموویان كۆبكاتەوە .
٢. خەڵك زۆر دەكەونە ناخۆشی بەبەهەشتی وبە دۆزەخیشییەوە هەتا هەموو ڕێك دەكەون لەسەرئەوەی داوابكرێ لەخودا دادوەری خۆی دەست پێ بكات پەسەندكردنی ئەنجامە كانیش بین .
٣. بەبۆچوونی خەڵكی ئادەم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەپێش هەمووكەسێكەوە بۆئەم تكاكردنە .ئادەمیش وەك هەرهەمووپێغەمبەرانی تر

---

١)لەوانە( (هاوەڵ پەیداكار بۆ خودای گەورە :دوو ڕووەكان :بێ بڕواكان ). لەخاڵی (١٧) دا بەدرێژی باسیان لێوە دەكەین.

پاساوی ئەوە دەهێنێتەوە کەناتوانێ ئەم تکا کردنە لەئەستۆ بگرێت .

٤. بەبۆچوونی خەڵکی ئادەم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپێش هەمووکەسێکەوە بۆئەم تکاکردنە .

ئادەمیش وەك هەرهەمووپێغەمبەرانی تر پاساوی ئەوە دەهێنێتەوە کەناتوانێ ئەم تکا کردنە لەئەستۆ بگرێت .

٥. چونکە ئەو خۆی سەرقاڵی هەڵەکەی خۆیەتی کاتێ فەرمانی خودای گەورەی شکاندو لەدارەکەی خوارد .

٦. بەهەمان شێوە سەرجەم پێغەمبەران کە خەڵکان دەچن بۆلایان هەمان پاساوی (کە هەڵەخۆیان لەبیرە دەهێننوە).

٧. بۆ خۆیان دەڵێن ئێمە بۆ ئێرە تکامان پێ نەدراوە.

٨. تەنها پێغەمبەر(عیسی) نەبێت (صلی الله علیه وسلم) کەبە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خۆمان (صلی الله علیه وسلم) هیچ تاوانێك باس ناکات بەلآم لەهەمان کاتدا دەفەرموێت ئەم جێگە بۆمن نی یە تکای تیادا بکەم بۆیە خەڵکان دەنێرێ بۆلای ((محمد)) (صلی الله علیه وسلم) .

٩. پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەدەنگ خەڵکی یەوە دێت چونکە تەواوی پێغەمبەران یەك لەدوای یەك خەڵکانیان بەرێکرد بۆخزمەت (محمد) (صلی الله علیه وسلم) و ئەویش سۆزی خودای وەرگرتووە لە((مقاما محمو دا)) بۆیە داوای لەخودای گەورە دەکات کەبەدیداری خودای خۆی شادو کامەران بێت.

١٠. بەبینینی خودای خۆی یەکسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کڕنووش دەبات بۆ پەروەردگارتەنها خودا خۆی دەزانێ چەندە لەو کڕنوش بردنەدا دەمێنێتەوە بۆخودا هەتا خودای گەورە خۆی فەرمانی پێ دەدات سەربەرزبکاتەوە .

١١. میهرەبانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆئەوخەڵکانە هەمووی دەیار دەبێت چونکە کوڕنوش بردن وداواکردنەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەتێکڕا بۆرەگەزو ئایینەکان وبێ ئایینەکانیشە کەبەس خودا کەرەم بفەرموێت بەدادگایی کردنیان ئەمەش راستی ئەوئایەتەیە کەخودای گەورە دەفەرموێت : (([١٠٦ {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ{107} ))سورة الانبیاء الایة (١٠٧).

١٢. بەبێ هیچ جیاوازێك هەمووت هەر خێر وبێرە بۆگشت بوونەوەر. راستی ئەوئایەتە ش کەخودای گەورە دەفەرموێت: (([١٥٧ {قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا)) سوره الاعراف الایه ١٥٧من پێغەمبەر )(صلی الله علیه وسلم) بۆهەموو خەڵکی .

١٣. لەپاشاندا خودای گەورە پەیمانەکانی خۆی بەجێ دەهێنێ وبە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت داواکاریت وتکاکاریت پەسەندە هەرچیش بڵێت هەر پەسەندە.

١٤. جارێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەست دەکات بەسوپاس وپێزانینی خودای گەورە بەشێوەیەك خودای گەورە خۆی فێر ئەو جۆرە سوپاس کردنەی دەکات هیچ کەس لەوەوپێش ولەوەوپاشیش سوپاس پێزانین وگەورەیی خودا دەربڕینی بەوشێوەیە نەکردووەو ناکات تەنها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبێ لەوساتەدا.

١٥. هەنگاوبەهەنگاو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سوپاس وپێزانینی خۆی بۆ خودای گەورە دەردەبڕێ وەك چۆن لەدونیادا لەپاش ئەوەی کە خودای گەورە ئایەتی: (([١ {لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ))سورةالفتح کوڕنوش دەبردووبەپێوە رادەوەستاو هەتایێ پەکانی دەئاوساو دەپەما خێزانی

خۆشەویستی لێ ی پرسی ئەی خودای گەورە نافەرموێت لێت خۆش بووم پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەلامی دایەوەو فەرمووی ئەی نەبم بەکەسێکی سوپاس بژێری؛ ئەمەش ئەوراستی یەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ((سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ [١))الاسراء ناوی بەندایەتی بۆبەکار دەهێنێ بەڵێ تەنها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زانیویەتی ودەزانێت چۆن خودا دەپەرستێت .

١٦. پاش ئەوەی کەخەڵك رزگاری دەبێت لەوناوخۆشی یانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرداوا دەکات بۆئەوەی پلەی بەهەشی یەکات بەرزتربێتەوە خودای گەورە لێ ی وەردەگرێ .

١٧. دەپارێتەوەو بۆئەوەی خەڵکانێك بەهۆی تاوانەوە دەچنە دۆزەخ خودای گەورە لێیان خۆش ببێ خودا لێان خۆش دەبێ.

١٨. لەهەموودیمەنێك لەدیمەنەکانی رۆژی دوایی کاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر تکاکردن و پاڕانەوەیە بۆنەتەوەکەی ئەمەش ئەو راستی یەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ((النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ))الاحزاب پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەسۆزترە بەباوەڕداران لەدەرونی خۆیان بەخۆیان یان دەفەرموێت :((حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ [١٢٨ {ف)).واتە میهرەبان وسۆزە بەباوەڕداران ئەم دووسیفەتە گەورە بۆهیچ پێغەمبەرێك (صلى الله عليه وسلم) نەهاتووە تەنها بۆ(محمد) (صلى الله عليه وسلم) نەبێت ، بێ لەپێش تریش دووسیفەتی گەورە وبەرزی خودای گەورەیە .

١٩. کەسانێك خودای گەورە لەقورئاندا ئامازەی پێ کردوون کەئەوان دۆزەخین هەتا هەتایی دەمێنیتەوە تکای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوان نالگرێتەوە :-

أ) کافروبێ بڕوابەخودا رۆژی دوایی بەلام تەنها مافی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاگری لەسەر سووك دەبێت.

ب) موشریك وهاوەڵ پەیداكار بۆخودای گەورە

ت) مونافیق ودووروو.

پ) كەسانێك گاڵتە بەئایینی راستەقینە بكەن (بەخودا بەدوارۆژ بەقرئان بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ....

ج)

بەهەرسونەتێك كەفەرموودەی راستی لەسەر بێت ئەویش بزانێت فەرمودە كەراستە دەگاتەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

- بەنـــــەرمی ولەســــــەرخۆیی هـــــەموو دەرگـــــا كێڵـــــۆن كراوەكـــــان دەكرێتەوە((ئینگلیزی)).
- ئـــەو دەســـتەی نـــەرم وبەنـــەرمی كاردەكـــات دەتوانێـــت (فیـــل) راكێـــشێ بەگوریسێكی پێك هاتوو لە چەند تەڵەموو دەزوویەك.((فارسی)).
- - بـەهێزو تونـد وتـۆلی داری خـەیزەران لـەوەدا دروسـت دەبـێ كـە نەرمـە وتوانـای درێـژ بـوون وراكێـشانی هەیـە((چـینی)).١٨- ووشـك ورەق مەبـە دەشـكێیت، نـەزیاد نەرمـە بكوشـرێ وئـاوت لـێ بـبڕێ((جـبران خلیـل جبران)).
- - زۆر ووتەیـەك هەیـە رەق وتوونـدترە لەبـەرد وتیـژ تـرە بـۆ كـونكردن لەسـەری دەرزی، گـەرم تریـشە لـە پـشكۆ ژیلـەمۆی ئـاگر، دڵـەكانیش وەك كێڵگـەكانن تـۆیش ووشـەی چـاك وباشـی تیـادا بڕوێنـە، ئەگـەر هـەمووی نەڕوێت هەندێكی هەر دەڕوێت.((لوقمانی حكیم)).

## ((أدنى أهل الجنة منزلة))

عن عبدالله بن مسعود- رضي الله عنه- قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) . (اني لاعلمكم آخر اهل النار خرو جأ منها ،وآخراهل الجنة دخولا الجنة: رجل يخرج من النار حبوأ ، فيقول الله تبارك وتعالى –له :اذهب فادخل الجنة، قال:فيأتيها، فيخيل اليه انها ملآى ، فيرجع، فيقول :يارب وجدتها ملاءى)) فيقول الله تبارك وتعالى له: اذهب فادخل الجنة: قال فيأتيها تتخيل اليه انها ملأي، فيرجع فيقول الله له اذهب فادخل الجنة،فان لك مثل الدنيا وعشره امثالها: أو ان بك عشرة امثال الدنيا فال فيقول: اتسخربي) أواتضحك بى وانت الملك قال: لقد رايت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ضحك حتى بدت نواجذه قال:وكان يقول: ذالك ادنى اهل الجنة منزلة)) رواه مسلم (١)

## ((کەمترین پلە وپایەی بەهەشتییەکان))

لەعەبدڵلای کوڕی مەسعودەوە -ڕەزای خودای لێ بێ- دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی ((انی لاعلمكم آخراهل النار خروجا منها)) من کۆتایی ترین کەسی دۆزەخی بەئێوە دەناسێنم کەلێ ی دەر دەچێ ((وآخراهل الجنة دخولاً الجنة)) بەهەمان شێوە دواین و کۆتایترین کەس بەهەشتی پێدەناسێنم ((رجل يخرج من النار حبوأ)واته ((کەسێکە بەگاگۆلکێ (٢) ؛ دەڕوات ولەدۆزەخ دەردەچێ ((فيقول الله تبارك وتعالى له اذهب فادخل الجنة)) خودای گەورە پێ ی دەفەرموێت بڕۆ بچۆ ناو بەهەشتەوە ((قال: فيأتيها فينجيل اليه انها ملآى )) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) اخرجه مسلم في كتاب الايمان –باب :آخر اهل النار خروجأ برقم : ٣٠٨(١٨٦).

واخرجه البخارى في كتاب الرقاق-باب صفة الجنة و النار .واخرجه الامام احمد والترمذى وان ماجه واخرجه النساني في كتاب الايمان وشرائعه، باب زيادة الايمان برقم : (١٧٤١).

واخرجه الترمذى في ابواب صفه القيامة-باب كماجاء في الشفاعة برقم : (٢٤٣٤)

(٢)- گاگۆلکێ وەك ڕۆیشتنی منداڵە لەسەر هەردوو ئەژنۆ .کاتێ دەڕوات

دەفەموێت دەڕوات بۆچوونەناو بەهەشت بەڵام واهەست دەکات وگومان دەبات جێگەو شوێنی بەهەشت هەمووی گیراوە جێگەی لێ نابێتەوە ونەماوە ((فیرجع فیقول یارب وجدتهاملاء) دەگەڕێتەوزەو دەڵێت ئەی خودایە بەهەشت پڕموتەنراوە لەخەڵك ئەم چوون وهاتنە وچیرۆکە سێ سێبارە دەبێتەوە لەنێوان ئەو کەسەی کەکۆتایترین مرۆڤە لەدۆزەخ دێتەناوبەهەشت لەگەڵ خودای گەورە .بۆدوواجار خودای گەورە پێ ی دەفەرموێت ((انهب فادخل الجنة فان لك مثل الدنيا وعشرة امثالها،)) بڕۆ ناو بەهەشت بەئەندازەی دوونیاو ئەوەندەی تریش بۆتۆیە لەبەهەشتدا ((قال: فيقول :اتسخربی أوتضحك بی وانت الملك)) پێغەمبەر (صلی الله عليه وسلم) دەفەرموێت کابرا دەڵێت ئەی خودایە تۆگاڵتەم پێ دەکەی یان پێم پێ دەکەنی وتۆخۆت پادشا)) عبدوڵلای کوڕی مەسعود -ڕەزای خودای لێ بێ- دەڵێت: من پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بینی پێ کەنی ((حتى بدت نواجذه)) هەتا ددانەکانی پێشەوەی دیاروبەدەرکەوت لەپێکەنینا .عبدڵلای کوڕی مەسعود ڕەزای خودای لێ بێ: دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت : ((ئەوە کەمترین کەسە لەپلەوپایەدا لەبەهەشتی یەکان )) .

## ((لێکدانەوەی زاناکان))

**((أتسخربی))؟ تۆئەی خودای گەورە گاڵتەم پێ دەکەی لێرەدا سێ بۆ چوون هەیە بۆزانایان بۆ چوونی:**

**یەکەمیان**: لەواتای فەرموودەکان بەگشتی وادیارە کابرا هەرجار سوزداری دەدات کەداوای زیاتر نەکات بەڵام لەگەورەیی بەهەشت ودەوڵەمەندی خودای گەورەی چاوپێ دەکەوت ئاوات وخواستی زیاتری دەخواست بۆیە خودای گەورە پێ ی پێ دەکەنێ ئەمەش وەك ئەوەی خودای گەورە پێ ی بفەرموێت تۆسۆزت دا کە (قانیع) بی. دوورنیە ئەمە گاڵتەی خودابێ بە بەرامبەر سۆزشکاندنەکانیەتی. لەهەمان کاتدا کابرا هەستی بەوە

دەکرد کە خۆی حەزی بەزیاترو زیاتر هەیە بۆیە بەخودای گەورە دەفەرموێت تۆئەی خودایە گاڵتەم پێ دەکەیت لەبەر حەزبوون چاوتێرنەبوونم .

**بۆ چوونی دووەمیان** : دوور خستنەوەی لەخودای گەورە لەلایەن ئەم بەندەوە وەك ئەوەی بڵێت :ئەی خودایە من دەزانم تۆ گاڵتەبەمن ناکەیت چونکە تۆ خودای هەموو جیهانەکانی ئەویش کەتۆ لەو هەموو مۆڵك وسامانە بەمنت بەخشیوە راستە لەلایان تۆوە یە ئەی خودایە :بەلآم سەرم لەوە سوڕ دەمێنێ کەمن شیاوی ئەو هەموو بەخشینەو پێدانە نیم .

**بۆ چوونی سێیەم** : ووتەی ((القاض عیاض)) ە رەحمەتی خودای لێ بێ ئەم ووشەیە ((استخربي)) لەوکابرابە هەشتی یەوە هاتووە لەبەر خۆشی ودڵشادی وبەختەوەری زمانی خۆی رادەگرد بۆیە ئەمەی ووت چونکە لەبنەرەتدا ولەراستیدا مەبەستی پێی ئەوەنی یە کە خودا گاڵتەی پێ دەکات لەبەرئەوەی لەخۆشی یەکی ئەوەندە گەورەو بێ وێنەدایە هەڵەی کرد بۆدەربرپینی وەك چۆن کابرایەك لەدونیادا خودای گەورە رزگاری کردووتی ((خودایە تۆبەندەی منی و منیش خودای تۆم)) (١)

### *(گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ رۆژانەی ژیانی خۆمان)*

١) گەورەیی خودای گەورە و میهرەبانی و سەخاوەتی و خودای گەورە دەردەخات کابرا شیاوی چەند بێ خودا ئەوەندەی بۆ زیاد دەکات .

٢) زۆری گەورەیی موڵك و سامانی خودای گەورە کە کەمترین پلە و پایەی بەهەشتیەك

---

١- اخرجه مسلم في كتاب التوحيد برقم : ٧(٢٧٤٧) ثم قال من شدةالفرح :ا للهم انت عبدي واناربك اخطا من شودة الفرح.

بریتی بێ لە( دە) ئەوەندەی دونیا و زەوییە چیش تیادا بێ ئەی ئەبێ چەندەبێ کەسانێك لە گەورەترین پلە و پایەی بەهەشتا بێت (١)

٣) پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خودای گەورە بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکانی هەر لە دونیا و پیشان داوە بە هەموو پلە و پایەکانیانەوە .

٤) پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەوەی خودای گەورە فێر و پیشان و نیشانی ئەوی دابێ ئەویش لە هۆشی ئێمەی نزیك کردووەتەوە و بۆی باسکردووین

بۆئەوەی ئێمەش تام و لەزەتی لە خۆشیەکانی بەهەشت بکەین و بترسێین لە ناخۆشیەکانی دۆزەخ .

٥)ئەوەی شیاوی دۆزەخ بێت بە هۆی تاوان زۆریەوە خودای گەورە بە چەند هۆکارێك رزگار بوونی دەکات لەو دۆزەخە خوا بە مەرجێك لەو کەسانە نەبێت کە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموون هەتا هەتایی دەمێنێتەوەتیایدا.

٦)ئەوەی شیاوی دۆزەخ بێت بە هۆی تاوان زۆرییەوە خودای گەورە بە چەند هۆکارێك رزگار بوونی دەکات لەو دۆزەخە خوا بە مەرجێك لەو کەسانە نەبێت کە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموون هەتا هەتا لە دۆزەخ دەمێننەوە کە ئەگەر هەندێ تاوانی بێ سنوور ئەنجام بدرێت؛ **ئینجا گرنگترین ئەو هۆکارانە ئەمانەن :-**

**یەکەم** : میهرەبانی خودای گەورە خۆی هەرکێ ببەخشێ دەیبەخشێ .

**دووەم** : شەفاعەتکردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

---

١) بۆ ئەوەی ئەم فەرموودەیە زیاتر لە هۆشی تەسکی خۆمان نزیك بکەینەوە دەڵێم ئێمە هەر لە دونیا دا زانا فەلەکیەکان دەڵێن ئەستێرەی وا هەیە لە دونیای ئەمرۆ مان بە دەیەها جار لە ئەستێرەی گۆی زەوی گەورەتر و فراوانترە جا خودایە ئەمەی بۆ ئێمە هەر لە دونیادا پیشان بدات هەر بۆ ئەوەیە کە فراوانی و دەوڵەمەندی خودای گەورە بزانین لە کاتێکا ئەم گەردوونە بۆ یەکجاری نییە بەڵکو تەمەنی دیاری کراوە .

**سێیەم** : تکاکردنی هەندێ بڕواداران بۆ برادەرەکانیان .

**چوارەم** : تکاکردنی شەهیدان .

**پێنجەم** : تکاکردنی قورئان و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی سوننەت .

**تێبینی** / ئەمانە هەموو فەرموودەی سەحیحیان لەسەر زۆر هۆکاری تریش هەیە بەڵام دەرفەتمان نیەیە لێیان بدوێین .

**٧)لەسەر خۆیی خودای گەورە بۆ چوون و هاتنی ئەو بەندەیە بە بێ ئەوەی خودا هیچ تووڕە بێت لێی ئەویش.**

**ئەمخاڵەش بەش بەحاڵی خۆی ئەم سوودانی لێ وەردەگیرێ:-**

ا ـ ئەو کەسەی بەرپرسە (( ئیتر لە باوك و دایك )) یان هەر بەرپرسێك خۆی فێری ئارامگرتن بکات بەرامبەر ئەو کەسەی لە ژێر بەرپرسارێتی ئەو دایە با بۆ چەند جاریش هەمان پرسیاریان داواو دووبارە بکاتەوە لەسەر خۆ بێت لەسەر ئەو کێشەیەی کە هەیە بۆی جێبەجێ بکات یان بۆی ڕوون کاتەوە ئەگەر پێویست بە ڕوونکردنەوە بوو .

ب ـ ژێر دەستە یا ئەو کەسەی لێ پرسراوە با بۆ گەیشتن بە قەناعەت (دوو)جار و( سێ) جار هەوڵی پرسیارکردن بدات لە کەسێ پەیوەندیدار نەك بە بێ زانست خۆی لە شتەکان بدات کە زیاد لە سنووری لێ پرسراووی ئەو بێت .

ج ـ خۆمان ڕا بهێنین بۆ پرسیار کردن و تێ ڕامان لە شتەکان بۆ سوود وەرگرتن .

د ـ هەردەم هەوڵی ئەوە بدەین فێری زانست بین .

هـ ـ بە کەم ڕازی نەبی بەڵکو هیوات بەرزبێت بەڵام بە مەرجێك سنووری مافی کەسی تر نەبەزێنی .

و ـ هەر کارێك دەکەیت بە چاووڕوونی شارەزایی و پسپۆری ئەنجامی بدەیت خۆتی لێ نەدەیت بە کوێرانە .

**ز ـ هەوڵی ئەوە بدەیت خەڵکانیش بۆ کارەکانیان بە شێوەیەکی زانستیانە هەڵسووکەوت بکەین لەگەڵ شتە تازەکان و هەرشتێکی تر کە ئەنجامی دەدەن .**

**ح ـ پیرۆزی هەوڵدان بۆ فێر بوون دەردەخات .**

**گ ـ خراپی و گەندەڵی کەسێك دەردەخات کە بێ زانستی بۆ شتەکان بچێت .**

**ی ـ ماندوو نەناس بین بۆ فێر بوون هەر شتێك بە سوود و قازانجێکی ئایینی و دونیایی‌یان بگەیەنێ .**

**٨)زۆرلەوا ئەوەی تۆ بە (خەیاڵ) و( داڵغە) و لێکدانەوەی خۆت بۆی دەچی مەرج نییە وابێ چونکە کابرا وای زانی بەهەشت پڕە و جێگەی ئەوی لێ نابێتەوە ، ، بەڵام لە هەمان کاتدا خودای گەورە زۆر زیاتری لایە لەوەی کە ئێمە دەرکی پێ بکەین .**

**تەنانەت داوا کردنی مرۆڤ سنوورێکی هەیە بەڵام بەخشین و موڵکی خودا بێ سنوورە .**

**٩)دروستەو سوونەتە مرۆڤ کاتێك کە شتێکی شیاوی پێکەنین ببینێ پێ بکەنێ ئەمەش هیچ لە جوامێری کەسان کەم ناکاتەوە .**

**١٠)بەڵام بە مەرجێك گاڵتە پێ کردن نەبێت بۆ کەسی تر یان هەستی بریندار بکەیت .**

**١١)جار و بار پێکەنین خۆی دەسەپێنێ مرۆڤ لە خۆشیدا پێ دەکەنێ .**

**١٢)ئەم کەسە کە کەمترین کەسی بەهەشتییە لە پلەو پایەدا (دە) ئەوەندەی دونیا و چێش تیادایە خودای گەورە بە کەرەمی خۆی پێ دەبەخشێ نەك کابرا خۆی بە کردەوەی خۆی بە دەستی هێنا بێ ، ئەی ئەوەی ئەگەر بە هۆی چاکەکانی خودا بەهەشتی پێ ببەخشێ ئەبێ خودا چەندە پاداشتی گەورە و بێ سنووری بۆ دابنێ .وەك ئەوەی دەفەرموێت: ( تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ ) السورة الزمر الآية.**

---

﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ (٥٣) سورة النحل واتە : (هەر خێر و خۆشی یەکان لەسەرتان بێت تەنها لە خوداوەیە).

سکاڵا و پاڕانەوە و خۆ چەماندن تەنها بۆ ئەو بکە و بۆ ئەو خودایە ببە . زۆر زۆر دووبارە و سێ باردی بکەوە ئاوە جوانە پیرۆزدکانی ، بازمانت بەو یادە جوانانە پاراوبێت سوپاسی و ستایشی بێ پایانی بۆ بکەو لە مەدح و سەنای ماند و هیلاك مەبە ، داخوازیەکانت ، پێویستیەکانت ، پاڕانەوە و داواکایەکانت گەڕانەوەکانت تەنها بۆ لای خودای گەورە و میهرەبان بێ. بێ گومان ئەگەر ئەمە حاڵت بێت ئەوا بزانە پشت بەخودا و بەهێز و توانا، هەموو خۆشیەکانت وەدەست دەکەوێت، حەوانەوەی دڵ و بەختەودری دروونت بە قسمەت دەبێت . هەموو نوورو مەرحمەتێك ڕوت تێ دەکات .

## (( ما جاء فما اعده الله لعباده الصالحين ))

عن أبي هريرة-رضي الله عنه- قال:قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال الله : ( أعددت لعبادي الصالحين . ما لا عين رأت ، ولا اذن سمعت ولا خطر على بشر ، فاقرأوا ان شئتم : ( فلا تعلم نفس ما أخفي لهم من قرة اعين )) (السجدة : ١٧ رواه البخاري (١) في صحيحه ).

## (( ج دەقێك هاتووە دەربارەی ئەوەی كە خودای گەورە چی بۆ بەندە چاكەكانی خۆی ئامادە كردووە لە بەهەشتدا)) .

لە باوكی هورەیرەوە خودا لێی ڕازی بێ دەڵێت : پێغەمبەر صلى الله عليه سلم : فەرموویەتی خودای گەورە فەرموویەتی: ((اعددت لعبادي الصالحين )) (( بۆ بەندە چاكەكانی خۆم لە بەهەشتدا بۆم ئامادە كردوون لە خۆشی و شادی سەرفرازی و بەختەوەری و دڵنیایی و سەروەت و سامان و دەوڵەمەندی لەش ساغی و بە هێز توانایی و جوانی و تەواوی و گەنجایەتی هەر شتێكی تر كە ئەوان حەزیان لێبێ لە هەموو جۆرە خۆشی یەكان بە هەموو خۆشیەكانەوە كە (( ما لا عين رأت )) ( ما ) موصولە یە واتە ئەوەی كە هیچ چاوێك نەی دیوە یان (ما) ی موصوفەیە واتە وەسف و چۆنیەتی یەكەی بەم شێوەیە كە هیچ كەسێك نەیبینیوە ( عين ) نكرە

---

١)-اخرجه البخاري في كتابه في كتاب بدء الخلق _ باب : ما جاء في صفة الجنة ، وانها مخلوقة . زاخرجه البخاري ايضاً في كتاب التفسير تفسير سورة السجدة _ باب : قوله ( فلا تعلم نفس ما أخفي لهم ). واخرجه البخاري في الكتاب التوحيد _ باب قول الله تعالى (( يريدون ان يبدلوا كلام الله )) .واخرجه مسلم في كتاب الجنة و صفة نعيمها واهلها برقم ٢ _ (٢٨٢٤) واخرجه مسلم ايضاً برقم ٢ _ (٩٢٨٢٤) ، و برقم ٥ _ (٢٨٢٥)واخرجه الترمذي في أبواب التفسير سورة الواقعة برقم (٣٢٨٣) وقد اخرجه النسائي في الكتاب التفسير _ باب : ٧٤ قوله تعالى (( فمن زحزح عن النار وادخل الجنة فقد فاز ) برقم : (١١٠٨٥) واخرجه ابن ماجه في الكتابالزهد_ باب : صفة الجنة برقم : (٤٣٢٨) وقد اخرجه الإمام احمد في مسنده.

مەبەست پێی هیچ چاوێك نەیبینیووە هەموو چاوێك دەگرێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ چاوێك لە چاوەکان جیا بکرێتەوە (( ولا اذن سمعت )) بە هەمان دەربارەیچاو هەمان وێنە دەربارەی گوێش واتە بە گوێ و بیستی هیچ کەسێکدا نەهاتووە تەنانەت (( ولا خطر علی قلب بشر )) بە خەیاڵ و داڵغەی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتووە .

(منی هەژاریش بۆ میهرەبانی خودا دەڵێم دوو تێبینیم هەیە :

**یەکەم**: بۆچی یەکەمجار چاوی پێش خست بە حاونین دەتوانین دەربڕینی خۆشیەکان زیاتر دەربڕێت ئەمەش کەم کەسێك هەیە بتوانێ هەموو خۆشییەکان ببینێبە تایبەت لە دونیادابەڵام بە پێچەوانەی گوێ و بیستی چونکە مرۆڤدەتوانی لە باسی ڕابردوو بکرێت و ئێستاو داهاتووش گوێی لێ ببێ . کەواتە دەرکی گوێ زیاترە لە چاو ؟ابەڵام داڵغەو خەیاڵی مرۆڤ هێشتا گەورەترە لە توانای بینیی چاو وپێش گوێ چونکە مرۆڤ بە خەیاڵ جاری وا دەبێت داڵغە لێ دەدات بە شێوەیەك کە هیچ چاو و گوێ نەیانبینیوە و گوێ لێ نەبووە .

**دووەم** : بۆچی بۆ چاو و گوێ ، خودای گەورە فەرمووی هیچ چاو و گوێیێك نەیبینیوە ، (( هەموو مرۆڤەکان و فریشتەکان و جینییەکان شەیتانەکانیش )) توانای بینینی و گوێ لێ بوونی جۆری خۆش وایان نی یە ، چونکە نەفی کرد بە هیچ شێوەیەك نی یە و نەبووە و نابێت ڕۆژێك لە ڕۆژان بە چاو وببینرێ و بە گوێ ببیسترێ بەڵام بە داڵغە فەرمووی (( بە خەیاڵ و داڵغە لەسەر هیچ دڵی مرۆڤێك نەهاتووە چونکە بە دڵ هاتنی مرۆڤ بێ تواناییەکی بێ سنووری هەیە بە تایبەتی کە داڵغە بە خۆشی و بەختەوەرییەوە دەبات یان وەکو ئەوەی پێمان بڵێت کار و ئیشی دڵ لەوە زیاترە کە خەڵك گومان دەبات ئیشی تەنها ئەوە بێ خوێن ببات و بهێنێ .بە تایبەتی مرۆڤ لێرەدا بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ لایەنی پەیوەندی دارە لەم باسکردنە دا نەك کەسانێکی تر هەر بۆیە جێی خۆیەتی ئەوان بە داڵغە زیاتر قوڵتر دەبنەوە لەگەڵ باسکردنەکە دا .

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە کۆتایی دا فەرمووی ئەم ئایەتە بخوێنەوە :

{ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ١٧ { )) (السجدة : هیچ دەروونێك نازانێ خودا چی هەڵگرتووە و حەشاری داوە بۆی لە تۆقرەی بیلەی چاو .

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی کە لەم فەرمووودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان)

١) خودای گەورە زۆری لایە بۆ باوەڕداران و کەسانی گونجاو جۆراو بۆ خودای گەورە

٢) هەرچەندە بیر لە گەورەیی خودا بکەینەوە هەر دەرکمان سنوور دارە لە زۆری موڵکی خودای گەورەیە بە ژمێریارێك یان هەر دەزگایەکی تری ژمێریاری توانای لێکدانەوەی نیە دەستە وەستان دەوەستێ لە ئاستی گەورەیی ودەسەڵات و زۆری موڵکی خودای گەورە نەبڕاوە هەتا هەتایی هەمیشەیی .

٣) خودای گەورە بە کورترین ووشە بە واتاترین واتا گەورەیی ئەو بەهرانەی خۆی بۆ بەندەکان باس کرد .

٤) ئەمەش بۆ ئەوەیە ئێمە هەوڵی بە دەست هێنانی خۆشییەکانی بەهەشت بین .

٥) بەڵام خودای گەورە بۆی دیاری نەکردین چونکە هەر بە گەورەیی باس بکرێت ئەگەر دیاری کرا ئەو سنوور دار دەبێ . بەڵام خودای گەورە دیاری کردنە بۆ ئەوان هەڵگرتووە کاتێك پێ شاد دەبن .

٦) ئەم جۆرە نەفی کردنانە ئەوە دەگەیەنێ بۆ لەمەو پێش و بۆلە ئێستا و لەمەو پاشیش دەگرێتەوە لەهەمان کاتدا هەموو جۆرە دروست کراو و بوونەوەرەکانیش دەگرێتەوە .

٧) ئەم بەهەشت وخۆشیانە بە گوێ ڕایەڵی فەرمووودەی خودای گەورە و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە دەست دێ لە پاش میهرەبانی خودای گەورە .

٨) چەندە بە نرخ بێت ئەوەندەش ماندوو بوون و لێ بڕانی دەوێت کە بە دەست بێت .

٩) کورتر ین ڕێگە بۆ ئەم مەبەستە لەو دەرگایەوە بچیت کە خودای گەورە بۆی داناوی لێیەوە بچیتە ژووری نەك خۆت بە هزری خۆت ڕێگەیەکی تری بۆ دابهێنی .

١٠) هەرچی باوەڕدار حەزی پێی هەبێ خودای گەورە زۆر بەزیادەوە پێی دەبەخشێ.چونکە باوەڕدار لەدوونیادا خۆی گرێبەست کردووە بەفەرمانەکانی خودای گەورە.وخۆی لەزۆر خۆشی حەزوئارەزوویەکی دەروونی خۆی وازلێهێناوە؛ لەبەر خودای گەورە بۆیە خۆدای گەورەهەموو داواکانی بەزیادەوەپێدەبەخشێ قەرەبووی بۆدەکاتەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (٩٠) : (( المؤمن كالخامة من الزرع نفيئها الريح يمنه ويسره))[1] واتە : مرۆڤی باوەڕدار وەك رووەكێكی چێنراو وایە (با) بەلای ڕاست و بەلای چەپی دەباو دەی هێنێ.

(ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم) دەڵێ ( ئێمە لەژیانێکا دەژین ئەگەر پادشاکان بیان زانیایە ئێمە لەچ خۆشی و بەختەوەری یەکین ئەوا شەڕیان لەگەڵ دەکردین بەشمشێرەکانیان بۆ ئەوەی ئەوان خۆیان ببن بەخاوەن دڵی بەختەوەر. (ئیبن تیمیە) دەڵێ: کاتی زۆر خۆش بەسەر دڵەکاندا تێ پەڕ دەبێت، دەڵێم ئەگەر بەهەشتی یەکان لەم خۆشیەدابن بەڕاستی لەخۆشیەکی زۆر خۆش دان.

(تەها حسین) باسی خۆی دەکات و دەڵێ : من مرۆڤێکم وەك هەموو مرۆڤەکانی جیهان لەلەدایکبوون و ژیانی رۆژانەمدا ، بەلام من دڵم بەکەس خۆش نییە هەردەم خەفەت بارو خەمدارم وەك ئەوەی لەبیابانێکی چۆڵدا بم تەنها منی لێ بێ و بێ سنوور بێت، هیچ نیشانەی دیاری کردنی نەبێت، کەس هەر ڕووی تێ نەکات، هەر تەواو نەبێ .

تێبینی : داواکارم لەخوێنەران ئەم ناسەقام گیریەی تەها حسێن بەراورد بکەن لەگەڵ دڵنیایی دەروونی (ابن تیمیة) و (ابرهیم ی کوڕی ئەدهەم) کە ئەمان نوێنەرایەتی بەندایەتی راستی خودان :کە تەها حسێن نوێنەرایەتی کەسان یاخی بوو لەبەرنامەی خودا دەکات.

## (( ان اهل الجنة ما اعطو شيئاً أحب اليهم من النظر إلى ربهم _ عز و جل ))

عن صهيب الرومي- رضي الله عنه _ عن النبي -صلى الله علية وسلم -قال : (( اذا دخل اهل الجنة الجنة قال يقول الله تعالى : تريدون شيئاً أزيدكم ؟ فيقولون : الم تبيض وجوهنا ؟ الم تدخلنا الجنة و تنجنا من النار ؟ قال : فيكشف الحجاب ، فما اعطوا شيئاً احب اليهم من النظر إلى ربهم عز و جل )) (رواه إمام مسلم في صحيحه (١) )

## (( هیچ شتێك لەوە خۆشتر نییە کە دراوە بە بەهەشتییەکان وەك ئەوەی خودای گەورە چاویان بە بینینی خۆی شاد دەکات ))

لە سوهەیبی ڕۆمییەوە -خودا لێی ڕازی بێ- لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کە دەفەرمووێت (( إذا دخل أهل الجنة الجنة )) کاتێك خەڵکانی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە )) قال : ((يقول الله تبارك وتعالى)) : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی خودای گەورە دەفەرمووێت (( تريدون شيئا أزيدكم ؟ )) ئایا هیچ شتێکی ترتان ناوێ بۆتان زیاد بکەم ؟ فيقولون : ألم تبيج و جوهنا ؟ ئەی خودایە ڕووت سپی نەکردین ؟ (( الم تدخلنا الجنة )) ئەی نەتخستینە بەهەشتەوە ؟ ((او تنجنا من النار ))؟ لە ئاگری دۆزەخت رزگارو دەرباز نەکردین ؟ واتە ئەمە هەموو ئەو شتانەیە کە ئێمە هیوامان دەخواست ئەوە بوو ((ڕوومان سپی بێ وبچینە بەهەشت و لەدۆزەخ بپارێزرێین)) ! بەڵام خودای گەورە بەخشین و بەهرەی گەورەتری بۆ داناون کە ئەویش ئەوەیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی (( فيكشف الحجاب ))

---

١- أخرجه مسلم في الكتاب الإيمان _ا ثبات رؤية المؤمنين في الآخره ربهم سبحانه و تعالى رقم : ٢٩٧ _ ١٨١ وقد اخرجه الترمذي في ابواب صفة الجنة _ باب ماجاء في رؤية الرب تبارك و تعالى برقم : ( ٢٥٥٩ ) .وقد اخرجه النسائي في الكتاب النعوت _ باب المعافات والعقوبة برقم : (( ٧٧٦٦ )) كذا في كتاب التفسير سورة يونس _ باب قوله تعالى (( للذين احسنوا الحسنى) بـرقم ( ١١٢٣٤ )

.وقد اخرجه إبن ماجة في الكتاب المقدمة _ باب فيما انكرت الجهمية برقم (١٨٧)وقد اخرجه ابن حرية و ابن حبان في _ صحيحيهما رحمهم الله جميعاً .

خودای گەورە پەردەی نێوان خۆی و بەهەشتییەکان لادەدات (( فما اعطوا شیئاً احب الیم من النظر إلی ربهم _ عز وجل ))

((هیچ شتێکیان کە پێ بەخشراوە لەو هەموو خۆشیەکانی بەهەشت بەلایانەوە خۆشترنییە لەوەی کە چاویان بە دیداری خودای گەورەی خۆیان شاد دەبێت)) بێ گومان هەموو خۆشیەکانی بەهەشتیان لە بیر دەچێ تەنها سەرقاڵی ئەوەدەبن بڕواننە جوانی و گەورەیی‌و پاکی و بێگەردی بێ وێنەیی و بێ هاوشێوەی خودای گەورە و میهرەبان .

دەسا خودای گەروە تۆ بە میهرەبانی خۆت بێ بەشمان نەکەیت لەو بەهرە بێ وێنە لە شاد ببنبە ڕوانینمان بۆ تۆی پیرۆز و گەورە .

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی *کە لەم فەرموودە پیرۆزە وەردەگیری بۆ ڕۆژانەی ژیانی خۆمان*

١) بینینی خودای گەوررە لە هەموو بەهرەکانی تری بەهەشت خۆشترە بەڵکو بەو دیدارە خۆشیەکانی تری بەهەشت لە بیردەچێ.

٢) ئێمەی بڕوادار لە دونیادا خودای خۆمان نابینین و دەرکی پێ نابەین وەك پاداشتێك کە ئاراممان گرتووە لەسەر ئەوەی خودای خۆمان دەپەرستێن بەبێ ئەوەی بینیبێتمان بۆیە خودای گەورە لەو ڕۆژە ئەو بەهرە بێ وێنەمان پێ دەبەخشێ

٣) هەموو ئاواتێکی هەر مرۆڤێکی باوەڕدار ئەوەیە خودای گەورە بیخاتە بەهەشت لە دۆزەخ بە دووری بخات .

٤) هەرچی داوا بکەین لە خودای گەورە خودای گەورە هەر زیاتر و گەورەتر و چاکترمان پێ دەبەخشێ .

بە گەورەیی خۆی توانایمان تیادا دروست دەکات بۆ ئەوەی لەزەت وخۆشی بێ وێنەیی لە جوانی و گەورەیی خودای گەورە ببینین

٥) بینینی خودای گەورە لە هەموو بەهرەکانی تری بەهەشت خۆشتر بەڵکو بەو دیدارە خۆشی‌یەکانی تری بەهەشت لە بیردەچێ (١).

٦) قسەکردنی خودای گەورە لەگەڵ بەهەشتی‌یەکان خۆی بە خۆی گەورەترین بەهرەیی خودایی‌یە .

٧) بێ گومان ئەمەش تایبەتمەندی باوەڕدارانە بە تەنها بۆ هیچ کەسێکی تر نی‌یە .

٨) بۆ بێ بڕوایان تەنانەت قسە کردنی خودایی لەگەڵیان تووڕەیی خودایان بۆ دەردەخات بۆ ئەمەش زیاتر ئەشکەنجەدابێن .

٩) مرۆڤ کێی خۆش بوێ لە دوا ڕۆژدا لەگەڵ ئەو دەبێ خودایە شایەد بە ئێمە تۆمان خۆش دەوێ لەگەڵ سەرجەم پێغەمبەران و فریشتەکان و کەسانی چاکی تۆو ڕاست گۆیان و بانگەوازخوازان شەهیدانی ڕێگەی ڕاستی تۆ ئەی خودایە.

زانای بەناوبانگ (ئەسمەعی) دەڵێ : دەشتەکی یەك گوێ ی لەقورئان خوێنێك بوو ئەم ئایەتەی خوێند ﴿فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ﴾ الذاریات/٢٣

واتە : (سوێند بەخودای ئاسمان و زەوی ئەم قورئانە لەلایەن خودا هاتووە وەك چۆن ئەوان قسە کردنیان بەیەکەوە ڕاستە).

دەشتەکی‌یەکە دەڵێ : پاك و بێگەردی بۆ خودا، خودا پێویستی بەچی هەیە هەتا سوێندی بۆ بخوات؟!

بەڕاستی ئەوە هیوای باش بردنەو حەز بەکەرەمی خوا کردنە و چاکەو بەزەیی و میهرەبانی خودایە.

لەفەرموودەی ڕاستکراودا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (٩٥)( قال یضحك ربنا )[١]

واتە : (خودا پێ دەکەنێ) .

دەشتەکی یەکیش گوێی لێ دەبێ ئەویش دەڵێ بێ سوود نابین لەگەڵ خودایەك کە پێ کەنینی هەبێ.

---

(١) بۆ خۆشی یەکانی بەهەشت و گەورەیی زۆری بێ وێنی بڕوانەوە فەرموودەیی ( ٢٨ و ٣٩ ) هەر لەم پەرتووکەدا.

# گرنگترین سەرچاوەكان

صحیح البخاری-ناسراوبە:

١ -ابـو عبـدالله ابـن اسماعیـل البخـاری كـە تێكراڤـەرموودەكانی— ٩٠٨٢ - فەرموودە هێناوە.

٢- صحیح مسلم ناسراوبە:

-مـسلم ابـن الحجـاج لنبیـسابوری كەتێكراڤـەرموودەكانی٤٠٠٠ فـەرموودە هێناوەبەبێدووبارەبوونەوە.

٣-سنن ابو داود-ناسراوبە:

ابی داودسلیمان بن الشعپ السجستانی وەفاتی—٢٠٢-٢٧٥ ك كەتێكراڤەرموودەكانی-٥٢٧٤ فەرموودە هێناوەبەبێدووبارەبوونەوە

٤-سنن الترمذي ناسراوبە:

الامـام الحـافظ محمـدبن العیـسی بـن سـورةالترمذي وەفـاتی ٢٧٩ك كەتێكراڤەرموودەكانی-٣٩٥٦فەرموودە هێناوە

٥-سنن ا لنسائی ناسراوبە:

ابـی العبـد الـرحمن احمـد بـن شـعیب بـن علـی الـشهیر بالنـسائی وەفـاتی٢١٥-٣٠٣ك كەتێكراڤەرموودەكانی-٥٧٥٨فەرموودە هێناوە.

٦-سنن ابن ماجە ناسراوبە:

ابـی عبـدالله محمـدبن یزیـد القـزوینی الـشهیر بـابن-ماجـە وەفـاتی٢٠٩-٢٧٣ك كەتێكراڤەرموودەكانی-٤٣٤١فەرموودە هێناوە.

ملاحظة نقلت حكم الالباني علی هذه السنن.

صحیح الجامع الصغیركە زیاتر لە١٠٠٠٠ فەرموودە لەخۆگرتووە

سلسلةالاحادیث الصحیحة زیاتر لە٨٠٠٠ فەرمووده لەخۆگرتووه للالبانی-رحمهم الله جمیعا .

بۆ لێكدانەوەی ئەم فەرموودانە لەلێكدانەوەی ئیمامیالقسگلانی بۆشەرحی صحیحی البخاری.

بۆ لێكدانەوەی ئەم فەرموودانە لەلێكدانەوەی ئیمامیالنووی بۆشەرحی صحیحی مسلم.

بۆسوودهەلێنجان لەزاناكانی پێشوو وەكئیمام نەوەوی و بێجگەلەئەویش .

بۆسوودهەلێنجان لەزاناكانی سەردەم وەكئیمام العپێمینو بێجگەلەئەویش .

لەپاش ئەوانیش (بەندە)ی هەژاربۆمیرەبای خودای گەورە هەوڵمداوە سوودەكان گرێبدەم بەرۆژگاری خۆمانەوەبۆزیاترسوود لێ وەرگرتن.

## چەند سوودو تێبینی یەكی زۆرپێویست

بۆ جیاوازی لەنێوان القران والحدیپ القدسی دا:

زانا الكرمانی دەڵێت القرانووشەكانی كەس ناتونێ وەك ئەو بهێنێ لفف معجز ناردنی بۆ سەرزەوی بەهۆی جبریلەوەیە

بەلام و(الحدیث القدسي) بەپێچەوانەوەیە

بەلام جیاوازی لەنێوان الحدیث القدسي والحدیثالنبوي دا.

ئەوەیە الحدیث القدسي پێغەمبەر صلی الله علیەوسلم دەیداتەوە پاڵخودای خۆی ئینجا بەرێگەی ئیلهام وخەووەبێت .

بەلام الحدیثالنبوي بەبێدانەپاڵیخوداوە بالەبنەرەتدا هەرلەخوداوە بێت.

## كۆتایی- -

گرنگ ئەوەنیە پەڕتووكێكت خوێندەوە  بەڵكو گرنگ ئەوەیەچ سوودێكت لیكڕد، لەپاشاندا كارت پێكرد، تاییەت بۆ خودا ی گەورە و لـە شـوێن كەوتنی پێغەمبەردابێت (صلی الله علیه وسلم).

(( سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين واخردعواي ان الحمدلله رب العالمين )) .

# ناوەڕۆکی فەرموودەی قودسی

## ناوەرۆك

لەووتەو کارو ئەوەش کەلەناو دڵدایە هەرئەبێ بۆخودا بێ)) .

**گەورەترین پرۆژەی**

**بەکوردی کردنی تێکڕا فەرموودەی قودسی!**

**(١)**

# گەورەترین مەوسووعەی (ئینسکلۆپیدیا) فەرموودەی قودسی

**بەرگی یەکەم بەشی دووەم**

**نووسین و لێکدانەوەی/ مامۆستا ابوبکر توفیق**

(ئەم بەرگە) کۆی بەشەکانی:(یەکەم ودووەم) لە خۆ دەگرێت، وبە یاوەری ئیزنی خودای گەورە دەبێتە بەرگی یەکەم لەپرۆژەیەکی زۆر گەورەو پیرۆز و پێویست ، بۆ هەرموسوڵمانێکی کورد زمان. چونکە لە لە راستیدا یەکەم پرۆژەیە و بۆیەکەم جارە لەکوردوستان و نارچەکە ئەم جۆرە پرۆژەیە بە بخۆیەوە ببینێت ، ئەوەی ئاشکرایە لەلای هەرموسوڵمانێك ئەوەیە پێگەو نرخ وبەهاو سەنگی فەرمودەی قودسی لەلای موسوڵمانان وبەتاییبەت لەلای گەلەکەمان گەلی کوردزمان ! بۆیە وەك هەست کردن بەبەرپرسیارێتی و وەك خزمەتێك بۆ گەلەکەمان ئەم پرۆژەیەهاتە کایەوە..جا داوا کارین لە تێکرای موسوڵمانان کۆمەکمان بن بۆ سەرخستنی ئەم پرژە پیرۆزە. هەر کەسەو بەپێی تواناو دەرفەتی خۆی..
**********************

١٤٣٠هـ ٢٧٠٩ ك ٢٠٠٩م

*ناوی کتێب : **گەورەترین پرۆژەی بەکوردی کردنی تێکرا فەرموودەی قودسی(( پوختەی کۆباسی تێکڕای فەرموودەکانی قودسی ( پیرۆز).))**

**(١)**

* ((بەرگی یەکەم))((بەشیدووەم))

* بەرگی کۆ کراوەی بەشەکانیەتی یەکەم ودووەمیەتی

* ناوەرۆک : فەرموودەی قوسی

* نووسەر:نوسین و ئامادەکردنی: مامۆستا ابو بکر توفیق

* ژمارەی سپاردن : *(٧٠٢)* ی پەرتووکخانەی گشتی هەولێر

سالّی ٢٠٠٧ ز

* پیت چنین : زیلمان=دیندار سورچی

* دیزاین : هێڵی شینی بۆکاروباری کومپیوتەری

* تیراژ : (١٠٠٠) دانه

* نۆرەی چاپ:چاپی دووەم بەزیادکردن وپوختەکردنەوە



**********************

**********************************************

************************************************************

# پێناسەی ئەم پەڕتووکە

١- گرنگترینی ئەو فەرموودانەم هێناوە کە لە ڕۆژانەی ژیانمادا ڕێنمایی لێ وەرگرین .

٢- ڕاسترین فەرموودەم هەڵبژاردووە کەهەموومەرجەکانی زانایانی فەرموودەیی تیادایە بۆپەسەندکردن و وەرگرتنی فەرموودەکان.

٣- هەوڵمداوە بەکورترین واتا واتاکەی بدەم بەدەستەوە .

٤_زۆرترین ڕێنمایی وپەند وانە سوودو قازانج وئامۆژگاریم لێهەڵجنیوە کە زۆر پێویستن بۆ پەوەردەو کارپێکردنیان.

تێبینی //
ئەمانە هەمووی دەقێکی قورئان یان فەرموودیەکی ڕاست یان ئامۆژگاریەکی دانا و زانایەکی لەسە رە.

# كاری دانەر و لێكدەرەوە..

١. هەڵبژاردنی گرنگترین فەرموودەكانی كەزیاتر لەرۆژانەی خۆماندا دووبارە دەبێتەوە بۆسوود لێوەرگرتن لێیان .

٢. راسترین فەرموودەكانم هێناوە كەبەهەمووپێوەرێكی زانایانی ئەوبوارەپەسەندبێت بۆكارپێكردنی،لەوانە-ئیبن سەلاح شەهرەزووری وبوخاری وموسلیم وئەحمەد وئەبوداوود ونەسائی وئیبن ماجە وتورموزی- - -رەحمەتی خودایان لێبێت.

٣. پەسەندكردن وناپەسەندكردنی توێژینەوەی فەرموودەیی لەلایەنی زانایانی پێش لەئێستا و زانایانی ئێستا ش هێناوە زۆربەدەست پاكییەوە.

٤. بۆ تەخریجی فەرموودەكانی ئەم بەشە بەشی دووەمی فەرموودە قودسیەكە (الجامع الاحادیث القودسیة ).

٥. بۆسود وەرگرتنەكان زۆرهەوڵم داوە خۆم ماندوو كردوە زۆرترین سودوو وانەی لێهەڵبجنم كەبەخەیاڵم دا هاتبێت یاداشتم كردوە ،ئەویش بەمەبەستی سود وەرگرتن .

٦. چاوەڕوانی زنجیرەی تری ئەم پەرتوكە بن .

٧. ئەم وانەو سود و هەڵجاندنە تەنها لەم پەرتوكەدا دەست دەكەوێت.

٨. دەکرێت ئەم پەرتوکە بکرێتە وانەیەکی سەرەکی بۆ قوتابخانە ئاینیەکان تەنانەت لەمال و مزگەوتەکاندا یان دایك و باوك بیکەن بەوانە بەمندالّکانیان بلێنەوە بەمەش مندالەکان بەهرەی هەلێنجاندن و تێگەیشتنیان بۆدروست دەبێ .

٩. لێکدانەوەی تێرو تەسەل و ڕێنوینی کردنی خوێنەر لەو فەرمودانەی کەمرۆڤ هۆش و بیرو زانینی دەرەکی پێتەواو دەبێ وەك دەڵێ (کلم الناس علی قدر عقولهم اتریدون ان یکذب الله ورسوله) واتە بەپێی هۆشی خەڵکی قسەبکەن بەکەن ئایا دەتانەوێت قسەیەك بکەن وبەدەر لەسنوری هۆشو هزری خەڵك بێت لەدەر ئەنجامدا خواو پێغەمبەرەکەی بەدرۆبخەنەوە .

١٠.هەڵبژاردنی راسترین فەرمووده وەك(متفق علیه)ئیامی بوخاری وموسلیم یانهە ر تەنهابخاری یان موسلیم کەکەمترین پلەی ئەم فەرموودانە ئیامام موسلیمە کەلە م پەرتووکەدا هاتووە.

١١.هەڵبژاردنی واتاترین فەرموودە بێگومانلە هەردەروازەیەك چەندەها فەرمودە هەیە بەڵام واتاترینیانوگرنگترینیانم هێناوە.

١٢.هەڵبژاردنی فەرموودەکان بەبێ ئەوەی هیچدووبارە بونەوەیکی تیادا بێت.

١٣. ،ئەمەشبۆخزمەتکردنیخوێنەرە بۆئەوەیکاتی بۆبگێڕمەوەوبتوانێت بەئاسانترین شێوە لەفەرموودەکانتێبگات سەری لێنەشێوێنێ.

١٤.هەڵبژاردنی ئەومودانەی کەخۆمان زۆر لەرۆژانەی پێویستمان پێیەتی ودووبارە دەبێتەوە.

**تێبینی** : //
**زۆر بە خۆشحاڵیەوە رەخنەو پێشنیارەکان لە بەرچاو دەگرین لەم رێگایانەی خوارەوە:**

**ژمارەی مۆبایل** ( ٤٨٢٧٠٥٣ )
**ئیمێل** nusar-abubaker tofeeq @yahoo.com

**یان بەنامە بدرێت بەدەست هەریەك لەوپەرتووكخانانەی كەنەمپەرتووكەی لێدەفرۆشرێت** ----



# سوپاس و پێزانین

- بۆ گەردیلەی چاومان پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت .
- بۆ هەر کەسێ چاوی بەهەڵەیەك بکەوێت لەم نووسینە کەمەم بکەڕێت، بەدوای پاساودا بۆم چونکە بەس خودا تەواوەو بێ کەم و کورتییە .
- بۆ ئەو کەسە ئەگەر تێبینی بنیات نەری هەیە لەهەر هەڵەیەك ئاگادارمان بکاتەوە پێی دەزانم و چاوی بەووردی پیادا دەڕوانمەوە.
- بۆ ئەو کەسەی هەوڵ دەدات ئەم نووسینە کەمەو نووسینی تر بڵاو بکاتەوە بەهەمووو ماڵێکدا لەکوردستانی خۆشەویستدا.
- بۆ ئەو کەسەی ئەگەر بڵاوی کاتەوە چ بەلایەنی فرۆشتنی یان بەلایەنی بەخشینی لەناو خەڵکاندا .
- بۆ ئەو کەسەی هەولی بڵاو کردنەوەی دەدات پەیوەندیم پێوە بکات ئەوەی کەم و زیادی بۆ چاپی داهاتوو بکەین، کاری یاسایش بۆ ئاسان بکەم.

نووسەر

م/ ابوبکر توفیق

# (پێشەکی چاپی یەکەم)

سوپاس بۆ خوای گەورە ، لەپاشان سلاو لە گیانی پێغەمبەر ﷺ و خێزان و یارانی .
لە پاشاندا :

**وەك وەفادارییەك بە دیاری بۆهەرکورد زمانێك لەمانگی رەمەزانی ئەم سا ڵدا نز یکەی چل فەرموودەم هەڵبژارد وەك چەپکەگوڵێك..**

**دەستەگوڵێك پێشکەشیان بکەم بەهەرموسوڵمانێك..**

**بەهیوای ئەوەی خودای گەورە لێمان وەرگرێت بە وپەڕی جوانییەوە..**

**داواله موسوڵمانان دەکەم بێ بەشمان نەکەن لە نزاو پاڕانەوە وسکاڵانووزانەوەی خۆیان..**

**خودای گەورە لەهەموولایەك وەرگێرگرێ..**

**ئامین..ئامین.. ئامین.**

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی چاپی دووەم

*لەپاش کەوتنە بازاری پەرتووکی گوڵبژێری ((الاحاد يث القد سية))بەناوی هەڵبژاردن لە فەرموودە پیرۆزەکان و ئەو سوودەگەورەو بەرچاوەی کەمن چاوەڕوان بووم بە ئومێدی خودای گەورە. سوود ی زۆرگەورە و بەرچاوبە ئاشقان وتامەزۆیانی فەرموودەیی بکات ئەمەشم بەچاوی خۆم دی خەڵکان زۆرو پڕ بەدڵ تام وچێژی تایبەتیان لێکرد. ئاگادا ریش کرامەوە کەکراوەتە وانە لەهەندێك لەمزگەوتەکاندا ئەمەش چاکەیەکی زۆر گەورە و بێژماری خودای گەورەیە بە سەرمەوە.*

***چونکە ئەو پەرتووکە ئەم تایبەت مەندیانەی هەبوو :***

***یەکەم*** *: راسترین فەرموودەی هەڵبژاردووە- - -*

***دووەم****: ئامازەی سەرچاوەکان کردووە- - -*

***سێیەم*** *: لێکدانەوەی زاناکانی زۆر بەدەست پاکیەوە هێناوە- - -*

***چوارەم*** *: راسترین بۆچوونی هەڵبژاردووە بە بەڵگەوە - - -*

***پێنجەم*** *: بۆچوونی لایەنی تریشی روون کردووەتەوە وپەرج دانەوەیان ئەگەر پێچەوانەی راو بۆچوو نی ئەهلی( سوونەو جەماعەت)بێت- - -*

***شەشەم*** *:زیاتر لەچوارسەد سوودو وانەی هەڵجنراوە . کە تا ئێستا لەهیچ پەرتووکێکیتر دانیە. هەر نبێ تادەرچوونی ئەو پەرتووکە...*

## پرۆژەی مەوسووعەو کۆکراوەی فەرمودەی قودسی ..

پرۆژەی مەوسووعەو کۆکراوەی فەرمودەی قودسی .. پرۆژەیەکی هەرە گەورەیە هەقی خۆیەتی چەندەها داموو دەزگا هەستێت بەتاوتوێکردن و هەڵبژاردن و پوختەکردن و بەکوردی کردنی ئەم فەرمووده قودسیانە..

**لەبەر ئەم چەند خاڵانە:**

**خاڵی یەکەم:** دەتوانرێت بەچەند بەرگێك تێکڕای فەرموودەکانی قودسی کۆبکرێنەوە..لەکاتێکا لەوانەیە بەسەدەها بەرگ تێکڕای فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کۆنەبێتەوە.

**خاڵی دووەم:** پێگەی فەرموودەی قودسی لەناو دڵ و دەروونی هەرموسوڵمانێکدا، کەپێگەیەکی یەکجار پڕ بەهاو قورس و سەنگین و بەرزو گەورەی هەیە.

**خاڵی سێیەم:** هەتا ئەو رادەیەی کەفەرموودەی قودسی بەرانبەر قورئان ناودەبرێت، بۆنموونە: لەکاتی گێڕانەوەی و باسکردنی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو ،خودای گەورە دەفەرموێت، کەواتە فەرموودەکەی دەدایەوە پاڵ خودای گەورە.

**خاڵی چوارەم:** واتاداریی و پڕبەهایی وشەکانی فەرمودەی قودسی کەبەکەمترین رستە واتایەکی زۆر گەورە و زل دەدات بەدەستەوە.

**خاڵی پێنجەم :** گرنگترین کارێك کە لە و رێگەیەوە بتوانرێت خودای گەورەی پێرازی بکرێت بەهۆی تێگەیشتن و کارپێکردنە بەفەرمووده قودسیەکان .

**خاڵی شەشەم:** ئەوەی زۆر پێویستەو لە پێش هەموو شتێکیترەوەیە ، ئەوەیە کە خودای گەورە لەقورئاندا یان لەفەرموودەکانی قودسیدا باسی لێوە کردووە و لەپاشاندا بەفەرموودەدەی پێغەمبە ر(صلی الله علیه وسلم ) زیاتر وزیاتر بۆ ئێمە روونکراوەتەوە.

**خاڵی حەوتەم:** لەبەر ئەمەۆیانە منیش لەپاش پشتیوانی بەخودای گەورە چەند رێگەیەکم گرتووەتە بەر بۆ ئەوەی کەبتوانم خزمەتێك بە ئایین و گەل و وڵاتم بکەم...

**بەم شێوەیە ی خوارەوە:**

**شێوەی یەکەم:** هەڵبژاردنی گرنگترین فەرموودەی قودسی لەسەدان فەموودەکانیتر.

**شێوەی دووەم:** راسترین فەرموودەم هێناوە لەهەزارەها بەناو کراو بە فەرموودەو لەرستیدا فەرموودەش لێی دوورە و بەریە.

**شێوەی سێیەم:** راڤەکردن و لێکدانەوەی زانا پسپۆرەکانی ئەم بوارەم باسکردووە.

**شێوەی چوارەم:** هەڵێنجانی زۆرترین و گرنگترین رێنمایی و وانە و سوود و قازانج و پەند و ئامۆژگاری، کەزۆر پێویستە بۆ باری ژیانی رۆژانەی خۆمان و هەموورموسوڵمانێك چونکە چاو روونی دەکات لەهەڵسو کەوتی لەگەڵ خودای گەورەی خۆی وپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و ئایین وتێکراو سەرجەم موسوڵمانان و خزمان و دۆستانی ، تەنانەت لەگەڵ دووژمنانیشی لەشەیتان وناحەزانیشی.

**شێوەی پێنجەم:** دەتوانم بڵێم ئەم هەڵجنینانە و رێنمایی و دەرس و وانەو پەند و سود و قازانج وئامۆژگاریەکانی بەسەدەها رێنمایی لەخۆگرتووەو هەژمار کردووە.

بۆیە دەتوانم بڵێم: ئەم پەرتووكە یەكەم پەرتووكە تا رۆژی ئەمڕۆ لەسەر ئاستی هەموو ناوچەكە لەوانەشە بتوانم بڵێم لەسەر ئاستی هەموو جیهانیش، لەم جۆرە رێ و شوێن گرتنە بەر و پابەند بوونە.(( لەپێش هەموو شتێك خودای گەورە رێنمووی و چاودێری تایبەتی كردووم بۆ ئەم كارە گەورەو پیرۆزە سوپاس و ستایشی بێپایانی دەكەم بەزمان و بەدڵ..من هەرگیز ناتوانم گووزارشت لە سوپاسی تەواوی خودای گەورە بكەم لە سەرئەو هەموو بە هەرەو چاكانەی ئەو بەسەرمەوە)) كە رێنوویی منی كردوە لەم جۆرە خزمەتكردنە بۆ فەرموودەكانی خۆی بۆیە، بەیەكەم پەرتووك دەژمێردرێت لەمبوارەدا.. خۆ ئەگەر هەرنەبێ ئێمە هێشتا نەماند یوەا..

**شێوەی شەشەم:** ئەم بەرگە یەكەم بەرگ دەبێت دەخرێتە ماڵانی موسوڵمانانەوە، لەكاتێكا چاوەڕوانی بەرگی دووەمین بەیارمەتیدان خودای گەورە..

**شێوەی حەوتەم:** هیچ فەرمودەیەكم دووبارە نەكردوتەوە. بەئەمەش خۆی لە خۆیدا خوێنەری بەرێز... **لەزۆر ماندووبوون وكەڕان دەپارێزێ:**

**لەوانە:**

**ماندوو بوونی یەكەم:** لەسەرئێشەی تێكەڵكردنی فەرموودەی راست لە ئەوانەی نانراون فەرموودە و لەهەمانكاتدا راستنین!! .

**ماندوو بوونی دووەم:** پەرش وبلاّوی و فراوانی قووڵی فەمووودەكان لەناو سەرجەم پەرتووكەكانی فەرموودەییدا.

**ماندوو بوونی سێیەم:** واتاكردنی بەكورترین شێوە دراوە بەدەستەتەوە .

***ماندوو بوونی چوارەم:*** *هەڵبژاردنی واتاترینیان کۆکراوەترینیان لە فەرموودەکان.چونکە هەمان فەرمووده لە وانەیە بە زیاتر لە سەنەدێك ڕیوایەت کرابێت...هەر زاناو بەسەنەدی خۆیەوە...*

***ماندوو بوونی پێنجەم:*** *ئەم بەرگە و لەوانەیە بەرگی دووەمیش هەرو بەس تەنها فەمووده قودسیەکانە کە ((متفق علیە)) یان هەرنەبێت بوخاری یان مەسلیم بهێنم بەجیاگێڕوایەتیەوە یان موسلیم بەجیا لەبوخاری گێڕاویەتیەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بارسەنگی و پڕبەهایی و دڵنیایی دەدات بەخوێنەری بەرێز لەم فەموودانەدا.*

***جابۆئەم مەبەستانە دوا لەسەرجەم موسوڵمان دەکەم کە بە هەموو شێوەیەك بشتگیریم بکەن بۆ هێنانە دی و سەرخستنی ئەمپڕۆژە گەورەیە... خودای گەورە هاریکاری ئەو کەسە یە کە ئایینی خودای گەورە سەردەخات..***

***براتان خزمەتکاری فەرمموودەکان بەم پڕۆژەیە:***
***پڕۆژەی کوڵبژێرو پوختەو مەوسووعەو کۆکراوەبەکوردیکردنی تێکڕا فەرمودەی قودسی.***

**م: ابوبکر**

**٢٩ ی صفر/ربیع الاول١٤٣٠کۆچی**
**٥ ی ڕێبەندان/ ڕەشەمێی ٢٧٠٨ کوردی**
**٢٤ ی شباط ٢٠٠٩ زایینی**

## ( الترهيب من الشرك باللّه تعالى )

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ:( يلقى إبراهيم أباه آزر يوم القيامة ، وعلى وجه آزر قترة و غبرة ، فيقول له إبراهيم : ألم أقل لك لا تعصني ؟فيقول له أبوه : فاليوم لا أعصيك . فيقول إبراهيم : يارب إنك وعدتني أن لا تخزيني يوم يبعثون وأي خزي من أبي الآبعد ؟فيقول الله : إني حرمت الجنة على الكافرين ثم يقال إبراهيم : ماتحت رجليل ؟فينظر فإذا هو بذيخ متلطخ فيؤخذ بقوائمه فيلقى في النار ). (١)

### دەروازە: **هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خودای گەورە لێخۆش بوونی نیە**

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : قال رسول الله ﷺ:( يلقى إبراهيم أباه آزر يوم القيامة **لە باوکی هورەیرەوە "خودای لێ ڕازی بێت" دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا دەگاتە باوکی کە ناوی ئازەرە،** وعلى وجه آزر قترة و غبرة **وا سەیر دەکات ڕوو ودەم وچاوی ڕەش داگەڕاوە ولەتەپوو تۆزدا نووقم بووە ،** فيقول له إبراهيم : ألم أقل لك لا تعصني **بۆیە ئیبراهیم ﷺ پێی دەڵێت ئەی باوکە پێم نەوتی بۆ فەرمانی خودا سەرپێچی من مەکە.** فيقول له أبوه : فاليوم لا أعصيك **باوکی لە وەڵامدا دەڵێت ئەمڕۆ بە قسەت دەکەم،** فيقول إبراهيم : يارب إنك وعدتني أن لا تحزيني يوم يبعثون **یەکسەر ئیبراهیم لەلای خودای گەورە بۆباوکی پاڕانەوە دەکات ودەفەرمووێت: ئەی خودایە تۆ سۆز وپەیمانت بە من داوە کە من سەر شۆڕ نەکەیت لەو ڕۆژەی کە خەڵك زیندوو دەکرێنەوە،**

==========================================

(١)أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٣٣٥٠ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ٤٢٠٥ ) من طريق عبد الحميد عن ابن أبي ذئب عن سعد المقبري عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه النسائي في تفسيره برقم ( ٣٩٥ ) من طريق إبراهيم بن طهمان عن محمد بن عبدالرحمن عن سعيد بن أبي سعيد المقبري عن أبيه عن أبي هريرة رضي الله عنه به .

وأي خزي من أبي الآبعد ؟ ئەی چ سەر شۆڕییەك لەوە زیاترە کە باوکم لە دۆزەخ بێت و لەمن دوور بێت؟ فیقول الله : إني حرمت الجنة على الكافرين خودای گەورە دەفەرموێت: من بەهەشتم حەرام وقەدەغە کردووە لەسەر کافرەکان. ثم يقال إبراهيم : ماتحت رجليك؟ لە پاشاندا بە ئیبراهیم دەوترێت: بۆ ژێر پێی خۆت بڕوانە بزانە چی لە ژێر پێی تۆ دایە؟ فينظر فإذا هو بذيخ متلطخ فيؤخذ بقوائمه فيلقى في النار ). بۆیە ئەویش سەیر دەکات، واسەیر دەکات کەمتیارێکە داپۆشرا وە بەخوێنەوە، هەر چوار پەلی دەگیرێت وفڕێی دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە)).

## لێکدانەوەی زاناکان

ئیبراهیم ﷺ فەرمووی {واي خزي اخزىمن ابى الا بعد} چی هەیە لەوە خراپتر بێت کە باوکم لێ دوور بێت .

بۆیە ((لەپاشاندا بە ئیبراهیم دەفەرموێت: ئەی ئیبراهیم سەیری ژێر پێی خۆت بکە، ئەم پرسیارە بۆ ئەوەیە سەرنجی ئیبراهیم بۆ لای باوکی ئازەر ڕابکێشی، کاتێك سەیر دەکات "زیخ"ێك دەبینێ "ضبع" ئاژەڵێکە(کەمتیارە)مووی زۆر وپڕە خوێناوی بووە یان بە پیس وپۆخڵی کە لێی دەردەچێ بۆیە بەهەر چوار پەلی هەڵدەگیرێ وفڕە دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ.

لەلای ئیبن مونزیر هاتووە: (کاتێك ئەمەی لێ دەبینێ تەبریەی لێ دەکات، حیکمەتیش لەوەی کە دەکرێ بە کەمتیار، چونکە کەمتیار زۆر گێلە لە هەموو ئاژەڵێکی تر گێلترە، گێلیەکەی ئەوەیە سەرقاڵ دەبێت کە پێویستە ئاگادار بێت لێی.کاتێك "ئازەر" خۆی لە گێلی دا لە ئامۆژگاری کوڕەکەی کە هەموو خێرو بێرێکی بۆ باوکی دەویست. لە بەرئەوە(ئازەر)نوێنراو کرا بە (کەمتیار)تەبەر گوێنەگرتنی.

## گرنگترین رێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودە:

١. هاوەڵ پەیدا کردن بە هیچ شێوەیەك خودای گەورە سۆز ومیهرەبانی بۆی نابێت ولێخۆش بوونی نیە، ئەمەش بە تێگەیشتن لە دەقی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت:

﴿{إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء}٤٧﴾ السورة:النساء الاية( ٤٧ )

٢. هەر کردەوەیەکی چاك هەبێت مادەم هاوەڵ پەیدا کردنی تیادا بێت، خودا ئەو کارە چاکەی لێ وەرناگرێت، بەڵکو کارە چاکەکانیشی لێ پووچەڵ دەکاتەوە، ئەمەش دەقی ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿لئن اشركت ليحبطن عملك﴾سورەالزمر، واتە: ئەگەر هاوەڵ بۆ خودا پەیدا کردنت هەبێت ئەوا کردە چاکەکانت پووچەڵ دەکاتەوە.

٣. تەنانەت پێغەمبەرانیش ﷺ هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان پێ نەدراوە کە پاڕانەوە وتکا بۆ هاوەڵ پەیدا کاران بکەن، ئەگەر پێغەمبەران ﷺ لە دڵسۆزیدا بپاڕێنەوە بۆ هاوەڵ پەیدا کاران لەلای خودای گەورە، خودای گەورە تکاکانیانی لێ وەرنەگرتوون، وەك پاڕانەوەی ئەم سێ پێغەمبەرە ﷺ:

**یەکەم:** نووح پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە بۆ کوڕەکەی کە هاوەڵ پەیدا کار بوو بەوەی، ﴿وَنَادَى نُوحٌ رَّبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابُنِي مِنْ أَهْلِي﴾ السورة: هود ،الاية (٤٤)

واتە: ئەی خودایە تۆ سۆزت بە منداوە کە کەسانی من بپارێزی وسواری کەشتیەکەیان بکەم بۆ ئەوەی لە خنکان بپارێزرێن... ئەی خودایە وەعدو سۆزی تۆ هەقوو تەواوە، خودایش لە وەڵامدا فەرمووی: ﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ﴾ السورة: هودالاية (٤٤)واتە: ئەو لەکەس وکاری تۆ نیە مەبەست لەکەس وکاری نووح شوێن کەوتوانیەتی.. بەڵام کوڕەکەی کاری نابەجێ یە مەبەست بە کاری نابەجی هاوەڵ پەیدا کردنە بۆ خودای گەورە.

**دووەم:** كاتێك پێغەمبەری خۆمان ﷺ داوای تكاو شەفاعەتی بۆ مامی كرد "ئەبو تالیب" تەنها سزای لەسەر سووك كرا بەوەی {یتنعل بنعلین من نار یغلی منها دماغە} (فەرموودەكە راست وصەحیحە). واتە: دوو پێلاوی ئاگرین لەهەردوو پێیەكانی دەكرێت وكەللە سەری لەگەڵی دەكوڵێت.

**سێیەم:** ئەم فەرمووده كە باس لە پاڕانەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر بۆ باوكی ﷺدەكات.
**چوارەم:** پیغەمبەری خۆمان ﷺ بە كچە خۆشەویستەكەی دەفەرمووێت: {لا اغنی عنك من الله شیئا}متفق علیە. واتە: هیچ شتێكم پێ ناكرێت بۆ تۆ لە لای خودای گەورە ئەگەر تۆ خۆت چاكە كار نەبیت.

٤)باوەڕداران وپێغەمبەرانﷺ ، كافرەكان وبێ باوەڕەكان دەبینن لە ناو دۆزەخدا لە ج ناخۆشی وناستەنگیكدا دەژین وەك قورئان دەفەرمووێت: ﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُواْ مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ {٣٤}﴾ سورة المطففین الایة(٣٤)

واتە: ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە باوەڕداران بە بێ باوەڕەكان پێ دەكەنن وگاڵتەیان پێ دەكەنەوە، چونكە لە ڕۆژانی دونیا كافرەكان وبێ باوەڕەكان گاڵتە وتوانجیان لە موسڵمانان دەدا — بەوەی كە دەیان وت دوا كەوتوون - لەم سەردەمە ناژین - گێل وگەوێڵن - چێژیان لە ژیان نەكردووە- یان بەوەی كە شانازیان بەسەر دا كردوون وخۆیان بە گەورەتر دادەنا لە موسڵمان بەهۆی دەوڵەمەندیان بە پارەی حەڕام وقەدەغە كراوەكان.

٥) دونیا جێی گوێڕایەڵی وبەجێ هێنانی فەرمانەكانی خودا وپێغەمبەری خودایە ﷺ، بەڵام دوا ڕۆژ تەنها جێی تۆڵەیە لە كافرەكان وبێ باوەڕەكان لە هەمان كاتدا بۆ موسڵمانان شوێنی پاداشتە، ئەو كەسانەی كەوا باوەڕیان بە پێغەمبەری خۆمان هێناوە نەوەد ونۆ میهرەبانی خودای گەورە لەو ڕۆژەدا دەیان گرێتەوە، ئەمەش واتای فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەرە ﷺ :{ان لله مأة رحمة فی الدنیا-یرحم بە العباد بعضهم بعضاً والدواب وادخر تسعة وتسعون فی الاخرة}اوكما قال فەرموودەكە راست وصەحیحە.

واتە: خودای گەورەر سۆز ومیهرەبانی یەكەی سەد بەشە تەنها یەك بەشی خستوەتە دونیاوە ونەوەدو نۆ بەشی لەلای خۆی بۆ ڕۆژی دوایی هەڵگرتووە.

٦) بێ باوەڕەكان تەنانەت لە دوا ڕۆژیشدا لە مشتوومڕی خۆیان ناكەون.

٧) خودای گەورە هەقی ئەومیان پێ دەدات كە قسە ومشتوو مڕی خۆیان بكەن، بەڵام وەڵامیان دەدرێتەوە.

8) كافرەكان دەخرێنە سەر وێنەی ئاژەڵ وئینجا فڕی دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەمەش واتای فەرموودەی خودایە كە دەفەرمووێت: ﴿انْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ سورة الفرقان الاية (٤٤) واتە: ئەوان وەك ئاژەڵەكانن لەوەی كە لە فەرمانبەری خودای گەورە وحەڵاڵ وحەرام زانینیان بێ ئاگان.

٩) ئەمەش بۆ ئەومیە زیاتر هەست بە ئازاری دەروونی وسوكایەتی وریسواكردن وبێ ڕێزیان دەربخات.

١٠) ئەمەش پێچەوانەی ئەو ئایەتە نیە كە دەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾سورة عم،الاية (٤٠ ) واتە: كافرەكان دەڵێن خۆزگە من بە گڵ بوومایە،.

ڕاڤیاران دەڵێن كافرەكان ئەم خۆزگە دەخوازن كاتێك خودای گەورە تۆڵەی ئاژەڵە بێ هێزەكان لە بەهێزەكان دەكاتەوە، ولە پاشاندا فەرمانیان بەسەردا دەدرێت یەكسەر دەبنەوە بە گڵ... چونكە كافرەكان هەر دەم لە ئازاردا دەمێننەوە، ئەوانیش خۆزگە دەخوازن كە وەك ئاژەڵەكان ببنەوە بە گڵ و لە ئازار وئەشكەنجەی دۆزەخ ودەستی فریشتەكان ڕزگاریان بێت.

١١)گۆڕینەوەی دایەلۆگ(گفت وگۆ)(حیوار) لە نێوان موسڵمان وكافردا هەیە لە ڕۆژی قیامەت.

١٢) ئەمەش بۆ ئەوەیە هەر یەکە وبۆ ئەویتری بسەلمێنێ کەکامیان لەسەر هەقبوون.

١٣) دیسانەوە بۆ ئەوەشە هەریەکە وبە ئەویتر بڵێت ئێمە گەیشتین بە سۆز وپەیمانەکانی خودا کە پێی داوین، ئایا ئێوەش گەیشتن بە سۆزی سزا وئازار وئەشکەنجە بۆتان، وەك دەقی قۆرئان کە دەفەرموێت، ﴿أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا﴾ .سورة والاعراف الاية (٤٤)

١٤) پەشیمان بوونەوە لە بەد کاری خراپە کاری هەیە لە ڕۆژی قیامەت وەك دەقی قورئان دەفەرموێت، ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ سَبِيلًا﴾، سورة الايةَ( ٢٦)

کافرەکان لەسەر بێ فەرمانی خودای گەورە هەردوو دەستی خۆیان دەگەزن ودەڵێن خۆزگە فلان بەد کارمان نەکردبایە بە دۆست وبرادەری خۆمان.

١٥) بەلآم ئەو ڕۆژە هیچ سوودێکیان پێ ناگات. ﴿ولات حين مندم﴾.

**ما فی خودای گەورەچیە؟ مافی بەندەکانی خودای چیە؟**

مافیی خودای گەورە لەسەربەندەکانی خۆی ئەوەیە کەهیچ هاوەڵ بۆ بۆخودای گەورە پەیدا نەکەن ،مافی بەندەکانی خودای گەورەش بەسەر خوداوە ئەوەیە کەهیچ سزایەکیان نەدات مادەم هاوەڵیان بۆ پەیدا نەکردووە.

# ( من علامات الساعـة طلوع الشمس من مغربها )

**أن النبي ﷺ قال : (( أتدرون أين تذهب الشمس )) ؟قالوا : الله ورسوله أعلم . قال : ( إن هذه تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش ، فتخر ساجدة فلا تزال كذلك حتى يقال لها : ارتفعي ، ارجعي من حيث جئت ، فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ، ثم تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش ، فتخر ساجدة ، فلا تزال كذالك حتى يقال لها : ارتفعي ، ارجعي من حيث جئت ، فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ، ثم تجري حتى تنتهي إلى مستقلرها تحت العرش ، فتخر ساجدة ، ولا تزال كذالك حتى يقال لها : ارتفعي وارجعي من حيث جئت ، فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ، ثم تجري لا يستنكر الناس منها شيئاً حتى تنتهي إلى مستقرها ذاك تحت العرش ، فيقال لها : ارتفعي اصبحي طالعة من مغربك ، فتصبح طالعة من مغربها** (١)

## لەنیشانەی گەورەی رۆژی كۆتاییهاتنی ژیان لەسەر ئەم دوونیایە

پێغەمبەر ﷺفەرمووی ئایا ئێوە دەزانن ئەو رۆژە بۆكوێدەچێ؟وتیان خوداو پێغەمبەرەكەی دەزانن فەرمووی ئەم خۆرە دەڕوات وئاوادەبێت هەتا دەگاتە ئەو جێگەی كەخودای گەورە بۆی داناوە لەژێر عەرشی خودای گەورە ئالەوێدا كونووش دەبات ئەم شێوازە هەرهەموو رۆژێك دووبارە دەبێتەوە لەپاشاندا دەڕوات وئاوادەبێت هەتا دەگاتە ئەو جێگەی كەخودای گەورە بۆی داناوە لەژێر عەرشی خودای گەورە ئالەوێدا كونووش دەبات ئەم شێوازە هەرهەموو رۆژێك دووبارە دەبێتەوە هەتا پێی دەووترێت بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی كەلێوەی هاتووی بۆیە ئەویش دەگەڕێتەوە ......هەڵدێتەوە لە و شوێنەی كەلێی ئاوابووە بۆیە لەو شوێنەی كەخۆر ئاواوە دووبارە هەڵدێتەوە) ئالەو كاتەدا هیچ دەروونێك باوەڕداری لێپەسەند ناكرێت ئەگەر پێشتر خۆی باوەڕی نەهێنابوبێتی))

---

(١) واخرجه البخارى في صحيحه بالارقام( ٧٤٢٤،٤٨٠٢،٣١٩٩ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ١٥٩)( ٢٥٠ )والترمذى في سننه برقم ( ٢١٨٦،٣٢٢٧ )والنسائى في سننه الكبرى برقم ( ١١٤٣٠ )واحمدفي السند برقم ٢١٣٥٢،٢١٥٤١ )وابن حبان في صحيحه برقم( ٦١٥٤ )من طرق عن الاعمشعن ابر اهيم التيمى بعه بهذا اللفظ الذى رويته )

# لێكدانەوەی زاناكان

## باب من علامات الساعة

ئەم شێوە پرسیاركردنە بۆ سەرنج ڕاكێشانە ودەرئەنجام پێ وتنە.

لەوانەیە پرسیار بكرێت چۆن خۆر كوڕنووش بردن وسەر لەسەر زەوی دەدانێت كە ناو چاوانی نیە؟ كوڕنوش بردنی خۆر بەدەستی خودا دەبێت ئەمە هیچ لادانێكی تێدا نیە وەك ئەروز وئاسمان دەڵێت ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ {١١}﴾ فصلت ئێمە فەرمانی تۆ بەجێ دەهێنین بە حەز وخۆشیەوە.

ئەم كڕنووش بردنە وشێوازەكەی بەسووجدا بەرانەوە كاتێك ئاوا وخوار دەبێتەوە وەك چۆن مرۆڤ بۆ سوجدا خوار دەبێت وسەری لەسەر زەوی دادەنێت.

ئەگەر پرسیار بكرێت خۆر ئاوا دەبێت لەسەر زەوی بەم شێوەیە تێ دەگەین لە فەرموودەكە ، بەلأم لە قورئاندا دەفەرمووێت خۆر ئاوا دەبێت لەسەر چاوگەیەكی گەرم ﴿تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾سورە الكهف ئەمە لە كوێوە وعەرش لە كوێ؟ منیش دەڵم حەوت گۆی زەوی وەك چەقی دەسارِ وایە عەرشی خودای گەورە لە گەورەی یەكەی وەك هارِمەكە وایە بەبەرانبەر چەقی دەسارِمكە [ولله المثل الاعلى] .

خودا وسیفەتە گەورەكانی زۆر لەوە گەورەترن كە ئێمە نموونەیان بۆ بهێننینەوە تەنها بۆ نزیك كردنەوەی هزری مرۆڤە، كەواتە خۆر هەر چۆن سەر نەوی بكات لەژێر عەرشی خودای گەورە دەرناچێت.ئەو ئایەتەش كە دەفەرمووێت ﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ {٤٠}﴾ سورە یاسین الایە كە دەسوڕێن، ئەم سوڕانەوەش هیچ بەربەستێك نیە بۆ سوجدە بردن.

منیش دەڵێم كڕنوش وسوجدەی خۆر بەو شێوازەیە كە خودا خۆی دەزانێت ئێمە بە هۆش وهزر هەستی پێناكەین كە بتوانین لە شێواز وچۆنیەتیەكەی تێ بگەین.

﴿تستأذن﴾ داوای مۆڵەت ودەرفەت دانی دەكات ئەمەش ئەوەی تیادایە خاوەن هۆشە وتەكلیف كراوە لەلایەن خوداوە داوای مۆڵەتی هەڵبوون وئاوابوون دەكات.

## گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودە:

١. ئەم شێوە پرسیاركردنە بۆ ئەوەیە قوتابیان و خوێندكاران جوان سەرنجیان رابكێشرێت لەپاشاندا مامۆستاكە مەبەستەكەی خۆی بدات بەدەستەوە.

٢. كاتێك مرۆڤ وەڵامی پرسیارێك نەزانێت یەكسەر بێدەنگ بێت بۆ ئەوەی كەسێك كەوەڵامەكەی لەلایە قسە بكات ووەڵامەكە بدات بەدەستەوە و لێی وەرگرێت .

٣. لەكاتی خۆیدا كەپێغەمبەر(ﷺ) لەژیاندا مابو و دەكرا بووترێت خوداو پێغەمبەر دەزانن . بەڵام لەدوای وەفات وكۆچكردنی پێغەمبەر(ﷺ) دەبێت تەنها بووترێت خودا دەزانێت .

٤. ئەم شێوە كورنووش بردنەی خۆر تەنها خودا دەزانێت چۆنە ، بەڵام پێویستە مرۆڤ موسوڵمان باوەڕی پێبهێنێ ، باشێوەو وحاڵەتەكەیشی نەزانێت .چونكەتوانو هۆشی مرۆڤ هەر چەندە زیرەك و دانابێت هەرسنوور دارە هەست بەزۆر شتێك ناكات.ئەبێت لە لایەن نیگای خوداوە رێنمووبی بكرێت.

٥.تەنانەت خۆریش بەفەرمانی خودای گەورە هەڵدێت و ئاوادەبێت بۆیە هەتا ئەو كاتەی كە خودای گەورە فەرمانی گەڕانەوەی خۆر دەكات كەبگەڕێتەوە لە جێگەی ئاو ابوونیە هەڵبێتەوە ئەمەش نیشانەیەكی گەورەیە لەنیشانەكانی رۆژی دوایی وئالەو كاتەدا تەنانەت سەرجەم كافرانیش موسوڵمان دەبن بەڵام خودا ئیمان لەكەسێك وەرناگرێت كەلەوەو پێش بێباوەڕ بووبێت .

٦. ئەو كاتەی كەرۆژی قیامەت دێت دیاری نەكراوە بەڵام نیشانەی بۆ دیاری كراوە لەو نیشانانە هەڵهاتنەوەی خۆرە لە شوێنی ئاوابوونیەوە.

٧. جێی تایبەتی خۆر ژێر عەرشی خودای گەورەیە. هەردەم بۆ ئەوێ دەگەڕێتەوە ، دووبارە لەوێوە هەڵدێتەوە .

٨. مرۆڤی موسوڵمان هەردەم لە لەگەڕانەوەو تەوبەداکرندا بێت و ترسی خودای لەسەربێت ئەوەك نیشانەیەك لەنیشانەکانی رۆژی قیامەت هەڵبێ، ئەوکات پەشیمان بوونەوە هیچ دادی نادات . هەرنەبێ مرۆڤ نازانێ بەچی دەمرێت و کەی دەمرێت و لەکوێ دەمرێ ؟!، هەکەسێکیش مرد ئەوا حساب بکە قیامەتی لێهەستاوە چونکە دەرفەتی تەوبەکردن و گەڕانەوەی نابێت.

## مژدەیەکی خۆش پڕبەهاو سەنگین و بێوێنە؟!

هەر کەسێك بە دڵێکی راست و پڕ ئومێدەوە داوای بەهەشت بکات خودای گەورە پێی دەبەخشێت وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت (من سأل الله الجنة ثلاث مرات قالت الجنة: اللهم أدخله الجنة ومن استجار من النار ثلاث مرات قالت النار : اللهم أجره من النار)([1]) واتە ( هەر کەسێك سێ جار داوای بەهەشت بکات لە خودای گەورە بەهەشت هاوار دەکات و داوا لە خودای گەورە دەکات و کە بە بەهەشتی شاد بکات، هەر کەسێکیش سێ جار پەنای بە خودای گەورە بگرێت لە ئاگری دۆزەخ، ئاگری دۆزەخ هاوار دەکات ئەی خودایە پەنای بدە لە ئاگر دەپارێینەوە لە خودای گەورە بەهەشتمان بە بەش بکات و خۆشترین رۆژمان ئەو رۆژ بێت بە خودا شاد چاو لە نورو رووناکی خودا دەبێت.

[1] -صحيح رواه الترمذي (٢٥٧٢) كتاب صفة الجنة والنسائي (٥٥٢١) كتاب الاستعادة وابن ماجة (٤٣٤٠) كتاب الزهد واحمد (١١٧٦٠) وصححه الالباني في صحيح الجامع (٦٢٧٥).

## باب : ((خروج روح المؤمن وخروج روح الكافر))

**عن ابى هريرة (رضي الله عنه ) قال : ((اذا خرجت روح المؤمن تلقاها ملكان يصعدانها _قال حماد :فذكر من طيب ريحها وذكر المسك _قال : ويقول اهل السماء :روح طيبة جاءت من قبل الارض صلى الله عليك وعلى جسد كنت تعمرينه.فينطلقبه الى ربه عز وجل ثم يقول :انطلقوا به الى اخر الاجل:. قال((اذا خرجت روح الكافر تلقاها ملكان يصعدانها _قال حماد :فذكر من نتن ريحها وذكر لعنا _قال : ويقول اهل السماء :روح خبيثة جاءت من قبل الارض فيقال:انطلقوا به الى اخر الاجل)).قال ابو هريرة فرد رسل الله ( )ريطة كانت عليه على انفه هكذا. (1)**

## دەروازەی: دەرچوونی ڕۆحی موسڵمان وکافر وشێواز وچۆنیەتی حاڵی هەر یەك لە موسڵمان وکافر لەو کاتەدا

لە باوکی هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێ دەڵێت: ((کاتێك ڕۆحی باوەڕدار لە لاشەی دەردەچێت دوو فریشتە بەرەو ئاسمان پێش وازی لێدەکەن وبەرزی دەکەنەوە ، -حەمماد دەڵێت: باوکی هورەیرە باسی لە خۆشی بۆنی ئەو ڕۆحە کرد کە لە بۆنی میسك خۆشترە- ئەبوو هورەیرە دەڵێت: کەسانێ وا لە ئاسماندان وخۆیان ئامادە کردووە بۆ پێشوازی کردن لەم ڕۆحە دەڵێت: ڕۆحێکی چاك وخاوێن لە زەویەوە بەرە وئاسمان بە ڕێکەوتووە: خودا چاکەی بۆ بنووسێ وپلە وپایەی لەلای خۆی بەرز بکاتەوە، لەسەر ڕۆح ولاشەکەت کە تۆی تیایدا بوویت ئاوەدانت کرد بووەوە ئەی مرۆڤی باوەڕداری چاکەکار، ئینجا ئەو ڕۆحە وەردەگیرێت بەرە ولای خودای گەورە بەڕێ دەکرێت لە بە پاشاندا خودای گەورەی فەرمان دەدات کە ببرێت بۆ جێگەی تایبەتی خۆی لە بەرزەخدا هەتا دواین کات، واتە زیندوو بوونەوەی مرۆڤەکان بە تێکڕا..

---

**(1)اخرجه مسلم في صحيحه برقم :(٢٨٧٢)من طريق حماد بن زيد عن بديل عن عبدالله بن شفيق عن عن ابى هريره (رضي الله عنه )**

## لێكدانەوەی ئەم فەرمووده لەلایەن زانایانەوە

# گرنگترین رێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرمووده:

١. دەرچوونی رۆح لەلاشەو بەرز بوونەوەی بۆ ئاسمان وچوونە خزمەت خودای گەورە وگەڕانەوەی بۆ ژیانی بەرزەخ ئەمانە هەر هەموویان زیاد لەسنووری تواناكانی مرۆڤ وبەدەرن لە دەركی ئێمە "ما وراء الطبيعة" "میتافیزیقیان" پێ دەوترێت، مرۆڤ نابێت لە شێواز وچۆنیەتی یەكانی خۆی ماندوو بكات ، چونكە هەتا دواین مرۆڤ زانستی مرۆیی ئەزموونی وهەست پێكردوو لەم ئاستەدا هەر بە سنوور داری دەمێنێتەوە، ئەمەش ئەو مانای ئەو ئایەتەیە دەگەیەنێت كە خودا دەفەرموێت:

﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً {٨٥}﴾سورة الاسراء الاية ٨٥

. واتە: ئێوە زانستی زۆر كەمتان دەربارەی رۆح پێ دراوە. بەڵكو ئەم ئایەتە دەربارەی كەسانی خاوەن پەرتووكی ئاسمانی پێش ئیسلام هاتووە، بەلاَم لەسەر گشتێتی خۆی دەمێنێ مادەم بەڵگەیەكی تر نەبێت لەو گشتی یەتیەی دەربهێنێ، ئەمەش دەقی ئەو قاعیدە وبنچینە یاسایی یەی(اصول فقهیه) یە كەدەڵێت: (العموم يبقى على عمومه حتى يأتي دليل على خصوصيته) واتە: هەر گشتی یەك لە قورئان وسوننەتدا هاتبێت، لەسەر گشتیەتی خۆی دەمێنێ هەتا بەڵگەیەك دەبێت لەسەر تایبەتی كردنی ئەم گشتییەتە.[1](١)

٢. هەر فریشتە وكاری تایبەتی خۆی هەیە، ئەوەتا فریشتەی رۆح كێشان جیایە لە دوو فریشتەی وەرگرتنی رۆح وبەرەو ئاسمان بەرز كردنەوەی:

---

[1] بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم قاعیدە وبنچینە فیقهیە بگەڕێوە بۆ پەرتووكی (مبدأ التسير في الشريعة الاسلامية) لە دانراوی خۆمە بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەی ماستەر.

بەڵام خاڵەش دەتوانین چەند سوودێکی لێ وەرگرین لەوانە:

ا) هەر کەسەو کاری سپێراوی خۆی بەجێ بهێنێ .

ب) خۆی هەڵ نەقورتێنێ لەکارو باری خەڵکانی ترەوە.

**٣. هەر کەسەو فەمانی سەروی وەك بەڕێوەبەر یان مامۆستای یان کارمەندێکی کارگێڕی کە کارێکی پێ دەسپێرێت پێویستە بە جێی بهێنی لەوپەڕی تەواوی وتێر وتەسەلیدا تەنها لە دوو حاڵەتدا نەبێت:**

**یەکەم:** ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خودا وپێغەمبەر ﷺ تێدا بوو، یان بەرامبەر دروست کراوانی خودای گەورە ئازاردان وخراپەیەك بوو. بەڵگە بۆ یەکەم: {لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق} بڕوانە صحيح الجامع الصغيرىئەلبانی واتە: "هیچ فەرمانێك بەجێ نایەت کە فەرمانی خودای تیادا بشکێت".

بەڵگە بۆ بڕگەی دووەم: لە یەکەم خاڵدا: {لا ضرر ولا ضرار} تخريجه: حسن، سنن ترمذي. واتە: "نە زەرەر و زیان بەخش بە بۆ خۆت نە بۆ خەڵکی"

**دووەم:** ئەگەر ئەو کات لەسەرووی توانای ئەو کەسەوە بێت کە فەرمانی پێ دراوە پێی هەستێ.

بەڵگە بۆ خاڵی دووەم بڕگەی یەکەم: قاعیدەیەی اصولیە دەڵێت:{لا تكلف فوق الطاقة} واتە: "هیچ فەرمانێك ناکرێت ئەگەر لەسەرەوی توانای مرۆڤەوە بێت" قاعیدەیەکی اصولی یە کە لە چەندەها ئایەت وفەرموودەوە وەرگیراوە وەك ئایەتی

﴿{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا} ٢٨٥﴾

لە فەرموودە {لا تكلفهم بما لا يطيقون}اخرجه: مالك وهو حسن.

واتە فەرمان بە سەر کرێکار وفەرمانبەرەکاندا مەدەن کە لەسەرەوی توانای ئەوانەوە بێت، ئەگەر فەرمانی ئەوەتان پێ کردن لەسەرووی توانای خۆیانەوە کاریان پێ بکەن، ئەوە ئێوە {فاعينوهم} یارمەتی وکۆمەکیان بکەن.

بەڵگە بۆ بڕگەی دووەم: کە شارەزا نەبێت ئەوەیە[لاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً (٣٦)]سورة الاسراء الاية ٣٦

تۆ هیچ شتێك نەڵێت كە زانستت لێی نەبێت، بەهەمان شێوەیە مرۆڤ نابێت كارێك بكات كە نەزان بێت تیایدا (**تداوو فان الله لم ينزل داء الا وانزل له شفاء علمه من علمه وجهله من جهله**)**صحيح الجامع الصغير**

چونكە زیان دەگەیەنێ زیاتر لە سوود ئەمەش قەدەغەیە {لا ضرر ولا ضرار} تخريجه: حسن، سنن ترمذي.

ج. رێز گرتنی لە خۆ گەورەتر چ مامۆستا بێت یان بەڕێوەبەر بێت، یان هەر پۆستێكی تری كارگێڕی هەبێت.

د. دەبێت ئەوانەی كە بەرپرسن بەزەییان بەوانەی كە لە ژێر دەست وئیدارەیاندان.

هیچ فریشتەیەك زانایی زانستی غەیبی نیە بۆیە پرسیار دەكەن ئەمەش گشتیە هیچ كەس لە عیلمی غەیب نازانێت بە هەر ناوێكەوە بێت[قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَأَيَّانَ يُبْعَثُونَ {٦٥} سورة النمل الاية

٣. پێویستە مرۆڤ ئەگەر شتێك نەزانێت پرسیار بكات.

٤. ئەگەر شتێك بزانێت وپرسیاری لێ بكرێت نابێت زانست بشارێتەوە.

٥. بە پێی پێویست زانست بدرێت.

٦. بە پێی پێویست وپەیوەندی بە تۆوە پرسیار دەكەیت.

٧. ڕۆحی باوەڕدار بەرز دەكرێتەوە بۆ ئاسمان.

٨. **ڕۆحی كافر شۆڕ دەكرێتەوە بۆ خوار بە ناخی زەویدا دەبرێت، بەڵگە بێجگە لەم فەرموودەیە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرە لەوانە :**

ا. {من ظلم شبراً من ارض طوقه الله في سبع ارضين} رواه مسلم. واتە: هەر كەسێك بستێك زەوی داگیر بكات خودا بە حەوت تەبەقەی زەویدا دەیباتە خوارەوە.

ب. یان فەرموودە هاتووە :

(كان فيمن قبلكم رجليمشي يتبخترفي الارض فطوقة الله في سبع ارضين ....الى يوم القيامة )بروانه رياض الصالحين باب الكبر

( باس لە چیرۆكی كابرایەكی خۆ بە گەورەزان دەكات، كە خودای گەورە هەتا ڕۆژی قیامەت بۆ بن زەوی هەردای دەچۆڕێنتە خوارەوە.

٩. موسڵمان وباوەڕداری بەکردەوەی چاك بۆنی ڕۆحی خۆشتر دەبێت لە بۆنی میسك وهەر گوڵاوێکیتر.

١٠. کافر وبێ باوەڕ بۆنی ناخۆشترە ئەگەر هەر بۆنێکی پێدا کرا بێت.

١١. فریشتەکانی ئاسمان بۆ پێشوازی کردنی ڕۆحەکان، چ موسڵمان بێت یان کافر لە ئامادە باشیدان.

١٢. دوعا وپاڕانەوەی ئەو فریشتانە بۆبەرز کردنەوەی پلە وپایە وڕازیبوون ومیهرەبانی خودای گەورە بۆ موسڵمانان.

١٣. دوعا لێ کردنی فریشتەکان بۆ ئەو کافرانەی کە بە کافری دەمرن.

١٤. ئەم دوعایانەش لە لای خودا گیرا وپەسندە.

١٥. ئەم دوعایە دوو بەشە: بۆ لایەنی ڕۆحی وجەستەی یە.

١٦. کە ڕۆح بەرز دەبێتەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە، ئینجا خودای گەورە فەرمانی ڕەزامەندی خۆی دەدات..

١٧. فەرمان دەدات ئەو ڕۆحە لە بەرزەخدا لە خۆشیدا بێت یان لە ناخۆشیدا هەتا دواین مرۆڤ دەمرێت وزیندوو بوونەوەی سەرتا سەری هەموو مرۆڤەکان دەبێت.

١٨. کافر وبێ باوەڕیش لەناو ژیانی بەرزەخدا ئازار وئەشکەنجە دەخۆن.

١٩. ئەم جۆرە ژیانەش تایبەتە بە مەرحەلەیەك لە تەمەنی مرۆڤ کە بەسەریدا دێت وەك سەرجەم مەرحەلەکانی تری ژیان ومردن وبەهەشت ودۆزەخ.

٢٠. باوەڕدار لە ژیانی بەرزەخدا هەست بە خۆشی بەهەشت دەکات...

**کەی رۆژی قیامەت هەڵدەستێ؟! .. ئەوە گرنگنیە کەی رۆژی قیامەت هەڵدەستێ بەئەندازەی ئەوەی کە ئێمە هەریەك لەئاستی خۆی چی بۆ ئەو رۆژە ئامادەکردووە چونکە هەرکەسمرد ئەوەقیامەتی لێهەستاوە؟!!!..**

******************************

**************

# ( فتنة الدجال )

عن النواس بن سمعان رضي الله عنه قال :(( ذكر رسول الله ﷺ الدجال ذات غداة فخفض فيه ورفع حتى ظنناه في طائفة النخل فقال :( غير الدجال اخوفني عليكم ، ان يخرج وأنا فيكم فانا حجيجه دونكم ، وان يخرج ولست فيكم فامرؤ حجيج نفسه والله خليفتي على كل مسلم ، انه شاب قطط عينه طافئة كاني اشبهه بعبد العزي بن قطن فمن ادركه منكم فليقرأ عليه فواتح سورة الكهف ، انه خارج خلة بين الشام و العراق فعاث يمينا و عاث شمالاً يا عباد الله فاثبتوا )).

قلنا يا رسول الله ﷺ وما لبثه في الارض ؟ قال :

( اربعون يوماً يوم كسنةٍ ، و يوم كشهر ، و يوم كجمعة ، وسائر ايامه كايامكم ) قلنا : يا رسول الله ﷺ فذلك اليوم الذي كسنة اتكفينا فيه صلاة يوم ؟ قال : ( لا ، اقدروا له قدره ) قلنا : يا رسول الله و ما إسراعه في الارض ؟ قال

( كالغيث استدبرته الريح فياتي علي القوم فيدعوهم فيؤمنون به و يستجيبون له ، فيامر السماء فتمطر والارض فتنبت فتروح عليهم سارحتهم اطول ما كانت ذرا وأسبغة ضروعاً ، وأمده خواصر ، ثم ياتي القوم فيدعوهم فيردون عليه قوله فينصرف عنهم فيصبحون ممحلين ليس بايديهم شيء من اموالهم و يمر بالخربة فيقول لها : اخرجي كنوزك فتتبعه كنوزها كيعاسيب النحل، ثم يدعوه فيقبل و يتهلل وجه يضحك .فبينما هو كذلكإذ بعث الله المسيح ابن مريم فينزل عند المنارة شرقي دمشق بين مهرودتين واضعا كفيه على أجنحة ملكين إذا طاطا رأسه قطر وإذا رفعه تحدر منه جمان كاللؤلؤ ، فلا يحل لكافر يجد ريح نفسه إلا مات ، ونفسه ينتهي حيث ينتهي ينتهي طرفه فيطليه حتى يدركه بباب لدّ فيقتله .

ثم ياتي عيسى ابن مريم قومٌ قد عصمهم الله منه فيمسح عن وجوههم ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة ، فبينما هو كذلك إذ أوحى الله إلى عيسى إني قد أخرجت عباداً لي لا يدان لأحد بقتالهم ، فحرّز عبادي إلى الطور .

ويبعث الله ياجوج و ماجوج وهم من كل حدبٍ ينسلون فيمر أوائلهم على بحيرة طبرية فيشربون ما فيها ويمر آخرهم فيقولون : لقد كان بهذه مرة ماء ويحصر نبي الله عيسى وأصحابه حتى يكون رأس الثور لأحدهم خيراً من مائة دينار لأحدكم اليوم ، فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه فيرسل الله النغف في رقابهم فيصبحون فرس كموت نفس واحدةٍ ثم يهبط

نبي الله عيسى وأصحابه إلي الأرض فلا يجدون في الأرض موضع شبر إلا ملأه زهمهم ونتنهم فيرغب نبي الله عيسى وأصحابه إلى الله فيرسل الله طيراً كاعناق البخث فتحملهم فتطرحهم حيث شاالله .ثم يرسل الله مطراً لا يكُنُّ منه بيت مَدَر ولا وبر فيغسل الأرض حتى يتركها كالزلفة ثم يقال للأرض : أنبتي ثمرتك ورجي بركتك فيومئذ تاكل العصابة من الرمانة ويستظلون بقحفها ويبارك في الرّسل حتى إن اللقحة من الإبل لتكفي الفئام من الناس واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس و اللقحة من الغنم لتكفي الفخذ من الناس فبينما هم كذلك إذ بعث الله ريحا صيبة فتاخذهم تحت آباطهم فتقبض روح كل مؤمن وكل مسلم ويبقى شرار الناس يتهارجون فيها تهارج الحمر فعليهم تقول الساعة .(١)

**دەروازە: لە نیشانەکانی ڕۆژی (قیامەت) تاقیکردنەوەی دەججال و دوا هاتنی ژیان لەم کەردوونەدا...**

عن النواس بن سمعان رضي الله عنه قال :(( ذكر رسول الله ﷺ الدجال ذات غداة فخفض فيه ورفع حتى ظنناه في طائفة النخل لە نەوواسی کوڕی سەمعانەوە ڕەزای خودای لێبێ ووتی: پێغەمبەر ﷺ لە بەرەبەیانێکی زۆر زوودا باسی دەججالی بۆ کردین، سەری پیرۆزی نەوی دەکردەوە وبەرزی دەکردەوە هەتا ئێمە گومانمان بۆ ئەوە ڕۆیشت کە هاتنی دەججال ئەوەندە لە ئێمە نزیك بوو بێتەوە گەیشتبێتە لایەك لە لاکانی دارخورماکانی شاری مەدینە، لە دوای ئەوە کە ئێمە ئەم حاڵەتە دەروونی یەمان بۆ دروست بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {غير الدجال اخوفني عليكم} من بێجگە لە دەججال لە شتی تر دەترسم کەبەسەر ئێوەدا بێت، " ان يخرج وأنا فيكم فانا حجيجه دونكم ئەگەر دەججال هاتوو من هێشتا زیندوو بووم لەناو ئێوەدا، ئەوە من لەباتی ئێوەش بەرهەڵستی لێ دەکەم " " وان يخرج ولست فيكم فامرؤ حجيج نفسه بەلام ئەگەر دەججال هاتوو من لە ناو

---

١)أخرجه مسلم في صحيحه برقم (٢٩٣٧) وأبو داود في سننه برقم (٤٣٢١) والترمذي في سننه برقم (٢٢٤٠) والنسائي في سننه الكبرى برقم (٨٠٢٤) وابن ماجه في سننه برقم(٤٠٧٦) وأحمد في المسند برقم (١٧٦٢٩) والحاكم في المستدرك (٤٩٢/٤) من طريق عبد الرحمان ابن يزيد بن جابر عن يحيى بن جابر الطائي عن عبد الرحمان بن جبير ابن الحضرمي عن أبيه عن النواس بن سمعان رضي الله عنه به .

ئێومدا نەما بووم هەر کەسێك بەرپرسە لە خۆی بەرامبەر دەججال" " والله خليفتي على كل مسلم لە پاش خۆم خودای گەورە بۆ موسڵمانان بەجێ دەهێڵم"
انه شباب قطط عينه طافئة كاني اشبهه بعبد العزي بن قطن فمن ادركه منكم فليقرأ عليه فواتح سورة الكهف ئێنجا پێغەمبەر ﷺ کەوتە باسکردنی دەججال فەرمووی: {دەججال گەنجێکە پرچی سەری زۆر ڕەشە وئاڵۆزە وتێکەڵە ، عينه طافئة و چاو قووڵە (وەك دەنکە ترێ کە بگوشرێ وئاوی تیادا نەمێنێ كاني اشبهه بعبد العزي بن قطن وەك کابرایەکی کافری بە ناوی عەبدول عوززا کوڕی قەتن) " فمن ادركه منكم فليقرأ عليه فواتح سورة الكهف جا هەر کەسێك لە ئێوە گەیشت بە دەججال با سەرەتای سوڕەتی کەهفی بەسەردا بخوێنێت" " انه خارج خلة بين الشام و العراق فعاث يمينا و عاث شمالاً يا عباد الله فاثبتوا )) .
انه خارج خلة دەججال لە ڕێگەیەك بين الشام و العراق لە نێوان شام وعێراقدایە دەردەچێ، فعاث يمينا و عاث شمالاً بەلای ڕاست وچەپدا ئەو پەڕی خراپە بەرپا دەکات لە ناو خەڵکیدا، يا عباد الله فاثبتوا )) ئەی بەندەکانی خودا ئێوە خۆ ڕاگر بن"
قلنا يا رسول الله ﷺ وما لبثه في الارض ؟ قال :نەوواسی کوڕی سەمعان دەڵێت: ئێمە وتمان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ماوەی مانەوەی دەججال چەندە لە زەویدا؟
قال اربعون يوماً يوم كسنةٍ ، و يوم كشهر ، و يوم كجمعة ، وسائر ايامه كايامكم ) قلنا : يا رسول الله ﷺ فذلك اليوم الذي كسنة اتكفينا فيه صلاة يوم ؟ قال : ( لا ، اقدروا له قدره ) اربعون يوماً يوم كسنةٍ فەرمووی چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، يوم كسنةٍ ڕۆژێکیان بە ئەندازەی ساڵێکە، و يوم كشهر ڕۆژێکی تریان بە ئەندازەی مانگێکە، و يوم كجمعة ڕۆژێکی تریان بە ئەندازەی حەوت ڕۆژە (حەفتە یەك) ، وسائر ايامه كايامكم ) سەرجەم ڕۆژەکانی مانەوەی دەججال لە زەویدا وەك ئەم ڕۆژانەی ئێومیە) قلنا : يا رسول الله ﷺ فذلك اليوم الذي كسنة اتكفينا فيه صلاة يوم ؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ڕۆژەی وەك ساڵێکە ئایا لەسەر

ئێمە نوێژی یەك ڕۆژ بەسە ؟ قال : ( لا ، اقدروا له قدره ) فەرمووی نەخێر ئێوە ئەندازە بۆ كاتی نوێژەكان بپێون.

**قلنا : يا رسول الله و ما إسراعه في الارض ؟ قال ( كالغيث استدبرته الريح فياتي علي القوم فيدعوهم فيؤمنون به و يستجيبون له ، فيامر السماء فتمطر والارض فتنبت فتروح عليهم سارحتهم اطول ما كانت ذرا وأسبغة ضروعاً ، وأمده خواصر ،**

**قلنا : يا رسول الله و ما إسراعه في الارض ؟** وتمان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆیشتنی وخێرایی ئەو دەجبالە چەندە لە زەویدا؟ **قال ( كالغيث استدبرته الريح** فەرمووی: خێراییەكەی وەك بارانێكە ڕەشەبا پاڵی پێوە بنێت، **فياتي علي القوم فيدعوهم فيؤمنون به** دەجبال دێتە لای كەسانێك وبانگەوازیان دەكات بۆ شوێن كەوتن وباوەڕ پێ هێنانی كەدەڵێت ئەو خودای هەموو جیهانە!! ئەوانیش باوەڕی پێ دەهێنن **و و يستجيبون له** بە دەنگ بانگەوازەكەیەوە دەچن، **فيامر السماء فتمطر** ئەو كات دەجبال فەرمان دەدات بە ئاسمان كە بارانیان بۆ ببارێنێ لە ئەنجامدا ئاسمان بارانیان بۆ دەبارێنێ، **والارض فتنبت** فەرمان بە زەویش دەدات كە ڕووەك وخێرو بێری خۆی بڕوێنی زەویش خێرو بێری خۆی دەڕوێنی!! **فتروح عليهم سارحتهم** ئەو ماڵآتانەیان كە لە بەیانیدا بردوویانە **اطول ما كانت ذرا** بۆ لەوەڕگا لە ئێوارەدا **وأسبغه ضروعاً** مەمكەكانیان پڕشیردەبێ سكیان لە زۆر خواردندا **وأمده خواصر** بەرز بۆتەوە وتێر بوون، شیریان تێر وپڕگوانەكانیان بووە، كەلەكە وسكیان ئاوساوە لە پڕو تێریدا.ئینجا پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو كەسانە دەكات كە باوەڕ بە دەجبال ناهێنن حاڵیان چۆن دەبێت بۆیە دەفەرمووێت: **((ثم ياتي القوم فيدعوهم فيردون عليه قوله فينصرف عنهم فيصبحون ممحلين ليس بايديهم شيء من اموالهم له** پاشاندا دەجبال دەچێت بۆ لای هەندێ كەسی تر **فيدعوهم** وبانگەوازیان دەكات بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنن، **فيردون عليه قوله** بەڵآم ئەو كەسانە بەر پەرچی دەدەنەوە وباوەڕی پێ ناهێنن وپێ دەڵێن تۆ دەجبالی درۆزنی! **فينصرف عنهم** دەجبالیش بە جێیان دەهێڵێ، **ممحلين ليس بايديهم شيء من اموالهم** لە بەیانیدا ئەو كەسانەی كە

باوەڕیان بە دەججال نەهێناوە دێنە سەر ساجی عەلی وهیچ شتێکیان لەسەروەت وسامان وماڵداری لە دەستدا نەماوە ونامێنێ.

بێگومان ئەمەش گەورەترین تاقی کردنەوەیە کە لە دوونیادا بەسەر مرۆڤ دێت ئەگەر هاتوو سەرکەوتوو بوو لەم تاقی کردنەوەیە ئەوا لە هەموو تاقی کردنەوەکانی تریش بەسەرکەوتوویی بە ئەزموونددا دەچێت.

ئینجا پیغەمبەر ﷺ زیاتر دەسەڵاتی دەججالمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ودەفەرمووێت، و **یمر بالخربة فیقول لها : اخرجي كنوزك فتتبعه كنوزها كيعاسيب النحل** ((دواتر دەججال تێپەڕ دەبێت بەلای گوند وشاری وێرانە وکاول بوودا دەڵێت، ئەی گوند وشارە وێران وکاول بووەکە هەرچی گەنجینە وشتی بە نرخە دەری بهێنە)) **فتتبعه كنوزها** ئەو هەموو گەنجینە وزێڕ وزیوانە هەموو دێنە دەرێ بە دوای دەکەون **كيعاسيب النحل** وەك گرۆ وتاقمی مێش هەنگ کەچۆن کۆ دەبنەوە لە پادشاکەی خۆیان وبۆ هەر کوێ بچێت هەموو ئەو هەنگانە بە تێکرا بە دوای دەکەون.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ دوا دەسەڵاتی دەججال دەگێڕێتەوە ودەفەرمووێت، **ثم يدعوه فيقبل ويتهلل وجه يضحك .فبينما هو كذلك إذ بعث الله المسيح ابن مريم فينزل عند المنارة**

له دواتر دەججال کابرایەکی باوەڕداربە خودای گەورە لەو پەڕی گەنجی وجوانی ودەسەڵاتدا دەهێنێت بۆ ئەوەی باوەڕ بە دەججال بهێنی، بەلاّم ئەو گەنجە باوەڕدارە بە دە ججال دەڵێت تۆ دەججالی کافر وکوێری، ئەگەر تۆ خودایت کوێری چاوی خۆت بۆ چاك ناکەیتەوە، چونکە دەججال لەگەڵ ئەو هەموودەسەڵاتەی کە هەیەتی ناتوانێ کە کوێری چاوی خۆی چاك بکاتەوە.

بۆیە دەججال تورە دەبێ لەگەنجەباوەڕدارەکە وبە یەکجار لە کوڕە گەنجە دەدات وکوڕە گەنجەکە دەکاتە دوو کەرت، لە دواتر کوڕە گەنجە زیندوو دەکاتەوە بانگی لێوە دەکات ئەویش بەرەو ڕووی دەججال دێتەوە و بەڕو گەشاوەیی وڕو خۆشیەوە پێ دەکەنێ ( چونکە گەنجە زیاتر باوەڕی بەخودا پتە وتر دەبێت ومشت ومڕ لەگەڵ دەججال

دەکات) جارێکی تر دەججال دەیەوێ گەنجە بکوژێت بە یەکجاری خۆی لە بەڵای گەنجەکە ڕزگار بکات، فبینما هو کذلك إذ بعث الله المسیح ابن مریم بەڵام ئەمجارەیان خودی گەورە دەسەڵاتی پێ نادات بەسەر گەنجەکەدا.

فبینما هو کذلك إذ دەججال لەو ئیش وکارو سەر قاڵیەدایە، بعث الله المسیح ابن مریم کە خودای گەورە لەئاسمانەوە پێغەمبەر عیسا ﷺ دەنێرێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی لە ئاسمانەوە فینزل عند المنارة بۆیە عیسا لە نزیك مەنارە سپیەکە لە ڕۆژ هەڵاتی شاری دیمەشقەوە دادەبەزێ، کە دوو کراس وپۆشاکی لەبەردایە ڕەنگ کراوەن وبە بۆن وڕەنگی وەرەس و زەعفەرانە داپۆشراون وهەردوو لەپی و دەستی لەسەر دوو باڵەی ئەو دوو فریشتەیە دادەنێت، هەر کاتێك سەری نزم بکاتەوە دڵۆپە ئاوی لێ دەتکێ لێدەبارێتە خوارێ (وەك تازە لە حەمام هاتبێتە دەرەوە) کاتێکیش عیسا ﷺ سەر بەرز بکاتەوە کە ڕەستەیەك لەسەری دەکەوێتە خوارێ وەك مرواری یە، هەر کافرێکیش بۆنی خۆشی هەناسەی پێغەمبەر عیسا ﷺ بەسەریدا بێت یەکسەر دەمرێت،کە هەناسەی پێغەمبەر عسیا ﷺ ڕۆیشتنەکەی هەتا کوێ چاوی بڕبکات وبڕوات وببینێ دەڕوات ، دواتر عیسا ﷺ دەڕوات وشوێن دەججال دەکەوێت، دەججال خۆی لە ترسی عیسا ﷺ دەشارێتەوە دەیەوێت ڕابکات، بەڵام عیسا ﷺ دەگاتە دەججال لە جێگە وشوێنێك ناوی دەرگای (لدر) بۆیە هیچ دەرفەت بە دەججال نادا ویەکسەر دەیکوژێت لەو شوێنەدا.

لەپاشاندا عیسای کوڕی مەریەم دەچێتە سەردانی کەسانێك کە بەرەنگاری دەججال بوو بوونەوەوخودای گە ورەش ئەوانی پاراستبوو لە دەسەڵاتی دەججال، بۆیە عیسا ﷺ بە دەستە پیرۆزەکانی دەست بە ڕوو ودەم وچاویان دێنێ... باسی گەورەیی وپیرۆزی پاداشتی ئەوانی بەر هەڵستیار لەلای خودای گەورە وپلە وپایەیان لە شوێنە بەرز وخۆشەکانی بەهەشتدا دەکات...

عیسا ﷺ هێشتا هەر لەو حاڵەتەدایە کە خودای گەورە نیگای بۆ دەنێرێ کە دەفەرموێت: (ئەی عیسا ﷺ ئەوا من کەسانێکی بەندەی خۆم ناردووە ودەرم هێناون

وهیچ کەسێك دەسەڵات وتوانای نیە ونابێ کە بتوانێ بجەنگی لەگەڵیاندا، بۆیە تۆ ئەو بەندە چاکانە ولە خودا ترسانە بپارێزەو ڕوویان لێ بکە بەرەو کێوی (طور) تا لەو کاتەدایە کە خودای گەورە دەرفەت دەدات بە دەرچوونی نەتەوەی (یأجوج ومأجوج) ئەوان لەهەموو شێو ودۆڵ وکەلەبەرێکەوە زۆر بەخێراییەوە دەردەچن لەهەژمار کردندا نایەن لە زۆریدا، بۆیە ئەوانەی لەسەرەتای سوپاکەیانەوەیە تێپەڕ دەبن بەلای ڕووباری (طبریة) دا دەست دەکەن بە خواردنەوەی ئەو ئاوەی کە تیایدایەتی چۆڕو دڵۆپەی لێ دەبڕن، بۆیە کاتێك کۆتایی سوپاکەیان بەو ڕووبارەدا تێپەڕ دەبێت وا ووشك بووە ودڵۆپەی ئاوی تیادا نەماوە دەڵێن: ڕۆژێك لە ڕۆژان جارێك بووە ئەم ڕوبارە ئاوی لێ بوو بێ.

ئا لەو کاتەدا پێغەمبەر عیسا ﷺ وهاوەڵانی چوار دەوریان لێ دەگیرێ هیچ دەرفەتێکیان نابێت ونابڵۆقەی ئابووری دەکەوێتە سەریان هەتا ئەگەر کەسێك لە ئەوکەسانە سەری گایەکی دەست بکەوێت زۆر چاکترە بۆی لەسەد دیناری زێڕین[1](١)ئەمڕۆی کەسێك لە ئێوە، بۆیە عیسا وهاوەڵان وباوەڕدارانی لەگەڵی زۆر نارەحەت دەبن، دەست دەکەن بە دوعا وپاڕانەوە ونزا وسکالاَ ولالاَنەوە بۆ لای خودای گەورە، چونکە هەر ئەو خودایە دەتوانێ ڕزگاریان بکات، بەڵێ خودای گەورە بە گەورەیی خۆی کرمێکی ووردیان بۆ دەنێری (وەك کرمی حوشتر ومەڕە کە لە مێشك ولووتیاندایە) بەڵام ئەم کرمانە بە گەردەنی یاجوج ومەجوجەوە دەوەستن وپێیانەوە دەدەن، بۆیە یەکسەر دەمرن وەك یەك کەس چۆن لەیەك کاتدا دەمرێت هەموو بەتێکڕا دەمرن، لە دواتر پێغەمبەر عیسا و ﷺ هاوەڵانی لەسەر کێوی (طور) دادەبەزنە خوارێ بۆ سەر زەوی، هیچ بستە زەوییەك نیە ونابینن ئەگەر چەوری وبۆگەنیوی لاشە بۆ

---

[1] هەر دینارێ کی زێڕ بریتی یە لە یەك میسقال زێڕ، واتە سەری گایەك بە سەد میسقال زێڕی ئەمڕۆ دەکات.

تۆپیوەكانی یاجوج ومەئجوج نەیگرتبێتەوە، بۆیە عیسا ﷺ برادەرەكانی جارێكی تر دوعا وپاڕانەوە دەكەن بۆ لای خودای گەورە  كە ڕزگاریان بكات لەو بۆگەنیو چەورایەتیە وپیسی یەی یاجووج ماجووج ، وخودای گەورە باڵندە دەنێرێ ملیان درێژە (وەك ئەو دارەی لەسەر پشتی حوشترە بۆ دەست پێوە گرتنی سواریەكەی) لاشەكانی یاجووج ماجووج و هەڵیان دەگرن ئەم جۆرە باڵندانە دەفڕن و دەیان بەن ودووریان دەخەنەوە بۆ ئەو شوێنەی كە خودا فەرمانی پێداون فڕێیان بدەن.

لە دوای ئەوەش خودای گەورە بارانێكی ڕەحمەت وبە بەرەكەت دەنێرێ هیچ ماڵ وڕەش ماڵێك ناهێلێ ئەگەر پێی نەكەوێت، زەوی جوان دەشوات وخاوێنی دەكاتەوە وەك بووك چۆن دەڕازێتەوە لە شەوی بووكێنیدا... لە دواتریش خودای گەورە فەرمان بە زەوی دەكات كە بەروو بوومەكانی خۆی بڕوێنێ، هەموو بەرەكەت وخێر وبێرێكی خۆی جارێكیتر ودەر بخاتەوە وبگەڕێنێتەوە، ئا لەو ڕۆژەدا چەند كەسانێك بەیەك هەنار تێر دەخۆن وپێی تێر دەبن، خۆیان لە هەتاو دەپارێزن وەك سێبەر لە ژێرئەو كلاوەی كەلە سەر توێكلی هەنارەكەدا هەیە دەخەون وخۆیان دەخەنە ژێر سێبەرەكەی، خودای گەورە بەركەت دەخاتە هەموو شتێكەوە هەتا ئەو حوشترەی كە تازە بێچووی لێ بووە شیرەكەی ئەوەندە زۆر وبەبەرەكەتە بەشی كۆمەڵە كەسێك دەكات ولێی دەخۆنەوە وپێی تێر دەبن.. تەنانەت شیری مەڕێك ئەوەندە بەرەكەتی تێ دەكەوێ سەرجەم ئەندامانی خێزانێك هەر چەندە زۆر بن پێی تێر دەبن. ئەو خەڵكە  خەڵكی زەوی بە تێكڕا بە موسڵمان وكافر ودوو ڕووەوە ئالەو خۆشیەدا دەژین. ئا لەو كاتەدا خودای گەورە ( با ) و هەوایەكی خۆش دەنێرێ بە بنی باڵی موسڵمانەكان دەكەوێت، گیان و ڕۆحی باوەڕداران وموسڵمانان بەوە دەكێشرێ ودەمرن... بەڵام خەڵكە بەد فەڕ وداوێن پیسەكان دەمێننەوە دەست دەكەنەوە بە داوێن پیسی بە ڕۆژی ئاشكرا ولە پێش چاوی هەموو خەڵكی بەبێ هیچ پەردە وشەرمێك وەك نێرەكەر (گوێ درێژ) چۆن سواری مێیەكەی دەبێت بە بێ ئەوەی هیچ حیساب بۆ خەڵكی بكات، ئەو خەڵكانەش بەهەمان

شێوە كاری سێكسی وناشەرعی ئەنجام دەدەن بەبێ هیچ سانسۆرێك ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەوانە بەرپا دەبێت.

## لێكدانەوەی زاناكان بۆ ئەم فەرموودەیە دەربارەی (دەجال)

{غیر الدجال اخوفنی علیكم} بێجگە لە دەجال شتی تر هەیە كە من زیاتر لێی دەترسم (لەوانە ؛

أ) (الائمة المضلین)(پێشەوایانی گومڕا بووانن).

ب) ان یجعل باسهم بینهم) ئاژاوە كەوتنە ناو موسڵمانانە.

ت) هاوەڵ پەیدا كردنەوەیە هەر لەبەری چاوی ڕووپامایی "الریاء والسمعة"

پ) مونافەسەی یەكتری كردن لە خۆ دەوڵەمەند كردن لە ڕەستەی دونیایی ولەبیر چوونەوەی خۆی ئامادە كردن بۆ دوا ڕۆژ)

{خلة بین الشام والعراق} نیشانەی ئەو دەجالەیە كە دێت لەنێوان ناوچەیەك دێت لە نێوان هەردوو وڵاتی شام عێرقدایە.

{فتنة كنوزها كیعاسیب "النحل"} هەموو گەنجینەی سەر زەوی شوێن دەجال دەكەوێت وەك چۆن پۆڕی مێش هەنگ شوێن پادشاكەیان دەكەون؟

{فیضربه بالسیف فیقطعه جزلتین رمیة الغرض}

واتە؛دەجال كابرا گەنجە موسوڵمانەكە دەكاتە دووپارچە وهەرپارچە وبە ئەندازەی تیر هاویشتن خۆی دووریان دەخاتەوە لە یەكتری.

{تحدر منه حمان كالؤلؤ} دەنكە زیوە وەك مرواری گەورە دروست كراوە مەبەست ئەوەیە دڵۆپە دڵۆپی ئاوی لەسە ردەچۆڕی لە سەرعیسا عليه السلام.

{بباب لد} شارێكە نزیك "بیت المقدس"

{فیسمع من وجوهم} دوو واتای هەیە:

**یەكەم**: بەڕاستی بەدەستی بەسەر چاویان دەهێنێ وەك پیرۆزی وبەرەكەت.

**دووەم**: ترس وبیم ولەرزین وتۆقین لەسەر ڕوویان لا دەبرێت.

{لایدان لاحد} هیچ كەس توانای شەڕ كردن وزاڵ بوونی نیە بەسەریاندا.

{فحرز عبادي الى الطور} واتە: بەندەكانم بپارێزە بەوەی كە لە ڕێگەی كێوی "طور" لایان بدات.

{ویستظلون بقحفها} بریتیە لە گوڵی سەر هەنار وەك تەپڵە سەر چۆن چەقێكی دیاری كراوی هەیە.

یان ئەو پارچە هەنارەی كە وەك دنكە سور دەبێتە.

"جبل الطور" كێوي (بیت المقدس)ە.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی ئەم فەرموودە:

١- ئامۆژگاری كردن لەسەرەتای ڕۆژەوە زیاتر كاریگەری هەیە بۆ وەرگرتن، بۆیە لەم كاتەدا پێغەمبەر ﷺ شتە ترسناك وگرنگەكانی بۆ هاوەڵانی باس دەكرد، لە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ {اللهم بارك لامتی فی بكورها}.واتە: خودایە تۆ بەرەكە ت و پیرۆزی بخەیتە ناو ئوممەتەكەی منەوە لەبەیانیاندا )

٢- تێكەڵبوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ گێڕانەوەی باسەكە بەوەی سەری بەرز دەكردەوە ونزم دەكردەوە زیاتر كاریگەری دەبێت بۆ ئەو كەسانەی كە ئامۆژگاریان دەكەیت بۆیە پێویستە:

وتار بێژ هەمان هەڵوێست وەرگرێت وشوێن پێی پێغەمبەر ﷺ هەڵگرێتەوە لە باسکردنەکانی خۆی تێکەڵ بە باسەکە بکات بە پێی توانا، تەنها لە باس کردنی (الاسماء والصفات) خودا نەبێت بە هیچ شێوەیەك نابێت ئاماژە نە بەسەری نە بەچاو ودەستی نەبە هیچ ئەندامێکی تری بکات، چونکە ئەمە حەرامە وقەدەغەیە ونواندن ولێچواندنی خوای گەورەیە بە دروست کراوانی ئەمەش محاڵە هیچ ناو سیفەتێکی خودای گەورە بە هیچ جۆرە دروست کراوانی بچووێت، خودای گەورە خۆی دەفەرموێت: ﴿فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ١١﴾سورة الشورى

واتە: هیچ شێوە ونموونەی خودا نیە لەکاتێکا کە خودا بیسەر وبینەرە بێ سنوورە لە بیستن وبینیندا.

أ- مامۆستای قوتابخانە ئاماژە بکات بۆ زیاتر تێگەیاندنی قوتابیان وسەرنج ڕاکێشانیان.

ب- ئەوەی کە بەرنامەیەك پێش کەش دەکات بەهەمان شێوە ئاماژە دەکات، زیاتر دەتوانێ کاریگەری هەبێت وسەرنجی جەماوەر بۆ خۆی ڕابکێشێت.

ت- سەرۆکێك لە گەورەیانەوە تا بچوکیانەوە، ئەمە وای لێ دەکات خەڵکان چاکتر شتەکان ودەربڕینەکانی لێ وەرگرن.

٣- کەسایەتی بەهێزی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات لەسەر هاوەڵانی بۆ گوێ بیستنیان. ٤- خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵان وگشت نەتەوەکەی کاتێك هەر خێرێك ببیستێ وبزانی پێیان ڕادەگەیەنێ.

٤- خۆشەویستی وبڕوا بوون بە پێغەمبەر ﷺ لە دڵی هاوەڵانیدا.

٥- هەردەم ئاستی قوتابیان وفێرخوازانت بەرە وبەرزتر ببەیت وفێرکردنیان بۆ هەر شتێکی چاك وباش.

٦- لە تاقی کردنەوەی دەججال گەورەتریش هەیە لەسەر ئەم ئوممەتە بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموودەی {غیر الدجال اخوفنی علیکم} واتە: بێجگە لە دەججال شتی تر هەیە من زیاتر دەترسم کە ڕوو بدات لەناو ئێوەدا، ئەمە ش لەبەر چەند هۆیەك:

**هۆی یەکەم:** چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر دەججال هاتوو من زیندوو بووە ئەوا خودا دەسەلاتی داوە بەمن بەسەریدا زاڵم.

**هۆی دووەم:** ئەگەر هاتوو دەججال هات وپێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد بوو ئەوا خودای گەورە جێ نشینی پێغەمبەرە ﷺ بۆ پاراستنی هەر موسڵمان وباوەڕدارێك {والله خلیفتی علی کل مسلم}.

**هۆی سێیەم:** چونکە هەموو سیفەتەکانی دەججال لەوانە کە کوێرە ونوسراوە کافر ڕوون کردۆتەوە وهەر کەس گوێ بیستی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بێت پێی ناخەڵەتێ وەك فەرمووی: (یاعبادالله فثبتوا) ئەی بەندەکانی خودا ئێوە خۆڕاگر بن.

**هۆی چوارەم:** چونکە مانەوەی دەججال لەسەر زەویدا کەمە.

**هۆی پێنجەم:** چونکە کۆمەڵە موسڵمانێکی ڕاست دەمێنن کە ببن بە چقڵی چاوی کوێری دەججال هەتا خودای گەورە بە دەستی عیسا پێغەمبەر ﷺلەناو چوونی دەهێنێ.

**بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ زیاتر لێی دەترسێ کە لەم ئوممەت ونەتەوەی ئیسلام ڕوو بدات بە تێگەیشتنم لە چەند خاڵێکدا خۆی دەبینێتەوە هەر خاڵە وچەندان فەرموودەی ڕاستی لەسەرە، لەوانە:**

ا. **هاوەڵ پەیدا کردن:** دروست بوونەوەی شیرك لە دوای تەوحید وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ١٠٣﴾یوسف:

واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هێناوە زۆریان هاوەڵ بۆ خودای گەورە پەید دەکەن، چونکە گەورەترین تاوانە وهەموو جۆرەکانی هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خودای گەورە ئەوەی سەیرە لەم زەمانەی ئێستاماندا کەم بانگەواز خوازێك ویان وتار بێژێك ئەم لایەنە گەورەیە ڕوون بکاتەوە بۆ خەڵکی لەگەڵ ڕوونی ئەم بابەتە وەك ڕوونی ڕۆژ لە نیوەڕۆدا بەبێ هیچ هەورێك بەری ڕووناکی بگرێت، بیجگە لە چەندەها فەرموودەی تر.

ب) **کێشەو فیتنە کەوتنە ناو موسڵمانانەوە،** {وان لا یجعل بأسهم بینهم}.

ت) **پەرستنی دونیا ولەزەتەکانی وشوێن هەواو ئارەزووەکانی**{، اخوف اخاف علیکم الدنیا ان تنافسوها کما تنافسوها ممن قبلکم کما اهلکهم..}.واتە :ئەوەی زۆر دەترسم لەئێوەدا بێتە جێ کێبڕکێکردنی دوونیایە وەکچۆن نەتەوەکانی پێش ئێوە کێبڕکێی یکتریان کرد.

ث) **حەڵاڵ کردنی حەرامەکان** {یوشك اذ یتکيء رجل علی اریکته فیقول ما وجدت في کتاب الله}واتە: لەوانەیە کەسێکپاڵبداتەوە لەسەرشانی وبڵێت هەرشتێکم دی لەقورئاندا ئەوە حەلاڵە.....) خودای گەورە زاناترە.

٨- هەر کەسەو خۆی بەرپرسە لە بەرەنگاری وپەرچ دانەوەی دەجال، ئەمەش لەوانەیە ئاماژە بێت بۆ ئەوەی ئەو کاتە موسڵمانان سەرکردەیەکیان نەبێت کە بتوانێ خەڵکی کۆ بکاتەوە بۆ جەنگی دەجال هەتا خوای گەورە موحەممەدی کوری مەهدی دەنێرێ ودەبێتە سەرکردە ولەپاشاندا عیسا ﷺ دادەبەزێت.

٩- خودای گەورە پارێزی مرۆڤی موسڵمانە لە دەجال لە هەر کوێ هەبێ.

١٠- پێغەمبەر ﷺ روخسار وشێوازای ئەوی ڕوونکردەوە تەنانەت لە ڕوخساری بە (عبدالعزی کوری قطن) دەچێ کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەو کابرایەیان ناسیوە و دیوە.

١١- زیاتر ڕوونکردنەوە دەربارەی دەجال کە کابرایەکی گەنجە وچاوی ڕاستی کوێرە، لەناو چاوانی نوسراوە کافر هەموو موسڵمانێك دەتوانێ بیخوێنێتەوە وخوێندەوار بێت، یان نەخوێندەوار بەس مەرج ئەوەیە موسڵمان بێت، بەڵام کافرەکان ودووڕووەکان توانای ئەوەیان نیە ئەو نوسینەی ناو چاوی دەجال بخوێننەوە، ئەمانە هەمووی فەرموودەی تری ڕاستی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە.

١٢- شێوازی ئەو کوێری یەی دەجال ئەوەیە چاوی ڕاستی وەك دەنکە ترێ کە بگوشرێت وئاوی تیادا نەمێنێ چۆن پوچ دەبێ ئا بەو شێوەیە چاوی دەجال.

**١٣- هەرچەندە دەسەڵاتی هەبێت توانایی ئەم خاڵانەی نیە:**

**خاڵی یەكەم:** دەسەڵاتی نیە چاوی خۆی چاك بكاتەوە.

**خاڵی دووەم:** دەسەڵاتی نابێت لەناو چاو نوسراوەكەی ڕەش بكاتەوە كە لێی نوسراوە كافر.

**خاڵی سێیەم:** دەسەڵاتی نابێت لەسەر كوشتنەوەی كوڕە گەنجەكە.

**خاڵی چوارەم:** دەسەڵاتی نابێت بچێتە ناو هەردوو شاری مەدینە ومەككە.

**خاڵی پێنجەم:** دەسەڵاتی نابێت كە زاڵ بێت بەسەر محەممەدی مەهدی دا وسوپای موسڵمانان.

**خاڵی شەشەم:** خۆی ناگرێت لەبەر دەسەڵاتی عیسا پێغەمبەر ﷺ، وەك خۆی لەناو د چۆن دەتوێتەوە بەو شێوە عیسا بە دووی دەكەوێ تا دەیتۆپێنێ لە جیگەیەك بە ناوی (باب لد).

**١٤- بۆ پاراستن لە تاقی كردنەوەكانی دەجال پێویستە مرۆڤی موسڵمانئەم ڕێگەیانە بكرە بەر:**

أ. خوێندنی سورەتی (الكهف) حەفتانە بخوێنێ لە ڕۆژی هەینیدا.

ب. لە تەحیاتی نوێژەكانی پەنا بەخودا بگرێت لە دەجال {اللهم اني اعوذ بك من فتنة المسيح الدجال}واتە: ئەی خودایە من پەنات پێدەگرم لەتاقیكرنەوەی مەسیحی جادووگەر.

١٥- ئەگەر تەمەنی كەسێك لە ئێمە بە دەجال گەیشت ئەوە با سەرەتای ئەم سووڕەتە (سورەتی كهف) بخوێنێ، وئەوەیە دەبێتە پەردە، وناهێڵێ دەجال زاڵ بێت بەسەر ئەو كەسەی كە سەرەتای سوڕەتی كهف بخوێنێ.

١٦- جێگە وشوێنی دەرچوونی لە ڕێگەیەكە لە نێوان هەردوو وولاتی شام وعێراق.

١٧- ئەو دەسەڵاتە زۆرەی كە خوای گەورە دەجال وخەڵكانی تریشی پێ تاقی دەكاتەوە زۆر بە خراپ ولەو پەڕی خراپیدا بەكاری دەهێنێ زۆر خێرایە لە دەستەڵات وبڵاوبوونەوەی بەسەر خەڵكیدا.

١٨- بەلام پێغەمبەر ﷺ تا ئامۆژگاری ئێمەی موسلمان بەوە دەكات كە خۆڕاگر وئارام گر بێت هەتا خودای گەورە سەركەوتنی خۆی دەنێرێ یان شهید دەبن لەبەرامبەر بوونەوەیاندا بۆ دەججال.

١٩- ئینجا نەوواسی كوڕی سەمعان ڕەزای خودای لێبێ دەلێت: ئێمە لە پێغەمبەرمان ﷺ پرسی ماوەی مانەوەی دەججال ودەسەلاتە ترسناكەی چەندە لە زەویدا؟ فەرمووی ﷺ **چل ڕۆژ دەمێنێتەوە بەم شێوە:**

**یەكەم:** ڕۆژێكیان بە سالێكەو نزیكەی (٣٦٦) ڕۆژی ئێستای خۆمان دەكات.

**دووەم:** ڕۆژێك بە ئەندازەی مانگێك نزیكە (٣٠) ڕۆژی خۆمان وئێستا.

**سێیەم:** ڕۆژێك بە ئەندازەی حەفتەیەك حەوت ڕۆژ دەكات.

**چوارەم:** سەرجەم ڕۆژەكانی تری ئەو چل ڕۆژەی كە ماوەی (٣٧) ڕۆژ دەكات هەر ڕۆژەو وەك ڕۆژی خۆمان وئێستایە. كەواتە بە كورتی مانەوە ودەسەلاتی دەججال لەو چل ڕۆژە كە دەكاتە (٤٤٥) ڕۆژ بە ڕۆژگاری ئەمڕۆی خۆمان وئێستا.

٢٠- گەورەیی نوێژ دەردەخات لە دڵ ودەروونی هاوەلاندا بۆیە یەكسەر پرسیاری چۆنیەتی نوێژیان لێكرد بەوەی وتیان {اتكفينا فيه صلاة يوم؟} واتە: ئایا نوێژی ڕۆژێكی ئەمڕۆ كە پێنج نوێژی فەرز دەكات بەسە بۆ ڕۆژێك لەو ڕۆژەی كە بە ئەندازەی سالێكە؟ وەلامی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو فەرمووی: ئێوە ئەندازەی نێوان نوێژ بگرن وبە پێ ئەو ئەندازە ونێوانە نوێژەكان بكەن.

**٢١- گەورەیی نوێژ لەسەرجەم ڕووكنەكانی تری ئیسلام دەردەخات:**

أ- چونكە نوێژ پەیوەندی ڕاستەوخۆیە لە نێوان خودای گەورە وبەندەكانیدا! وەك خوای گەورە ئاماژەی پێ كردووە ودەفەرموێت ﴿وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي {١٤}﴾ سورە {طه} الایە واتە: تۆ ئەی موسا ﷺ نوێژ بكە چونكە نوێژ كردنەكەت بۆ یادكردنەوەی منە.

ب- نزیکترین کات لە مرۆڤ لەخودای خۆی نزیکە کاتی سوجدە بردنی بەندەیە بۆ خودای گەورە{اقرب مایکون العبد من ربە وهو ساجد فاكثروا فيه الدعاء}صحيح الجامع الصغير

.یان هاوەڵێك داوای ئەوەی کرد کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بێ فەرمووی: {فاعني بكثرة السجود} صحيح الجامع الصغير

ت- هاوەڵان جیاوازی نێوان موسڵمان وکافریان بە نوێژ کردن چا دەکردەوە، {علامة بيننا وبين الكفر والشرك الصلاة فمن تركها فقد كفر}صحيحه

واتە: نیشانەی نێوان گرۆی موسڵمان وکەسانی کافر وهاوەڵ پەیداکاراندا نوێژە هەر کەس نوێژ نەکات ئەوا کافر دەبێت یان هاوەڵ پەیدا کارە.

پ- نوێژ یەکەم فەرزە لە فەرزەکان کە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری لەسەر دەکرێت {اول مايسئل عنه العبد الصلاة}صحيحة اوكما قال.

ج- نوێژ دوو بەشە بەشێك هەقو پێویستی یەکانی خودایە بەسەر بەندەوە وبەشی دووەم ماف وهەق وپێویستی بەندەیە لەلای خودای گەورە کە خودای گەورە خۆی لەسەر خۆی فەرزی کردووە بۆ نوێژ خوێن.

ح- نوێژ تاکە فەرزێکە لە ئاسماندا فەرز کرا بێت وەك ئەوەی بڵێت ئەوەی نوێژ بکات خودا پلەی بەرز دەکاتەوە...

٢٢- ئینجا هاوەڵان پرسیاریکیتری ترسناکیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد {قلنا: يارسول الله ﷺ وما اسراعه في الارض} واتە: ئەی خێرایی دەسەڵات وداگیر کردنی بۆ زەوی چۆنە فەرمووی: {كالغيث استدبرته الرح...} واتە:وەك بارانە کە با هەڵی گرێت و بەخێرایی بیبات......

٢٣- .ئەم پرسیارەی هاوەڵان لە جێگەی خۆیدایە وئەوە دەردەخات کە زۆر چاك پێغەمبەر ﷺ فیتنەو تاقی کردنەوەکانی دەججالی بۆ ئەوان باس کردووە هەتا لە مێشك وهزریاندا چەقیو کە زۆر ترسناکە خودا کۆمەکی مرۆڤی موسڵمان بکات لەسەر ڕاگیر بوون لەسەر ئایینی خودا.

**٢٤- شێواز وجۆری دەسەڵاتەکانی دەججال لە فریو دانی خەڵکیدا لەم چەند خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:**

**خاڵی یەکەم:** زۆر خێرایە لە داگیر کردنی شوێنەکان وفراوانی ئەو دەسەڵاتەی کە تەنها چەند شوێنێکی کەم دەمێنێتەوە کە نەتوانێت داگیری بکات وەك "مەککە ومەدینە"

**خاڵی دووەم:** بانگی خەڵکی دەکات بۆ ئەوەی بە خودای بزانن ئەگەر خەڵکەکە باوەڕیان پێ هێناو پەرستنی ئەویان کرد ئەوە جۆرە خۆشیەك ڕوویان تێ دەکات بێ گومان ئەمەش بۆ ماوەیەکی زۆر کورتە ((٤٤٠) دەرئەنجامیان بەشەڕو خراپە تەواو دەبێت وبە کافری دەمرن.

**خاڵی سێیەم:** فەرمان دەدات بە ئاسمان کە باران ببارێنێ.. ئاسمانیش باران دەبارێنێ، ئەو بارانەش زۆر بە پیت وبەبەرەکەت دەبێت ئەوانەی کە دەججالیان بە خودا دانا زۆر دڵیان پێ خۆش دەبێ.

**خاڵی چوارەم:** لەدەرئەنجامی بارانەکە فەرمان بە زەوی دەکات بەروو بووم وڕووەکەکان وباخ وبێستانی خۆی دەرباخات وخەڵکانی شوێن کەوتوانی دەججال خەنی وخۆش حاڵ دەبن تەنانەت ئاژەلانیشیان پی تێر وقەڵە ودەبێ وشیری زۆریان دەبێت، بە شێوەیەکە لە ئەوپەڕی تێر بوون وقەڵەوی شیرداندا دەبن.

ئەم خۆشیانەی کافران تەنها لەبەر ئەوەیە ژیانی دونیا کورتە ودەڕوات وەك قورئان دەفەرمووێت ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ {٣٨} ﴾سورەالتوبە الایە

واتە: ژیانی دونیا لەچاو ژیانی دوارۆژتەنها شتێکی زۆر کەمە.

یان خودا دەفەرمووێت ﴿ {٣٢} وَلَوْلَا أَن يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً لَجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِالرَّحْمَنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فَضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ {٣٣ * 3 * {ص ٤٩٢@وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِؤُونَ {٣٤ { وَزُخْرُفًا وَإِن كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ {٣٥﴾ سورة الزخرف،واتە:ئەگەر خەڵکی هەمووتێکڕا بەخۆشیەکانی دوونیا فریویان نەخواردایە و کافر نەبوونایە ئەوا ئێمە هەرکەس بێباوەڕبوایە سەربانی ماڵەکانی ئەوانما ن دەکرد بەزیو....)

**خاڵی پێنجەم:** ئەگەر كەسانێك باوەڕ بە دەججال نەهێنن بەوە تاقی دەبنەوە و تاقی دەكرێنەوە كە خاوەن هیچماڵ وسامان نابن، با هەر چەندە لەوە وپێش دەوڵەمەند بووبن، بەڵام هەموو بە تێكڕا دەچنە سەر ساجی عەلی وخاوەن درهەم ودینار مەڕو ماڵات وزەوی وزار وبەرهەم نامێنن.. بەڵێ بەڕاستی تاقی كردنەوەیەكی گەورە وبەفریودانە مەگەر خودای گەورە خۆی باوەڕداران ڕاگیر بكات لەسەر ئەو هەموو بەڵاو موسیبەتە، ئەمەش ڕاستێتی ئەو ئایەتە دەسەلمێنی كە خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ {155} الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ أُولَـئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ {١٥٧}﴾ سورةالبقرة الاية.

واتە: بەڕاستی تاقیتان دەكەینەوە بە هەندێك ترس وبرسیتی ونەبوونی ماڵ وسامان ولە ناوچوونی دەروونەكان وبەروو بوومەكان وموژدە بێ بۆ خۆڕاگیر وئارام گران.

یان [ ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ {٣١}﴾سورة محمد الاية. واتە: تاقیتان دەكەینەوە بۆ ئەوەی دیار بێت كێ لە ئێوە تێكۆشانی دەبێت.

یان ﴿وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ {٣١}﴾سورة واتە: تاقیتان دەكەینەوە بۆ ئەوەی دیار بێت كێ لە ئێوە چاكترینتانە.

یان ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاءوَزُلْزِلُواْ حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ {٢١٤}﴾سورة الاية واتە: ئایا ئێوە وا گومانتان برد بوو بچنە بەهەشتەوە وهیچ ئازار وئەشكەنجەی وەك ئەو كەسانەی پێش خۆتان لێ بەسەر نەیەت كە تووشی برسێتی وناهەمواری وئەشكەنجە بوون، هەتا ئەوەندە ئازاریان لەسەر توووند بوو تەنانەت پێغەمبەر ﷺ و ئەو كەسانەش كە شوێنی كەوتوون ولەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوون دەیان وت ئەی خودایە كەی سەركەوتنی تۆ بۆ ئێمە دێت.. ((هێنانەوەی ئابڵۆقە وئازاردانی كافرانی قورەیش بۆ پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی)).

یان ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَايُفْتَنُونَ {٢} وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَصَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ٣﴾السورةالعنكبوت.

یان واتە: ئایا خەڵکی وا گومان دەبەن کە بەس بڵێن باوەڕمان هێنا، وازیان لێ دەهێنرێت وبە ئەزموندا ناچن.

**خاڵی شەشەم:** تەنانەت دەججال تێپەڕ دەبێت بەلای کاولی ووێرانەدا پێی دەڵێت چ شوێنەواری بەجێماوی گەنجینەت تیادا هەیە بهێنە دەرێ... ئەو هەموو گەنجینە وپاشماوە وشوێنەوارە دێتە دەرێ وشوێن دەججال دەکەوێت بۆ کوێ بڕوات لەگەڵی دەڕوات وەك پورەی هەنگ کەچۆن شوێن شاژنەکەی دەکەون شوێن دەججال دەکەون.

**خاڵی حەوتەم:** دەسەلاتی دەججال ئەمەیە: بانگی گەنجێکی موسڵمان وباوەڕدار بەخودا دەکات، کە ئەم گەنجە لەو پەڕی گەنجایەتی وجوانی وبەهێزیدایە لەلایەن جەستە ولەلایەن باوەڕیشەوە بۆیە ئەم گەنجە سووکایەتی بە دەججال دەکات وپێی دەڵێت خودای گەورە کوێر نیە، بەڵام تۆ کوێری ئەگەر خودای چاوی خۆت چاك بکەوە، بەڵام خودای گەورە دەسەلاتی ئەوەنادات بە دەججال کە بتوانێت چاوی کوێری خۆی چاك وساغ بکاتەوە.. نە دەسەلاتی ئەوەشی هەیە کە بتوانێت ئەو مۆرەی کە لەناو چاویدا نوسراوە ((ك-ف-ر)) واتە کافر کە هەر هەموو موسڵمانێك زۆر بە ڕوونی دەتوانێ لەناو چاوی بیخوێنێتەوە، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار لەبەر ئەوەی ئەم سووکایەتی وبەرامبەر بوونەی ئەم گەنجە باوەڕدارە بە دەججال زۆر دەججال توڕە دەکات یەکسەر گەنجەکە دەکوژێت ودەیکاتە دوو کەرتەوە..

لە پاشاندا گەنجەکە زیندوو دەکاتەوە وبانگی لێوە دەکات بۆ ئەوەی پەرستنی دەججال بکات... بەڵام گەنجەکە زیاتر باوەڕی بە خودای گەورە بتەو تر دەبێت بۆیە کاتێك بەرە ودەججال دەبێتەوە بە ڕوگەشاوەی وخەندەوە دێتەوە پێی دەڵێت ئەم جارە زیاتر دڵنیا

بووم کە تۆ دەججالی! لەم کارەش دەججال زۆر تووڕە دەبێ دەیەوێت دووبارە بۆ یەکجاری گەنجەکە لەناوبدات وشەهیدی بکات، بەڵام خودای گەورە دەسەڵاتی دەججال نادات، هەرچی دەکات ئەو گەنجەی بۆ ناکوژرێت تا لەم کاتەدا دەبێت خودای گەورە پێغەمبەر عیسا ﷺ دادەبەزێنێت...

٢٥- خودای گەورە عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دادەبەزێنێ لە ئاسمانەوە جارێکیتر بۆ زەوی بۆ کوشتنی دەججال ورژاندنی ئارەق وشکاندنی خاچەکان بە تێکڕا، دابەزینی عیسا ﷺ لەلای مەنارە سپیەکەی ڕۆژهەڵاتی شاری دیمەشقەوە دەبێت لە نێوان دوو جل وبەرگی جوان وڕازاوەدا ولەو پەڕی بۆن خۆشیدا..

٢٦- شێوازی دابەزینەکەی عیسا ﷺ بەو شێوەیە هەردوو دەستی لەسەر دوو باڵی دوو فریشتە داناوە.. لێرەشدا ئێمە ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێت فریشتەکانیش بەندەی خودان ولە خزمەت پێغەمبەران ﷺ ومرۆڤەکاندان، بۆیە هەندی لە زاناکان بۆچونیان وایە کە مرۆڤی موسڵمان بەڕێزترە لەلای خودای گەورە لە فریشتەکان، بەڵام ئەم بۆچوونە جیاوازی هەیە لە نێوان زاناکاندا... ئەوەی جێی کۆك بوونی تێکڕای زاناکان بێت ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ لە فریشتەکان بەڕێزترە بە ڕێزگرتن لەلای خودای گەورە.

## لە دابەزین وهاتنە خوارەوەی عیسا ﷺ چەند سوودو وانەیەکی لێ وەردەگرین:

**سوودی یەکەم:** عیسا ﷺ مرۆڤە وخودای گەورە هێشتا کاری پێماوە، بۆیە هەتا ئێستا لەلای خۆی هێلاویتیەوە، ئەمەش چ حیکمەتێکەی خودای گەورە خۆی دەزانی بۆ چی یە؟

**سوودی دووەم:** دابەزینی عیسا ﷺ بۆ جێ بەجێ کردنی قورئان وسوننەتەکانی پێغەمبەری خۆمان ﷺ چونکە تەنانەت نوێژ لەدوای محەمەدی کوڕی مەهدی یەوە دەکات.

**سوودی سێیەم:** بۆ ئەوەی هەر لە دونیادا خۆی تەبریە بكات لە پەرستنی خاچ پەرستەكان بۆ ئەو ودایكی بێجگە لە خودای گەورە.

**سوودی چوارەم:** بۆ كوشتن ونەهێلآنی بەراز وخاچەكان وئارمقە، چونكە خاچ پەرستەكان ئەمانەیان بۆخۆیان حەلآڵ كردووە... بەلآم ئەو بەخەڵكی دەسەلمێنیٚ كە حەرامە وهەر لەبەر ئەوە تەفر وتونایان دەكات ولەناویان دەبات ونایان هێڵیٚ..

**سوودی پێنجەم: بۆ ئەوەی عیساش ﷺ وەك هەر مرۆڤ وپێغەمبەرێكی تر لەسەر زەوی گیان ورۆحی كۆتایی پیٚ بێت ئەمەش خۆی لە خۆیدا بۆ دەست نیشان كردنی**

**چەند خاڵێكە لەوانە:**

**خاڵی یەكەم:**

عیساش ﷺ مرۆڤە ولە مرۆڤ بووە ونموونەی عیسا كە بیٚ باوكە وەك نموونەی ئادەمە ﷺ كە بیٚ دایك وبیٚ باوك خودای گەورە دروستی كردووە، ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَلَهُ كُن فَيَكُونُ ٥٩﴾.**سورة ال عمران**

**خاڵی دووەم:**

ئەویش وەك هەر دروست كراوێكی تر ئەبێت كۆتایی بە ژیانی بێت تەنها خوای گەورە خۆی دەمێنێتەوە ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ٢٦وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ {٢٧}﴾ سورةالرحمان الاية.

مەبەست ئەوەیە هەموو كەسێك دەمرێت بێجگە لە خودای گەورە هەر ئەو خودایە دەمێنێتەوە وخاوەن هەموو دەسەلآتێكە و ڕێزلێنانێكە.

**سوودی پێنجەم: عیسا پێغەمبەر ﷺ چەند موعجیزەیەكی دەبێت لەوانە:**

**موعجیزەی یەكەم:** هەردەم پرچ وسەری عیسا ﷺ بە تەڕی ودڵۆپە ئاوی بۆن خۆشی لیٚ دەباریٚ كاتێك سەری نەوی بكات.

**موعجیزەی دووەم:** كاتێك سەری بەرز بكاتەوە شتێكی لەسەر دەبارێ وەك مرواریە ئەم دوو موعجیزەیە خەڵك هەمووی بە چاو ی خۆیان دەیبینن بەردەوامیشە بە مانەوەی عیسا ﷺ.

**موعجیزەی سێیەم:** بۆ هیچ كافرێك نیە بتوانێ بۆنی خۆشی هەناسەی عیسا بكات هەر بە بۆن كردنی ئەو هەناسە خۆشەی عیسا ئەو كافرانە دەمرن.

**موعجیزەی چوارەم:** بەهێزی زۆر ودوور ڕۆیشتن وگەیشتنی هەناسەی عیسا دەگاتە دوور بینی چاوی خۆیەوە، بە ئەندازەی ڕۆیشتنی ئەو بۆنە خۆشەی پێغەمبەر عیسا دەبێتە هۆی لەناو بردنی كافرەكان.

**موعجیزەی پێنجەم:** بۆنی ئەو هەناسە خۆشەی موسڵمانان لەزەتی لێ دەكەن وتا ئەو ئەندازەی چاو بڕبكات بۆنی خۆشی بە موسڵمانان دەگات.

**موعجیزەی شەشەم:** كوشتن و نەهێلانی دەجال، ڕزگار كردنی خەڵكی موسڵمان لە فیتنە وبەلای دەجال. بۆیە كاتێك دەجال هەواڵی دابەزینی عیسای پێ دەگات دونیای لێ تەسك دەبێتەوە بەم لاو لادا ڕادەكات وعیسا ﷺ بەشوێنی دەكەوێت كون بە كون هەتا دەگاتە دەجال لەلای دەرگای ((لد) دا ودەیكوژێ ئەم حاڵە نەپێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەی تردا باسی لێوە دەكات كە دەفەرموێت {یذوب الدجال كما یذوب الملح في الماء} واتە: دەسەلاتی نامێنێ خۆیشی بەرە ولەناو چوون دەڕوات، وەك خوێ ئەگەر بكرێتە ناو ئاو دەتوێتەوە وخۆی ناگرێت، بەو شێوەیە دەجال خۆی ناگرێت لەبەرامبەر عیسا دا ﷺ.

٢٧- لە دوای كوشتنی دەجال عیسا ﷺ دەچێتە سەردانی ئەو كەسانەی كە جەنگاوەرن دژ بە دەجال وخودای گەورە ئەوانی پاراستووە وتاقی كردنەوە

وبەلای زۆری لی بەسەر هێناوون، بەلام لەبەر ڕاستیەتی باوەڕیان خۆ ڕاگر بوون، خودای گەورەش لەززەتی سەركەتنی پێ دان كە بە چاوی خۆیان خودا ڕزگاری كردن لە دەججال، بۆیە عیسا ﷺ دەچێتە ناویان و مژدەی ڕزگار بوون وسەركەوتنیان پێ دەدات... مژدەی پاداشتی گەورە ونەبڕاوەیان پێ دەدات بۆ دوارۆژیش، ئا لەم كاتەدا خودای گەورە نیگا دەنێرێ وفەرمانی پێ دەكات كە هەندێ ڕێ وشوێنی تایبەتی بگرێتە بەر.

٢٨- ئەو نیگایەی خودای گەورە بۆ عیسا ﷺ ئەوەیە كە كەسانێكی موسڵمان توانای دەرچوون وهاتنیان نیە كە بتوانن لەگەڵیان بجەنگن بۆیە خودای گەورە فەرمان بە عیسا دەكات بەندەكانی من ببە وبیانپارێزە لە شەڕی ئەو كەسانە بەوەی بیانگەیەنێتە كێوی "طور".

٢٩- ئەو كەسانەش مرۆڤن بەلام لەهەردوو قەبیلەی یەئجوج ومەئجوجن، زۆر بە خێرایی دەڕۆن ودەسەلات پەیدا دەكەن ودەیسەپێنن بەسەر زۆر شوێنێدا، ئەوەندە زۆرن بە شێوەیەك سەرەتای سوپاكەیان تێپەڕ دەبێ بە ڕووباری "طبریة" دا هەموو ئاوەكەی لێ دەخۆن وخاڵی دەكەن كاتێك كۆتایی سوپاكەیان دەگاتە ئەو ڕووبارە وخاڵی یە وهیچ ئاوی تیادا نیە دەڵێن ڕۆژێك بووە ئەم ڕووبارە ئاوی تیادا بووە وئاوی پیادا ڕۆیشتووە...

٣٠- پێغەمبەر عیسا وهاوەڵانی ئابلۆقە دەدرێن جێگەیان لێ تەسك دەبێتەوە هەتا وای لێدێ ئەگەر سەرە گایەك دەست كەسێكیان بكەوێ بۆ ئەو زۆر باشتر وچاكترە لەوەی كە ئەمرۆ سەد دیناری زێڕینی هەبێت كە دەكاتە سەد میسقال زێڕی ئەمرۆ، واتە تەنها سەرەگایەك نرخی لەلای ئەوان دەچێتە سەد میسقال زێڕی ئەمرۆی خۆمان.

٣١- عیسا وهاوەڵانی ناتوانن بەرەنگاری ئەو سوپا زۆرە ببنەوە، ئەمەش چەند حیكمەتێكی تیادایە لەوانە:

**حیكمەتی یەكەم:** بۆ ئەوەی خەڵك بە عیسا وهاوەڵانی زیادەڕەوی تیایاندا دروست نەبێت بكەونە پەرستنیان.

**حیکمەتی دووەم:** بۆ هەر دەسەڵاتێك سنوورەكانی خۆی هەیە، ئەمەش واتای فەرمووودەی پێغەمبەرە ﷺ {حق على الله الا يرتفع شيئاً الا وضعه} سوونەتی خودایە لەسەر خۆی داناوە هەر شتێك بگاتە لووتكە جارێكیتر خودای گەورە دایدەبەزێنێتەوە.

**حیکمەتی سێیەم:** بۆ ئەوەی نرخ وپڕ بەهای دوعا ونزا وپاڕانەوە وسكاڵا بۆ لای خودای گەورە كە ڕزگاریان بكات.

**حیکمەتی چوارەم:** دەسەڵات وبەتوانایی خودای گەورە دیار وئاشكرا دەكاتەوە بۆ خەڵك كە ئەم سوپا زلهێز وگەورەیە بەجۆرێك لە جۆرەكانی باڵندە لەناو دەبات وەك چۆن لە ساڵی لە دایك بوونی پێغەمبەردا ﷺ ئەبرەهەی حەبەشی بە فیلە زل هێزەكانیەوە دەنازی، وخودای گەورە بە باڵندەیەكی زۆر ناسك وبێ هێز ئەوانی تەفر وتوونا كرد.

٣٢- بەدوعا وپاڕانەوەی عیسا و ﷺ هاوەڵانی خودای گەورە جۆرێك لە جۆرەكان سەربازەكانی خۆی دەنێرێ ویەئجووج ومەئجوج تەفر وتوونا ولەناو دەبات بەناردنی كرمێك كە كرمی ئاژەڵانە ولەناو لووتی حوشتر ومەڕ وماڵاتدا هەیە، ئەم جۆرە كرمە خودای گەورە دەینێرێ بە گەردەنی هەر تاكێك لە تاكەكانی سوپای یەئجوج ومەئجووجەوە دەنوسێ لێی نابێتەوە هەتا ئەو كەسە نەكوژێت.

٣٣- بۆیە هەر هەموویان بەیەكجار دەمرن وەك مردنی یەك كەس كە گیان لە دەست بدات ومرێت چەندە بۆ خودای گەورە ئاسانە ڕۆح كێشانی.

٣٤- لە پاشاندا عیسای پێغەمبەری خودا ﷺ وهاوەڵانی دادەبەزن لەسەر كێوی "طور" بەرەو نزمایی ولێژایی سەر زەوی وبیابانەكان... جێگەی هیچ بستێك نابینن وبەدەستیان ناكەوێ ئەگەر نەرم وچەورایی وبۆگەنیوی پێی نەگەیشتبێ، بۆیە ئەم حاڵەتە زۆر عیسا ﷺ هاوەڵانی ناڕەحەت دەكات وبێزار دەبن لە بۆنی

ناخۆشی وبۆگەنیوی، لەبەر ئەوە عیسا ﷺ وهاوەڵانی دەست دەكەنەوە بە دوعا وپاڕانەوە بۆ ئەوی خودای گەورە زەوی خاوێن بكاتەوە لە چەوری وبۆگەنیوی یەئجووج ومەئجوج... خودای گەورە پاڕانەوەكەیان لێ پەسند دەكات، ویەكسەر باڵندەی مل درێژ دەنێرێ تەرمەكان هەڵدەگرن، دەیانبەن بۆ ئەو شوێنەی كە خودای گەورە خۆی فەرمانی پێداون بیان بەن.

٣٥- خودای گەورە حاڵ وشێوازی زەوی وخەڵكانی هاوەڵانی عیسا وپێغەمبەر عیساش بەخۆی دەبینێ ودەزانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان دوعایان كرد، ئینجا خودای گەورە ڕزگاری كردن لەو بۆگەنیویە... كەواتە ئێمە هەر پێویستیەكمان هەبوو ئەبێت بپاڕێنەوە بۆ لای خودای گەورە نەڵێین خودای گەورە حاڵمان دەبینێ ودەزانی چیمان پێویستە، بەڵێ ڕاستە خودای گەورە حاڵ وشێوازو پێویستیمان دەبینی، بەڵام خودای گەورە حەزی بەوە دێت كە بەندەكانی سكاڵا ونووزانەوەی خۆیان بۆ لای ئەو ببەنەوە، حەزی بە بیستنی دەنگی موسڵمانانە بۆ پاڕانەوەكان.

٣٦- دواتریش خودای گەورە بارانێكی زۆر وگەورە وبە ڕەحمەت دەنێرێ هیچ ماڵ وخانوو پارچە زەویەك نامێنێ مەگەر ئەو بارانە بە ڕەحمەتەی پێ نەكەوێت زەوی لە بۆگەنیوو چەورایی تەرمەكانی یەئجوج ومەئجوج خاوێن دەكاتەوە... وەك ئاوێنەی لێ دەكات لەخاوێن وباوێنیدا.

### ٣٧- دواتر خودای گەورە فەرمان بە زەوی دەدات بەرەكەتی خۆی دەربخات:

أ- بەرووبوومەكانت (بەرهەمانت) بڕوێنە.

ب- بەرەكەت وپیرۆزی زیاد كردنی بەرهەمەكانت دەربخە تا ئەو پەڕی زیاد كردن.

٣٨- بۆیە لەو ڕۆژەدا چەند كەسانێك لەیەك سەركە هەنار دەخۆن وپێی تێر دەبن... لە كاتی گەرمای نیوەڕۆدا توێكلی هەنارەكە دەكەنە سێبەر بۆ خۆیان، بۆ زانین ئەو

زەلامانە هەر وەك زەلامی ئەمڕۆی خۆمانن بەلأم توێكلّی هەنار زیاد لە سنوور گەورەیە.

**٣٩- بەرەكەت وزیاد بوون دەكەوێتە مەڕوو مالأت وحوشترەوە بەم شێوەیە:**

أ- ئەو حوشترەی كە تازەی بێچووی بووە ئەوەندە شیرەكەی زۆر وبەبەرەكەت ولەدوا نایەت تەنها شیری یەك حوشتر بەشی كۆمەلّە كەسانێكی زۆر دەكات لە خەلّكی وپێ ی تێر دەخۆن.

ب- تەنانەت شیری یەك مەڕ بەشی سەرجەم ئەندامەكانی خێزانێك یان بەرەبابێك دەكات هەر چەند زۆر بن ئەو بەرەباب وخێزانە.

٤٠- خەلّكی وا لەم خۆشی وبەرەكەت وبەختەوەرییەدا دەژین هەتا ئەوەندەی تر كە خودای گەورە خۆی حەزی پێیە ونوسیویەتی لەو خۆشیەدا بژین ، لە كاتێكا كەخەلّكی ئا بەو شێوەیە لەخۆشیدا خودای گەورە هەوایەك وبایەك دەنێرێ دەیانگرێتەوە بەبنی بالّیانەوە بۆیە ئالەو كاتەدا ئەوەی موسلّمان وباوەڕدار بێت خودای گەورە ڕۆحی دەكێشێ بەبێ ئەوەی ئەوان زۆر ئازاری ڕۆح كێشانە بزانن.

٤١- لە دواتریش تەنها كافرەكان دەمێننەوە كە ئەو هەواو بایە ئەوان ناكوژێت، چونكە خودای گەورە وەك ڕەحم وبەزەیی یەك بۆ موسلّمانان وباوەڕداران دەنێرێ كە ڕزگاریان بكات، ناخۆشی یەكان وبەسەرهاتەكانی كۆتایی هاتنی ژیان لەسەر ڕووی ئەم زەویە.

تەنها ئەو كەسە زۆر خراپانە دەمێننەوە بۆ بینی بەسەرهاتەكانی ڕۆژی دوایی وناخۆشی وئاستەنگەكانی، هەر كەسێك لەو بەدكارانە كە نیشانەی ڕۆژی دوایی لێهات ئەو كات بڕوا وباوەڕ دەهێنی ودەگەڕێتەوە، بەلأم باوەڕەكەی لێ وەرناگیرێت ﴿لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَالَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا﴾.سورةالانعام الاية( ١٥٨)

٤٢- بەدکاران پێش هاتنی ڕۆژی دوایی دەست دەکەنەوە بە بەدکاری خۆیان وزۆر بێ شەرمانە دەکەونە داوێن پیسی وزینا کردنەوە وەك چۆن گوێ گوێ درێژ سواری گوێ درێژ دەبێت لە ڕۆژی نیوەڕۆدا وبە پێش چاوی هەموو خەڵکی یەوە وهیچ شەرم وحەیا وحیساب بۆ هیچ کەس ناکرێت لەسەر شەقام وجاددە وکۆڵانەکان دەست دەکرێت بە داوێن پیسی وبەد ڕەوشتی، ئا لەو کاتەدا کە ئەوان مەستی کاری سێکس وبەرەلآیین بە بێ هیچ سانسۆرێك ڕۆژی دواییان بەسەردا هەڵ دەستێ.

**هیچ کەس بە ئەندازەی پێغەمبەر(ﷺ) خەمخۆر نیە بۆهەموو جیهانەکان ؟**

بەڵێ هیچ کەس بەئەندازەی پێغەمبەر(ﷺ) خەمخۆر نیە بۆهەموو جیهانەکان ئەمەش ئەو دەقەی قورئان دووپات دەکاتەوە ((**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ** {107})) سورة الانبياء

واتە ناردنی تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) تەنهامەبەست بەمیرەبانیە بۆ هەموو جیهانەکان؛ جیهانی مرۆڤ ،جیهانی گیانلەبەران ، جیهانی ڕووەکەکان، جیهانی جۆکەکان،بۆ هەموو ژینگە و بوژینی دونیاو ژینی دوارۆژ....

*************************************************

***************************

# ( محاجة الجنة و النار )

عن ابي هريرة رضي الله عنه قال : قال النبي ﷺ : تحاجت الجنة و النار فقالت النار : اوثرت بالمتكبرين و المتجبرين .و قالت الجنة : ما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس و سقطهم ، قال الله تبارك و تعالى للجنة :أنت رحمتي أرحم بك من أشاء من عبادي ، و قال للنار :انما انت عذاب أعذب بك من اشاء من عبادي ، ولكل واحدة منهما ملؤها ، فاما النار فلا تمتلىء حتى يضع رجله فتقول : قط قط قط فهناك تمتلىء ، ويزوي بعضها إلى بعض ، ولا يظلم الله عز وجل من خلقه أحداً ، وأما الجنة فإن الله عز وجل ينشىء لها خلقاً )) . (١)

## دەروازەی: مشت ومڕی نێوان بەهەشت ودۆزەخ

عن ابي هريرة رضي الله عنه قال : قال النبي ﷺ : تحاجت الجنة و النار له باوكى هورەيرەوە –ڕەزای خوای لێبێ- وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: { بەهەشت ودۆزەخ مشت ومڕیان کرد ، فقالت النار : اوثرت بالمتكبرين و المتجبرين دۆزەخ هاتە قسە وگفت و ووتی: ((من لە تۆ چاکترم ئەی بەهەشت چونکە خۆ بەزل زانان وخۆ بەگەورە زانان ئەشکەنجە وئازار دەدەم)) و قالت الجنة : ما لي لا يدخلني إلا ضعفاء الناس و سقطهم بەهەشتیش هاتە قسە وگفت و ووتی: ((ئەی من چیمە کە تەنها هەژار ونەدارەکان

---

(١)أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٤٨٥٠ ). ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٨٤٦ ) ( ٣٦ ) وأحمد في المسند برقم ( ٨١٦٤ ) وعبد الرزاق في المصنف برقم ( ٢٠٨٩٣ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٧٤٤٧ والبغوي في شرح السنة برقم ( ٤٤٢٢ ) والبيهقي في الأسماء والصفات ( ص ٣٤٩-٣٥٠ ) وابن خزيمة في التوحيد ( ٢١٢/١-٢١٣ ) من طريق عبد الرزاق عن معمر عن همام عن أبي هريرة رضي الله عنه به وأخرجه مسلم في صحيحه ( ٢٨٤٦ ) ( ٣٥ ) والنسائي في سننه الكبري برقم ( ١١٥٢٢ ) والطبري في تفسيره ( ١٧٠/٢٦-١٧١ ) وعبد الرزاق في المصنف برقم ( ٢٠٨٩٤ ) وأحمد في المسند ( ٢٧٦/٢ ) من طرق عن أيوب عن محمد بن سيرين عن ابي هريرة رضي الله عنه به .

وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٧٤٤٩ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٨٤٦ ) ( ٣٤ ) و ( ٣٥ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٧٤٧٧ ) إحسان والحميدي في مسنده برقم ( ١١٣٧ ) والآجري في الشريعة ( ص ٣٩١ ) من طرق عن الأعرج عن أبي هريره رضي الله عنه به .

دەخرێنە ناو منەوە)) **قال الله تبارك و تعالى للجنة :أنت رحمتي أرحم بك من اشاء من عبادي** خودای گەورە لە وەڵامدانەوەی بەهەشتدا فەرمووی: ((تۆ میهرەبانی وسۆزی منی ئەی بەهەشت بۆ هەر کەسێك کەمن بمەوێ سۆز ومیهرەبانی پێ بکەم)) ، **و قال للنار :انما انت عذاب أعذب بك من اشاء من عبادي** خودای گەورە بە ئاگری دۆزەخیشی فەرموو: ((تۆ ئەی ئاگری دۆزەخ تەنها بریتی لە سزا وتۆڵە وئەشکەنجە وئازاری من بۆ هەر کەسێك کە خۆم بمەوێ بە تۆی ئازار بدەم، **ولكل واحدة منهما ملؤها ، فاما النار فلا تمتلىء حتى يضع رجله فتقول : قط قط قط فهناك تمتلىء ، ويزوي بعضها إلى بعض ، ولا يظلم الله عز وجل من خلقه أحداً ،** بۆ هەر یەکێك لە ئێوە ئەی بەهەشت ودۆزەخ پڕ بوون ولیپان لیپتان بۆ هەیە)) **فاما النار فلا تمتلىء حتى يضع رجله** ئاگری دۆزەخ بە هیچ شتێك پڕ نابێ، چونکە هەرچی بخرێتە ناوی زیاتر ئاگرەکەی خۆش دەکات هەتا خودای گەورە خۆی بەزاتی پیرۆزی خۆی پێی ئەخاتە ناو ئاگرەکە ئەو کاتە دۆزەخ هاوار دەکات **فتقول : قط قط قط فهناك تمتلىء** دەڵێت: "قط، قط، قط" بەسە بەسە بەسە، ئەو کات دۆزەخ پڕو لیپان لیپ دەبێت، **، ويزوي بعضها إلى بعض** هەندێك لە خۆی بۆ خۆی دەخواتەوە **ولا يظلم الله عز وجل من خلقه أحداً** (( خودای گەورە ستەم کار نیەو ستەم لە هیچ کەسێك ناکات))، **وأما الجنة فإن الله عز وجل ينشىء لها خلقاً** ))بەلاّم خودای گەورە بۆ بەهەشت خەڵکانێکی تر بۆ پڕ بوونی دروست دەکات }

## لێکدانەوەی زاناکان

باب : محاجة الجنة والنار{تحاجت الجنة والنار} دەروازەی مشتومڕدۆزەخو بەهەشت لە نێوان یەکتردا مشت ومڕیان کرد بێ، یان زمان حاڵیان ئەوە بێت لە خودای گەورە پرسن ئەمەش مەرج نیە دووبا رە بێتەوە تەنها بۆ جارێك بوو بێت و وەڵامیان درا بێتەوە.

{الا ضعفاء الناس} ئەوانەی کە خەڵك گرنگیان پێ نادەن لەبەر لاوازیان وهەژاریان وسادەو ساویلکەی یان. . وسقطهم} ئەوانەن کە پێش چاو خەڵکیدا ڕێز لێ نەگیراون بەلاّم لەلای خودای گەورە ڕێز لێ گیراون { ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر لەخودا دەترسن هیچ فیز وخۆ بەگەورە زانینێکیان نیە خودای گەورەش ئەم پاداشتەیان دەداتەوە

{وما تواضع احد الا رفعه الله} کاتێك وشەی "الا" بەکار هاتووە ئەومیە زۆرینەی بەهەشتیەکان لە هەژار وداماوەکانن، بەڵام شەهیدان وزانایان پێشتریش پێغەمبەران ﷺ لە شوێنی زۆر گەورە وبەرزدان لە بەهەشتدا کە ڕادە وڕێژەی ئەمانە زۆر کەمترن لەبەرامبەر هەژارەکان.

{حتی یضع رجله} لە ڕوایەتی موسلیمدا هاتووە {حتی یضعه الله رجله} ئەمەش دووپاتی دەکاتەوە تا ئێمە تێبگەین لە فەرموودەکان.

بەڵام بەهیچ شێوە وشێوازێك مرۆڤ بۆی نیە شێوازی پێی خودای گەورە لێکبداتەوە بە شێوازی هیچ جۆرە دروستکراوێکی تر،﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ {١١}﴾ السورة الشوری الایة گرنگ ئەومیە خودای گەورە سۆزی دەبێت بۆ ئەوەی ئیتر لەوە زیاتر خەڵکی نەچێتە دۆزەخ بێ گومان لە خراپەکاران.

ئیمام ئەلبەغەوی دەڵێت: لەدوای باس کردنی سیفەتەکانی خودای گەورە کە پاك وبێگەردە لە هیچ شێوە وشێوازێك وبۆچوونێك هەر سیفەتێك کە لەم بارەوە هاتبێت لە قورئان وسوونەتدا وەك دەست وپەنجەکان وچاو وهاتن وچوون... باوەڕپێان فەرز و واجبە، لێنەکۆڵینەوەیان بە شێوەیەك کە دوورت بخاتەوە لە واتاکانی وچواندنی بەهەر جۆرە دروست کراوێك فەرز و واجبە، ئینسانی باوەڕدار ئەومیە ڕێگەی خۆدان بەدەست هەر واتای فەرموودەیەك بێت، ئەوەی ڕووچوونی تیادا بکات لەسەر لێشواوان دەبێت وئەوەی باوەڕ ی پێ نەهێنی ئەوا سیفەتەکانی لە خودای گەورە داڕنیوە.

ئەوەی دەیگونجێنێتەوە ودەینوێنی ئەوە سیفەتە دروست کراوانی وەك سیفەتەکانی خودای گەورەی لێکردووە خودای گەورە پاك وبیگەردە وبەرز وبڵندە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ {١١}﴾سورة الشوری الایة بڕوانە شرح نووي بۆ مسلم ترقیم محمد فؤاد عبدالباقي تحقیق شیخ عرفان، بڕوانە صحیح ابن حبان ژمارە ٢٦٨ و٧٤٤٧وشەی زۆر بە پێزی لێ دەبیستی ودەبینی.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودە:

١. بەهەشت ودۆزەخ دروست کراوی خودای گەورەن وله فەرمانی خودای گەوره دەرچوونیان نیه.

٢. مشت ومڕی بەهەشت ودۆزەخ شێوەکەی دیار وڕوون نەکراوەتەوە، بەڵام ئێمە وەك باوەڕدار چونکه له فەرموودەدا هاتووە باوەڕی پێ دێنین.

٣. **هۆی شێوازی ڕوون نەکردنەوەی شێوازی مشت ومڕەکەی نێوان بەهەشت ودۆزەخ چەند حیکمەتێکی تێدایه:**

**حیکمەتی یەکەم:** چونکه ئێمە ناتوانین تێی بگەین ئەو شێوازه لەسەرووی دەرکی مرۆڤه ودەرکی مرۆڤیش سنوورداره،

**حیکمەتی دووەم:** بۆ تاقی کردنەوەی کەسی باوەڕداره له کەسی بێ باوەڕ.

**حیکمەتی سێیەم:** هیچ سوود نیه له زانینی شێواز وچۆنیەتی مشت ومڕی نێوان بەهەشت ودۆزەخ، نەهیچ زیانێکی هەیه له نەزانینی شێوازی مشت ومڕی نێوانیان، ئەگەر بەم شێوازه نەبووایه خودای گەوره ڕوونی دەکردەوە لەڕێگەی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئێمە.

٤. دۆزەخ فەخری کرد بەوەی که خۆ به گەوره زانان وفیزکاران ودڵ ڕەقەکان ئەشکەنجە وئازار دەدات.

٥. بەهەشت فەخر وشانازی بەوەوە دەکات که جێی حەوانەوەی هەژار وبێ نەوازانە، چونکه دان بەخۆدا گر بوون وچاوەڕوانی پاداشتی بەهەشت بوو بوونەوە.

٦. هەر کەس لەسەریەتی خزمەتی خۆی بکات بەو شت وکارو فەرمانەی که پێی سپێردر اوه بەبێ ئەوەی بۆی هەبێت شانازی بکات بەسەر کەسانێکی تردا که جۆرێك له جۆرەکانی کار کردنیان پێ سپێرا بێت.

٧. هیچ کەس زیاد له سنووری خۆی بەخۆیدا نەڵێت ڕۆچوون نەبێت.

٨. هیچ کەس کارو کردارو وتەی خەڵکی به کەم نەزانێت.

٩. ئەگەر بەهرەمەندی سوود بەخەڵك دەگەیەنی لە ڕوویەك لە ڕووەكانەوە بزانە ئەوە تەكلیفە نەك تەشریف بێت، واتە ئەبێت بەو كارە هەستی بە پێویستی خۆی نەك لەبەر ئەوەی تۆ ڕێزت هەیە وئەو كارەت پێ سپێرا بێت تۆ بۆ حەز وئارەزووی خۆت بەكاری بهێنیٚ.

١٠. هەر بەهرەیەكی تۆ كە بەسوود وقازانجی خەڵكی تەواو بێت ئەوە میهرەبانی خودایە كە تۆی موسەخەر كردووە بۆ گەیاندنی ئەم سوود وقازانجە.

١١. ئەگەر دەسەڵات داری بەپێی دەسەڵاتداری خۆت ڕێگەی خراپەكاران دەگۆڕێت وتۆڵەی هەژارەكان وزیادە ڕەوی وكەم كورپەكانیان لیٚ دەكەوێتەوە، بزانە تۆ خودای گەورە تۆی بەگەڕ خستووە بۆ ئەم كارە وبەڕێك وپێكی ئەنجامی بدە وستەم لەكەس مەكە بۆ كەسێكی تر...

١٢. سۆزو پەیمانی خودایە كە بەهەشت ودۆزەخ پڕ بكاتەوە بە بیٚ ئەوەی هیچ ستەمێك لە بەندەیەك یان دروست كراوێك بكات...

١٣. خودای گەورە بەهەشت بەمیهرەبانی خۆی بەهەر كەسێك بدات بە حەزی ویستی خۆیەتی هیچ ستەمێكی تێدا نیە، چونكە ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ٢٣﴾ سورة الانبياء، خودای گەورە لێپرسینەوەی لیٚ ناكریٚ بەڵكو خەڵكی لێپرسینەوەیان لیٚ دەكریٚ لە كردار و وتەكانیان، چونكە ئێمە موڵكی خوداین هیچ چاكەمان نیە بەسەر خودد بەڵكو بە پێچەوانەوە هەر شتێكمان هەبێت لە خێر وخۆشی لە خوداوەیە وهەر شتێكمان هەبێت لە ناخۆشی لەخۆمان وشەیتانەوەیە، ﴿وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾ سورةالشورى ٦ الاية . خودا كافر بوونی بەندەكانی ناویٚ، كەواتە خودا فەرمان ڕەوایی خۆی دەویٚ وهەر كەس فەرمان ڕەوایی خودای گەورە بكات ئەوا چاوەڕوانی پاداشت بێت خودای گەورە حەزی بە پاداشت دانەوەی دەكات.

هەر كەسێكیش فەرمانی خودای گەورە بشكێنی وسنوورەكانی ببەزێنی وگویٚ ڕایەڵی فەرمانی خودای گەورە نەكات، خودای گەورە حەزی بۆ ئەو كەسە ئەوەیە تۆڵە وسزای فەرمانی شكاندنەكەی بداتەوە ولێبكاتەوە، بەتایبەتی لایەنی "شیرك" هاوەڵ پەیدا

كردن بەهەموو جۆرەكانیەوە بەهیچ شێوەیەك خودای گەورە حەزی بەوە نابێت لە لێخۆشبوون ومیهرەبانی بۆ ئەو جۆرە كەسانە بڕوانێ وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ﴾ {١١٥} سورة النساء واتە: خودای گەورە بەهیچ شێوەیەك لەو كەسە خۆش نابێ هاوەڵی بۆ پەیدا بكات.

١٦. لە میهرەبانی وسۆزی خودای گەورەیە كە بە بەرد وشاخەكان دۆزەخ پڕی دەكاتەوە، بەڵام هەر پڕ نابێتەوە هەتا خودای گەورە خۆی پێی ئەخاتە ناو ئاگری دۆزەخ بۆ بێ دەنگ كردنی لە وەڵامی دۆزخدا ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ {٣٠} سورة ق: بەو پێ خستنە ناو ئاگری دۆزەخە دۆزەخ پڕ ولیپان لیپ دەبێت وخۆی بەخۆی خۆی دەخواتەوە وهاواری بەس بوون دەكات (قط قط قط) بەسە بەسە بەسە.

١٧. ئێمەی موسڵمان لە چۆنیەتی پێی خودای گەورە ناپرسین وهزر وبیر بۆ هەر چی بچێت لە شێوازی پێی خودای گەورە ئەوە پێچەوانەی پێی خوای گەورەیە چونكە خودای گەورە خۆی دەفەرمووێت ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ {١١} سورة الشورى الاية هیچ شت وكەسێك وێنە وشێوازی خودا نیە.

كاتێك موسا پێغەمبەر ﷺ داوای ئەوەی كرد كە خودای گەورە دەرفەتی بدات بۆ ئەوەی شاد وكامەران بێت بە بینین وڕوانین بۆ خودای گەورە كە فەرمووی: ﴿وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَـكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ موسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَقَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ١٤٣﴾. سورة الاعراف

واتە: موسا داوای كرد لە خودای گەورە وئەی پەروەردگارم خۆت وگەورەیی خۆتم پێ نیشان بدە ئەمەوێ بڕوانم بۆ تۆ؟ خودای گەورە لە وەڵامدانەوەی فەرمووی: تۆ ناتوانی من ببینی، بە ووشەی "لن" واتە محاڵە لە دونیادا تۆ وهیچ كەسێكی تر بتوانن خودای گەورە ببینن...بەڵام خودای گەورە فەرمووی بڕوانە بۆ ئەو كێوە ئەگەرخۆی ڕاگرت

لەبەر گەورەیی من ئەوکات تۆیش ئەی موسی من دەبینی، کاتێك خودای گەورە خۆی نیشان کێوەکەدا یەکسەر کێوەکە روچوو بە زەویدا وموساش کەوت وبوراوەولەخۆچوو... ئەمە حاڵ وشێوازی پێغەمبەرێك بێت لە پێغەمبەرە "اولو العزم"ەکان ویەکسەر وبێ نێوان وتەی لەگەڵ خودای گەورەدا دەکرد ئەی ئەبێ حاڵ وشێوازی خەڵکانی تری وەکو ئێمە چۆن بێت بۆ دەرك کردنی شێواز وچۆنیەتی سیفەتەکانی گەورە.

ئەم سیفەتانەی خودای گەورە هەموو لە "الغیبیات" میتافیزیقیا " ماوراء الطبیعة المحسوسة"یە، ئێمەی باوەڕدار مەرجە باوەڕ بە نهێنیەکانی بهێنین "نادیارەکان". ﴿وتؤمنون بالغیب﴾سورە البقرە سیفەتی خودای گەورە لە گەورە نیهینیەکانە.

١٦. خودای گەورە ستەمی لەسەر خۆی حەرام کردووە بەرامبەر هەموو دروست کراوانی بە بێ جیاوازی بۆ زیاتر تێگەیشتن لە شێوازو چۆنیەتی قەدەغە کردنی ستەم لە نێوان ئێمەشدا بگەڕێوە بۆ فەرموودەی {یاعبادي ان حرمت الظلم على نفسي فلا تظالموا...} واتە: ئەی بەندەکانم من ستەمم لەسەرخۆم بەرانبەر ئێوە حەرام کردووە لەسەر خۆم دەسائێوەش ستەم لەیەکتری مەکەن هەر لەم پەرتووکەدا...

١٧. بەهەشت گەورە ترە لە دۆزەخ، ئەمەش میهرەبانی وسۆزی خودای گەورە دەردەخات چونکە بەهەشت هەشت دەرگای هەیە ودۆزەخ تەنها حەوت دەرگای هەیە.

١٨. لەگەورەیی بەهەشت کە پڕ نابێتەوە، خودای گەورە دروست کراوانی تری بۆ دروست دەکات بۆ پڕ کرنەوە وپڕ بوونەوەی بەهەشت.

## کەسی بەهرەمەند ڕێز لێگیراوە یان تەکلیف پێکراوە؟!

با هەر کەس لەوبەهرەیەی کەخودا پێی بەخشیوە پێی نە نازێت بەڵکو خودا ی گەورە فەرمان و تەکلیفی بەجێهێنان و وەگەڕخستنی لێکردووە بۆخزمەتکردنی دروستکراوانی خودا....

************************************

## ( الصفات التي يعرف بها في الدنيا أهل الجنة وأهل النار )

**عن عياض بن حمار المجاشعي رضي الله عنه أن رسول ﷺ قال يوم في خطبته :**

**( ألا إن ربي أمرني أن أعلمكم ما جهلتم مما علمني يومي هذا : كل مال نَحَلتُهُ عبداً حلال واني خلقت عبادي حنفاء كلهم وإنهم أنهم أتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم وحرمت عليهم ما أحللت لهم وأمرتهم أن يشركوا بي مالم أنزل به سلطاناً ).**

**وإن الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم عربهم وعجمهم إلا بقايا من أهل الكتاب ، وقال : إنما بعثتك لأبتليك وأبتلي بك وأنزلت عليك كتاباً لا يغسله الماء تقرؤه نائماً ويقظان .و إن الله أمرني أن أحرق قريشاً فقلت : رب إذاً يثلَغوا رأسي فيدعوه خبزة قال :استخرجهم كما استخرجوك ، واغزهم نُغزك وأنفق فسننفق عليك ))( ١))**

**دەروازەی: نیشانەکانی ناسینەوەی بەهەشتی یەکان ودۆزەخی یەکان هەر لە دونیادا...**

**عن عياض بن حمار المجاشعي رضي الله عنه أن رسول ﷺ قال يوم في خطبته :لە عیازی کری حیماری ئەلەجاشعیەوە رەزای خودای لێبێ بەراستی پێغەمبەر ﷺلە رۆژی هەینی فەرمووی: ألا إن ربي أمرني أن أعلمكم ما جهلتم مما علمني يومي هذا {ئاگادار بن خودای گەورە فەرمانی پێ کردووم ئەوەی کە ئێوە نایزانن فێرتان بکەم لەوەی کە ئەمڕۆ**

---

(١) أخرجه أحمد في المسند برقم ( ٢١٤٥٩ ) من طريق يزيد بن هارون عن سفيان عن الحكم عن إبراهيم التيمي عن أبيه عن أبي ذر رضي الله عنه به .

وإسناده صحيح

وأخرجه مختصرا أبو داود في سننه برقم ( ٤٠٠٢ ) والحاكم في السمستدرك ( ٢/٢٤٤ ) من طريق يزيد بن هاروون به .

وصححه العلامة الألباني رحمه الله في صحيح سنن أبي داود برقم ( ٣٣٨٠ )

وأخرجه البخاري في صحيحه بالأرقام ( ٣١٩٩ ، ٤٨٠٢ ، ٧٤٢٤ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ١٥٩ ) ( ٢٥٠ ) والترمذي في سننه برقم ( ٢١٨٦ ) ( ٣٢٢٨ ) والنسائي في سننه الكبرى برقم ( ١١٤٣٠ ) وأحمد في المسند برقم ( ٢١٣٥٢ ، ٢١٥٤١ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦١٥٤ ) من طرق الأعمش عن إبراهيم التيمي به ، بلفظ )

خودای گەورە منی لێ فێر کردووە، : كل مال نَحَلتُهُ عبداً حلال هەر ماڵ وسامانێك كەمن بە ئێوەی بدەم ئەوە بۆ ئێوە حەڵاڵە،وأني خلقت عبادي حنفاء كلهم وإنهم أتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم وحرمت عليهم ما أحللت لهم وأمرتهم أن يشركوا بي مالم أنزل به سلطاناً ).

(( هەموو بەندەكانی خۆمم لەسەر ڕێگەی ڕاست دروست كردووە، هیچ هاوەڵ پەیدا كردنیان نیە)) و وإنهم أتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم ((بەڵام شەیتانەكان هاتن وڕێگەیان لێ گرتن ولەسەر ئاینیان لادان)) وحرمت عليهم ((هەر شتێك كە من بۆ ئەوانم حەڵاڵ كرد بوو شەیتانەكان لەسەریان حەرام كردن ما أحللت لهم وهەر شتێك كەمن لەسەر ئەوانم حەرام وقەدەغە كردووە شەیتانەكان بۆیان حەڵاڵ كردن، وأمرتهم أن يشركوا بي مالم أنزل به سلطاناً ). وفەرمانی هاوەڵ پەیدا كردنی پێ كردن كەمن هیچ زانستێكی هاوەڵ پەیدا كردنم بۆ دانەبەزاندوون))

وإن الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم عربهم وعجمهم إلا بقايا من أهل الكتاب

(( خوای گەورە ڕوانی وسەیری خەڵكانی سەر زەوی كرد فمقتهم عربهم وعجمهم ڕقی لە هەموویان بوویەوە لەبەر هاوەڵ پەیدا كردن بۆ خودا وحەڵاڵ وحەرام كردنەكانی خۆیانەوە وسنوور شكاندنەكانەوە)) بە ڕەگەزی عەرەب وعەجەمەوە ((واتە تێكڕای مرۆڤایەتی)) إلا بقايا من أهل الكتاب تەنها وبێجگە لە كەسانێكی كەم كە ماونەتەود لەسەر پەرتووكە ئاسمانیەكانی پێش تر...

، وقال : إنما بعثتك لأبتليك وأبتلي بك وأنزلت عليك كتاباً لا يغسله الماء تقرؤه نائماً ويقظان

خودای گەورە فەرموویەتی بە پێغەمبەر ﷺ ((تۆم ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە ناردووە خەڵكیت بە ئەزموونداا پێ ببەم وأنزلت عليك كتاباً قورئانێكم بۆ ناردووی لا يغسله الماء بەهیچ ئاوێك " ناشۆرێتەوەمەبەست ئەوەیە هەردەم دەمینێتەوە تا ڕۆژی دوایی" تقرؤه نائماً ويقظان تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ دەتوانی ئەو قورئانە بخوێنی بە خەوتووی وهۆشیاری یەوە))

و إن الله أمرني أن أحرق قريشاً فقلت : رب إذاً يثلغوا رأسي فيدعوه خبزة قال :استخرجهم كما استخرجوك ، واغزهم نُغزك وأنفق فسننفق عليك ))

((خودای گەورە فەرمانی پێكردم كە قورەیش بسوتێنم فقلت : رب إذاً یثلغوا راسي پێغەمبەر ﷺ ئەوان سەری من دەشكێنن فیدعوه خبزة وەك پاروویەك نان بانگی دەكەن)) مەبەست ئەوەیە پێغەمبەر تكای لەلای خودای گەورە كرد تۆلە وسزادانی قورەیش دوا بخات...

ئینجا خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ كرد قال :استخرجهم كما استخرجوك فەرمووی: تۆ قورەیش یەكان دەربكە وەك چۆن تۆیان دەركرد ((مەبەست بە قورەیشی یەكان ئەوانەیانە كە باوەڕ ناهێنن وئازاری پێغەمبەریان داو دەریان كرد)) واتە وەك تاوانی خۆیان تۆلەیان لی بكەوە، بەلأم پێغەمبەر ﷺ لێیان خۆش بوو، واتە پێغەمبەر ﷺ بۆی هەبوو تۆلەیان لێ بكاتەوە ودەریان بكات لە شاری مەككە وەك چۆن ئەوان پێغەمبەریان ئازار دا ودەریان كرد لە شاری خۆی... بەلأم پێغەمبەر ﷺ لە ماق ڕەوای

خۆی خۆش بوو وهەموویانی ئازاد وسەربەست كرد، هەر ئەمەش لە پێغەمبەر ﷺ دەوەشێتەوە چونكە بەڕاستی ﴿وانك لعلى خلق عظيم﴾ی بەجێ هێناوە.

(واغزهم نُغزك وأنفق فسننفق عليك))

( تۆ تێكۆشانیان بكە ئێمەش هاریكاری ویارمەتی تۆ دەدەین بۆ ئەوەی زاڵ ببیت بەسەریاندا)) وأنفق فسننفق عليك))خەرجی بكەو كۆمەكی هەژاران بكە خودای گەورە بۆت پڕ دەكاتەوە)) ((سوپا بنێرە بۆ تێكۆشان، ئێمە پێنج ئەوەندەی لەگەڵ دەنێرین بۆ سەر خستن... با ئەوانەی گوێڕایەلی تۆن تێكۆشان وخەبات بكەن دژی ئەو كەسانەی كە سەرپێچی بۆ دەكەن)).

## لێكدانەوەی ئەم بەشە لە فەرموودەكە لەلایەن زانایانەوە

## باب الصفات التي يعرف بها في الدنيا اهل الجنة واهل النار

{كل مال نحلته عبدا حلال} مەبەست ئەوەی ئەوان حەلألی خودیان زۆر لەسەر خۆ حەرام دەكرد.

{واني خلقت عبادي حنفاء كلهم} هەموویان باوەڕدارن یان خاوێنن لە تاوان وسەرپێچی كردنی خودا

{وانهم اتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم} شەیتانەکان لە ڕێگەی خودا لادان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کاریگەری کۆمەڵگا ودەوورو بەر بۆ چاکی وخراپی مرۆڤ.

{ وإن الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم عربهم وعجمهم إلا بقايا من أهل الكتاب } چونکە هەموویان ڕێگەی چەوتیان گرتبووە مەگەر تەنها کەسانێکی کەم نەبێت لەسەر ئاینی موسا وعیسا وئیبراهیم مابوونەوە لە پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام بە هاتنی پێغەمبەر ﷺ هەموو نەسخ بوونەوە، ئەبێت ئیمان وباوەڕیان نوێ بکەنەوە بە پێغەمبەری خۆمان یاسا وبیروباوەڕیان بە پەیڕەوکلری پێغەمبەری خۆمان بێت.

{، وقال : إنما بعثتك لأبتليك وأبتلي بك وأنزلت عليك كتاباً لا يغسله الماء تقرؤه نائماً ويقظان .} بۆ ئەوەی بزانرێت کێ باوەڕ دێنێت.

{ وأنزلت عليك كتاباً لا يغسله الماء تقرؤه نائماً ويقظان....} پارێزراوە لە گۆڕین خەڵکی هیدایەت دەدات بۆ لەبەر کردنی.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی ئەم فەرمموودە بۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. ئەوەی خێری دین ودونیای تیادا بێت خودای گەورە ئێمەی لێ فێر دەکات لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە ﷺ.

٢. ڕۆژ بەڕۆژو نیگا بە دوای نیگادا بەسەر پێغەمبەر و ﷺ هاوەڵانی لێ فێر دەکرد، ئێمەش هەر شتێك فێر بین پێویستە ئێمەش خەڵکانی تری لێ فێر بکەین.

٣. هەموو شتێك حەڵاڵە لەماڵ وسامان مەگەر شتێك نەبێت کە خودای گەورە حەرامی کرد بێت.

٤. بەندەکانی خودا ودروست کراوان هەموو لەسەر تەوحید وفیترەتن مەگەر شەیتان هاوەڵ پەیدا کردنی تیادا کرد بن.

٥. شەیتان هەوڵی ئەوە دەدات ئێمە لەسەر فیترەت لا بدات زۆرێك لە خەڵکیش شوێنی دەکەون ولەئایین ودین داریان دوور دەخاتەوە.

٦. لەتاوانە گەورەکانە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام حەلاڵ حەرام بکرێت بە پێچەوانەوەش.

٧. هاوەڵ پەیدا کردن هیچ بەڵگەی لەسەر نیە هەموو ئایینە ئاسمانیەکان بە تێکڕا بۆبن بڕکردنی هاوەڵ پە یدا کردن هاتوون وبۆ چەسپاندنی تەوحید هاتوون.

٨. لایەنی بیر وباوەڕ وعەقیدەی سەرجەم نەوە وپێغەمبەران هەر یەك عەقیدە وبیر وباوەڕە، بەڵام لە یاساکانی هەڵسوکەوت لە نێوان مرۆڤەکان وجیاوازی لە شێوازی پەرستنەکان هەیە.

٩. لەسەر زەوی کەس بە خاوێنی وبێگەردی نەمابووەوە بێجگە لە کۆمەڵ وکەسانێکی کەم نەبێت لەسەر ئایینە ئاسمانیەکاندا مابوون، بۆیە خودای گەورە پێغەمبەری ﷺ نارد بۆ ئەوەی خەڵك بگێڕێتەوە بۆ دۆخی تەوحید ودوور بن لە هاوەڵ پەیدا کردن.

١٠. ناردنی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خودای گەورەوە بۆ خەڵکی ومرۆڤایەتی بە گشتی یە تەنها بۆ عەرەب نیە وبەس.

١١. هەموو مرۆڤایەتی پێ تاقی دەبێتەوە ئاخۆ ئایا کێیان باوەڕی پێ دەهێنن وکێیان باوەڕی پێ ناهێنن.

١٢. جۆرێك لە تاقی کردنەوەکانی ئەوەیە ئایا خەڵکی بڕوا بە هەموو شەریعەتەکەی دێنن یان تەنها بە حەزی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن.

١٣. بۆ ڕێکیترلە تاقیکردنەوەکانی ئەوەیە ئایا باوەڕدارەکان خۆ ڕاگر دەبن لەسەر ئایین وئەو ناخۆشیانەی بەسەریان دێت.

١٤. تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ خۆیش تاقی دەکرێتەوە بە بۆچوونی من تاقی کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەیە بۆ خەڵکی بسەلێنێ کە ئەو پەری نموونەی وتەواوی مرۆڤ لە پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستە بێت..

قورئان ناشورێتەوە بە ئاو مەبەستی ئەوەیە هەردەم دەمێنێ وگۆڕانکاری وزیاد وکەمی تێادا ناکرێت هەتا خودای گەورە خۆی بەرزی دەکاتەوە بۆ لای خۆی، وەك دەفەرموویت ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ٩﴾ سورة الحجر الاية ٩

بەڕاستیی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارێ و، هەر خۆیشمانین ئاگادارو پارێزەریی‌و، لەدوژمنان ئەیپارێزین و ناهێڵین زێدو کەمی تێدا بکەن ، بۆیە ئەوە چەندین سەدە هات و چوو ، لەگەڵ ئەو هەموو دژو نەیارانەدا ، کەسێك نەیتوانیوە تەنها پیتێکی بگۆڕێ، یان لێی لاببات.﴾ .

{تقراه نائما ويقظان} چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بخەوێت بە چاوی دڵی ناخەوێت ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە، {ينام عيناي ولا ينام قلبي}.

١٥. لە دوای ئەوەی قورەیشیەکان باوەڕیان بەپێغەمبەر نەهێنا بەپێغەمبەر ﷺ وبوونە بەربەست لەگەیاندنی بانگەوازو موسوڵمانانی خەڵکی خودای گەورە فەرمانی

١٦. بە پێغەمبەر ﷺ کرد قورەیشیە بێ باوەڕەکان تەفر وتوونا بکات وماڵیان بسوتێنێ، بەڵام لەبەر سۆزی پێغەمبەر ﷺ بە قورەیش وهیوای ئەوەی کە خودای گەورە لە پشتی ئەو بێ باوەڕانەدا کەسانێك دروست بکات کە خودای گەورە بپەرستن، ئەمەش هەمان شێوەی ئەو فەرموودەیە کاتێك فریشتەی چیاکان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ بدات بەوەی ئەو دوو چیایە بە یەکەوە بنووسێنێ وهەموو ئەو خەڵکە بێ باوەڕانە نەمێنێ {ان اطبق عليهم الاخشبين؟} لەوەڵامدا پێغەمبەر ﷺ :نەخێر: {لعل الله يخلق في اصلابهم من يعبد الله}. هیوای ئەوەی کە خودای گەورە لە پشتی ئەو بێ باوەڕانەدا کەسانێك دروست بکات کە خودای گەورە بپەرستن،

١٧. فەرمووی ئەوان سەری من دەشکێنن، واتە بە قسەم ناکەن ودەبنە یەك کەس بۆ دژایەتیم.

**١٨. فەرمانی خودایە تۆڵە لە بێ بڕواکان بە دەستی پێغەمبەر ﷺ بسێنرێتەوە بە پێی کردەوەکەی خۆیان هەڵسووکەوتیان لەگەڵ بکرێتەوە بەم شێوەیە:**

أ- چۆن تۆیان لە شار و وولاتی خۆت دەرکرد تۆیش ئەی محەمەد ﷺ ئەگەر باوەڕیان نەهێنا دەریان بکە.

ب- تێکۆشان وخەباتیان دژ بکە، سۆز وپەیمانی خودای گەورەت پێ دراوە بە سەرخستنی تۆ بەسەر ئەواندا.

ت- خەرجی بکە وبەخشینت هەبێ، چونکە خودای گەورە پێت دەبەخشێتەوە.

پ- سوپا ڕێکخە وبینێرە بۆ جەنگ وخەبات بۆ چەسپاندنی هەق وڕاستی ونەهێشتنی ستەم وستەمکردن، ئێمە بە پێنج ئەوەندە سووپات لەگەڵ دەنێرین ئەوەی جێی ئاماژەیە، **ناردنی سوپای خودای گەورە بۆپشتەوانی و بەهێزکردنی موسوڵمانار چەند مەبەستێکی هەیە:**

**مەبەستی یەکەم:** وەك مژدەیەکە ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى لَكُمْ﴾ السورة ال عمران الا یة ١٢٥ خوای کارجوان ئەوەیشی هەر بۆئەوە کرد: ببێتە مژدەیەك بۆئێوە.

**مەبەستی دووەم:** بۆ دڵنیایی یە ﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ﴾ اسورة ال عمران الا یة ١٢٥﴾ وپێیشی دڵنیاو بەئارامبن. واتە: بۆیە خوا فەرمووی: ( الن یکفیکم..) و فریشتەیش هاتن تا ببێ بەمژدە بۆتان و دڵیشتان ئەستوور ببێ و، ئیتر لە زۆری ژمارەی ئەوان نەترسن.

**مەبەستی سێیەم:** بزانرێت سەرکەوتن تەنها لەلای خوداوەیە ﴿وَمَاالنَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ {١٢٦}﴾ اسورة ال عمران الا یة ١٢٥ ئەگینە خۆ سەرکەوتن تەنها بەدەستی خوای باڵادەست و کارجوانە، بەهێزو فریشتەو هۆ ئەسباب نیە، چونکە ئەر بیەوێ سەرتانخات، بێ ئەوش سەرتان دەخات

**مەبەستی چوارەم:** ﴿ ١٢٧ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ **اسورة ال عمران الا ية .**

خوا ویستی لەو ڕۆژەدا بەشێ لە بێ باوەڕان لەناو ببا، ئەوەبوو (۷۰) کەسیان – کە هەندێکیشیان رابەروسەرۆك بوون– کوژران ، (۷۰) کەسیشیان دیلکران

**مەبەستی پێنجەم:** ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا خَائِبِينَ {١٢٧﴾ اسوره ال عمران الا يه ١٢٥

یان بۆ ئەوە بیانشکێنێ و ریسوایان بکا ئەگەرنەکوژران ، ئەوجا بە نائومێدی و خەجالەتەوە بگەڕێنەوە.

**۱۹. ئەو کەسانەی باوەڕیان پێ هێناوی بیانکە بە تێکۆشەر وخەباتیان پێ بکە دژی ئەو کەسانەی کە گوێڕایەلی تۆ ناکەن، لە خالی(پ)دا ئەوە دەردەکەوێت پێویست بوونی تێکۆشان وخەبات لەسەر ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە پێویست وفەرزە.**

**۲۰. پێغەمبەر ﷺ ئەم لایەنانەی تیادا بەرجەستە بووە لەو پەڕی تەواوی وتیر وتەسەلیدا:**

**لایەنی یەکەم:** پیشەی پێغەمبەرایەتی وپێشەوایەتی وبەرێوەبردنی خەڵکی لەو پەڕی سۆز ومیهرەبانیدا.

**لایەنی دووەم:**

یەکەم پیاوی دەوڵەتە لە هەموو ڕوویەکەوە هەموو شتەکان بە دەستی ئەوە، چونکە لە خودای گەورە ڕێنمووی وەردەگرێت هیچ دووچاری هەڵە نابێت لە بڕیارەکانیدا.

**لایەنی سێیەم:**

دادوەرە وبەرپرسی بالاّی یەکەمی دادوەرەکانە کە فەرمان بە جێ یە وئەبێت سەرپێچی لێ نەکرێت، بەفەر مان دەرکردنیان چۆل کردنی مالّ وحالّیان

**لایەنی چوارەم:**

سەردار وڕابەری جەنگە لە پلە یەکدا خودای گەورە ڕێمنووکاریەتی.

**لایەنی پێنجەم:**

یەکەم پیاوی دارایی وئابووریە لە ڕووی خەرجی کردن وبەخشینەوە.

**لایەنی شەشەم:**

یەکەم پیاو وسەرکردەی ڕووحی یە کە فەرمانی بەسەر هەموو فەرمانەکانەوە بێت.

**لایەنی حەوتەم:**

یەکەم بڕیاردەرە بۆ هەموو ڕوویەك بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ كەس نەبووە بە ئەندازەی پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژكاری بەهاوەڵانی بكات.

**نموونەی چەند ڕاوێژكاریەكی پێغەمبەر ﷺ بەهاوەڵانی:**

**یەكەم:** ڕاوێژ كردنی پێغەمبەر ﷺبەهاوەڵانی بۆ دەرچوون بۆ قافلەی قورەیش.

**دووەم:** ڕاوێژكردنی پێغەمبەر ﷺ لە هەڵبژاردنی شوێن وجێگەی بەدردا كاتێك مقداد ڕەزای خودای لێ بی.

**سێیەم:** ڕاوێژكردنی پێغەمبەرﷺ لە دەرچوون بۆ جەنگی ئوحود.

**چوارەم:** ڕاوێژكردنی پێغەمبەرﷺ هەڵكەندنی خەندەق.... ئەگەر بتەوێ دەتوانرێ ڕسالەیەكی لەسەر بنوسرێت.

**لە ڕاوێژ كردنی پێغەمبەر ﷺبەهاوەڵانی چەند حیكمەتێكی تیادایە: لەو حیكمەتانە:**

**حیكمەتی یەكەم:** ئەوە دەسەلێنێت كە پێغەمبەریش ﷺ مرۆڤەو نابێت لەسنووری پێغەمبەرایەتی دەربكرێت بۆ ڕۆچوون لەهەق و ماف ڕەوایدا بكرێت چونكە پێغەمبەر ﷺخۆی دەفەرموێت : (لاتطرونی كما اطرت النصاری عیسی انما انا عبدالله ورسوله).صحیحه

واتە: ئێوە ڕۆچوون لە دەرهەق مندا مەكەن وەك چۆن گاورەكان ڕۆچوونیان دەرهەق پێغەمبەر عیساﷺ كرد وتەنها من بەندەو پێغەمبەریﷺخودام).

**حیكمەتی دووەم: پێغەمبەریش ﷺ مرۆڤەو دەكرێت وەك هەرمرۆڤێكیتر لە ئیجتیهادەكانی وەك كەسێكی مرۆڤێك هەڵە بكات بەڵام خودای گەورە ئاگاداری هەڵەكانی دەكاتەوەنمونەی چەند ئیجتیهادێك كە خودای گەورە بۆ پێغەمبەریﷺ ڕاست كردووەتەوە لە وانە**

**نمونەی یەكەم :**

كاتێ تاوانبارانی جەنگ ومرۆڤایەتی لە جەنگی بەدر دەستگیر كران پێغەمبەریﷺ ڕاوێژی كرد بەهاوەڵانی ئیمام عومەر فەرمووی ئەمانە سەركەدەی كوفرو تاوانبارانی

جەنگ ومرۆڤایەتین بۆیە هیچ خێرێك لە وان چاوەڕوان ناكرێت بەبۆچوونم ئەومیە بكوژرێنەوە لەدەر هەق ئەوتاوانكارانەیان.. بەلاّ م بۆچوونی ئەبووبەكر تەواو جیا بوو بەوەی ئازاد بكرێن و فیدیەیان لێوەرگیرێن هەنێك لە و ماڵ سامانەی كەلە موسوڵنە هەژارەكانیان داگیر كردووە بگێڕینەوەو لە پاشاندا كێدەڵی تەبە ناكەن ..ئێمە هیچ سوودێك لە كوشتنیان ناكەین..بێگومان بۆچوونی پێغەمبەر لەبەردڵنەرمی لێبووردەییخۆی ئەم بۆچوونەی ئیمام ئەبووبەكری پێپەسەند بوو..بەلاّم خودای گەورە سەرزەنشتی پێغەمبەری ﷺ لەسەركرد:

( {لَّوْلاَ كِتَابٌمِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ {٦٨سورة الانفال..)

**نمونەی دووەم :**

كاتێ پێغەمبەری ﷺ سەرقاڵی ناساندنی ئیسلام بوو بۆهەندێ لە سەرۆك خێڵەكان كابرایەكی كوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری ئایینی هەبوو بەلاّ م پێغەمبەر ﷺ بەهیوای ئەوەی ئەو سەرۆك خێلاّنە موسوڵمان بن سەرقاڵبوو لە وەلاّمدانەوەی كابرای كوێر ، بۆیە خودای گەورە سەرزەنشتی دەكات و(عَبَسَ وَتَوَلَّى {١ {أَن جَاءهُ الْأَعْمَى {٢ {وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى {٣ {أَوْيَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى {٤ {أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى {٥ {فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى {٦ {وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّى {٧ {وَأَمَّا مَن جَاءكَ يَسْعَى {٨ {وَهُوَ يَخْشَى {٩ {فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى {١٠ {كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ {١١ {فَمَن شَاء ذَكَرَهُ.....

**حیكمەتی سێیەم:** هەرچەندەبۆچوون زیاد ببێت لە هەركارێكد دەوڵەمەندیەو چاو روونی تێروو تەسەلی دەدات بەمرۆڤ وەك دەڵێن (ماخاب من استشار) واتە رەنجەرۆنابێت ئەو كەسەی كە راوێژكاری بۆئیش وكاری بكات.

**حیكمەتی چوارەم** :مەرج نیە مرۆڤ لەهەمو شتێكدا شارەزای تەواوی هەبێت وەك چۆن مەرج نیە مرۆڤ ئەگەر لەشتێك ناودار نەبوو بۆچوونی تەواوی بۆ شتێتر نەبێت .

**حیكمەتی پێنجەم** : دەرفەتدانە بەتواناكا ن و دەركەوتنیان .

**حیكمەتی شەشەم** : هەستی بەرپرسیارێتی دروست كردنە لەناكەكانی كۆمەڵگادا.

**حیكمەتی حەوتەم** : تەبایی خستنە ناو كەسانی تاكەكانی كۆمەڵگا.

**حیكمەتی حەوتەم:** دروستبونی فرە لایەنی بەمەرجێك لەخزمەت خەڵكاندا بێت بەپێی بەرنامەوی خودای گەورە.

((هەندێك لە خورەوشتی باوەڕداری بەختەوەر))

**بعض صفات المؤمن السعيد**

**Some property of happy faithful**

ئەو لەدولّ و شیوێکەو خەڵکی لە دۆڵ وشیوێکی ترە، بێ فیزەو بێ فیزیش دەنوێنێت وە ڕەوشتیەتی دڵی خاوێن و ساغە . سادەو ساویلکە و شوێن هەقو ڕاستی کەوتوە دڵی خێرایە بۆ یادی خودای گەورە .دو ورە لەوەی بانگەشەی شتێك بکات کە لە ئەودا نەبێت ، بەزمانی گەزاف لێنادات کە لە دڵ و حاڵی دا ڕەنگی نەدابێتەوە، چاوی لەکەس نییە بێجگە لەخودا گەورە، حەزی بەهەر شتێك هەیە لەخودا گەورە نزیکی بکاتەوە، لە خەڵکی نزیکە لەهەمان کاتدا لێیان دوورە، بەوەی کە تەکلیفیان لێناکات، بەلأم نزیکە چونکە ئیشیان بۆ ئاسان دەکات، ئەوەی پێی بکرێت، ئەوەی خەڵك لێی دەترسێ وحەزی پێ ی نییە، ئەو پێی ئاشنا دەبێ حەزی پێ دێ. ئەوەی کە خەڵك حەزی پێیەتیو پێی ئاشنایە ئەو حەزی لێ نییەو پێی نامۆیە، تەنها ڕێگەی خۆی گرتووەتە بەر بۆ بەدەستهێنانی ئاواتەکانی.. دڵخۆش نییە بەوەی کە سەروەت و سامانی هەیەو داخ و ئاخ وئۆف هەڵناکێشێ بۆ لەکیس چوونی ماڵ و سمانی، هەرکەس لەگەڵی دانیشێ دەحەوێتەوەو ئۆقرە دەگرێ، ماندووبوون و پێویستی خەڵکی لەسەر شانی خۆی هەڵدەگرێ، دان بەخۆیدا دەگرێ لە بەرامبەر هەڵەو ئازاری خەڵکی بۆی، خراپەو ئازاری خەڵکی نادات، ئەو پەڕی ئامۆژگاریان دەکات، خۆی هەڵناقورتێنی کە پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت، چاوچنۆك نییە لە ماڵ و سامانی، ڕەوشت بەرزو پڕ بەهاکانی ئەمانەن: ڕاستگۆیە، خۆ پارێزە لە هەموو گومانێك، خەڵك لە پێش خۆی دەخات، بێ فیزە، لێبوردەییەو سەرزەنشتکار نییە، مشت و مڕو دەمەقاڵەکار نییە، بە هیچ شێوەیەك ناپارێتەوە لە خەڵکی، چاکەی خۆی بەسەر هیچ کەسێکدا نادات، بەڵکو چاکەی خەڵك بەسەر خۆیدا دەدات، خۆی لەکەس بەچاکتر باشتر نازانێ، بەڵکو خەڵکی لەخۆی بە چاکتر دەزانێ، مافی خۆی نادات بەسەر کەس، بەڵکو مافی خەڵکی بەسەر خۆیەوە بە ڕەواو بە پێویست دەزانێو پێی هەڵئەستێ، بە خۆیەوە سەرقاڵە بۆ چاکسازی هەمەلایەنەی خۆی، نەنگیو کەموکو ڕتی خەڵکی لە پێش چاو نییە، بەڵکو نەنگی خۆی لەپێش چاوە، ڕێز لە برادەرو خەڵکی دەگرێ، چاوچنۆکە لە بە فیرۆدانی چرکەیەك لە کات، زمان پارێزە.(١)

(قبض الله الأرض وطويه السموات بيمينه )

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول :(( يقبض الله الأرض ويطوي السموات بيمينه ثم يقول : أنا الملك أين ملوك الأرض ؟ )).( ١ )

دەروازەیەك: ( باس لە گەورەیی ودەسەڵاتی خودای گەورە دەكات)

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول لە باوكی هورەیرەوە خودای لێ ڕازی بێت وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەفەرمووێت: :(( يقبض الله الأرض {خودای گەورە زەوی لە دەستی خۆی دەگرێت ويطوي السموات بيمينه وئاسمانەكان دەپێچێتەوە بە دەستی ڕاستی لە پاشاندا ثم يقول : أنا الملك أين ملوك الأرض ؟ ) دەفەرمووی: ((من پادشای ڕاستەقینەم كوان ولەكوێ موڵك وسامان داران ، ئەو كەسانەی خۆیان بە پاشا دەزانی لەسەر زەویدا؟}

لێكدانەوەی فەرموودەكە لەلایەن زانایانەوە

باب: قبض الله الارض وطوه السموات بيمينه

كۆ كرد نەوە ولە یەكدان لەسەر یەكخستنیەتی، ئەم فەرموودەیە لە سیفەتەكانی خودای گەورەیە كە مرۆڤی باوەڕدار ئەبێت باوەڕی پێ بهێنێ بە بێ هیچ چەن وچۆنێك. ئەم

---

( ١ )أخرجه البخاي في صحيحه برقم ( ٦٥١٩ ) و النسائي في سننه الكبرى برقم ( ٧٦٩٢ ) وأحمد في المسند برقم ( ٨٨٦٣ ) و أبو يعلى في مسنده برقم ( ٥٨٥٠ ) والآجري في الشريعة ( ص ٣٢٠ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ٤٣٠٣ ) من طرق عن ابن المبارك عن يونس عن الزهري عن سعيد بن المسيب عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٧٣٨٢ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٧٨٧ ) ( ٢٣ ) والنسائي في سننه الكبرى برقم ( ٧٦٩٢ ) و ( ١١٤٥٥ ) وابن ماجه في سننه برقم ( ١٩٢ ) من طريق عبد الله بن وهب عن يونس به .

وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٤٨١٢ ) والدارمي في سننه برقم ( ٢٧٩٩ ) والآجري في الشريعة ( ص ٣٢٠ ) من طرق عن الزهري عن أبي سلمة عن أبي هريرة رضي الله عنه به .

پێچینەوەی ئاسمان بۆ لەناو بردن وتیا چوونیەتی بە دەستی ڕاستی خودای گەورە خۆی هەر دوو دەستی ڕاستە .

{وکلتا یدیه یمین}وتای "ید" بەزۆرواتا هاتووە:

﴿قُلْ إِنَّ الْفَضْلَ بِيَدِ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ {٧٣}﴾ ال عمران٧٣.

واتە: (خاوەن موڵك هەر خودایە زۆر واتای تری هەیە بەڵام با لە باسەکەمان دەرنەچین.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. گەورەیی خودای گەورە و دەسەڵاتی خودای گەورە دەر دەخات کەهێزو دەسەڵاتی خودای گەورە بێسنوور و هیچ ئەوپەڕی نیە لە سنووردا.

٢. ئەو گەورەیی و دەسەڵاتەی خودای هەربووەو هەر هەیەو هەر دەمبێنێ.

٣. ئەو شێوازو چۆنیەتیە تەنها خودای گەورە خۆی دەزانێ چۆنە، بەڵام ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە ئەوەیە باوەڕ بە هەرشتێك بهێنین کە خودای گەورە فەرمان یان هەواڵی بەئێمە دابێت لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە ﷺ .

٤. خودای گەورە تێکڕای زەویە کان لەناو مستی خۆی رادەگرێت.ئەم شێوازە لە سیفەتی خودای گەورەیە و ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەڵام مەرجە وەك باوەڕدارێك باوەڕی پێبهێنین.

٥. خودای گەورە تێکڕای ئاسمانەکان کۆدەکاتەوە وەك چۆن لە جاراندا نامە لوول دەکراو گرێدەدرا ئەمەش دووبارە لەناوو سیفەتەکانی خودای گەورەیە خۆی و رایدەگرێت.ئەم شێوازەش لە سیفەتی خودای گەورە یە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین بەڵام مەرجە وەك باوەڕدارێك باوەڕی پێبهێنین.

٦. خودای گەورە دوو دەستی هەیە بەڵام هیچ دەستێك لە شێوەو شێوازی دەستی خوانیە لە هیچ کام لەدرووست کراوانیبۆ نمونە خودای گەروە هردوودەستی

راستەو دەستی چەپی نیە (كلتا يديه يمين)صححه الالبانى.چونكە خودای گەورەخۆی دەفەموێت : (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ {١١}) سورة الشورى....)

**خاڵەکانی جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە لە درووستکراوانی خۆی :**

**خاڵی یەکەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە هەربەهێزبوون بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی دروستکراوانی خۆی چونکە ئەوان لەبێهێزیو کەم هێزیەوە دەستایان پێکرووەو لەپاشاندا بەهێزبوون.

**خاڵی دووەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە هەربەبەهێزی دەمێننەوە بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی دروستکراوانی خۆی چونکە ئەوان لەوپوڕی بەهێزیدا دووبارەو و کەم هێزو بێهێز دەبنەوە دەستایان پێکرووەلەبێهێزیەوە و لەپاشاندا بەهێزبوونلە دەرئەنجامدا و دوا ئەنجام و لەکۆتاییدا هەردەبێت بگەرێنەوە بۆ کەم هێزیو بێهێزی.

**خاڵی سێیەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورەهیچ هاوشێوەو هاو وێنەوی نیە بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی دروستکراوانی خۆی چونکە ئەوان زۆر لەیەکچونەو یەك رەنگو یەك شێوازیان دووبارە بووەتەوەو دەبێتەوە.

**خاڵی چوارەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە هەرشتێکی ویستووە بووەودەبێت بە وتنەی وشەی (كن فيكون) بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی دروستکراوانی خۆی چونکە ئەوان پێویستبیتان بەکاتوسات رێکخستنو ئەوە هەموو رێگایانەی تر کە دەیگرنە بەر بۆبەجێهێنانی هەر کارێك.

**خاڵی پێنجەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە لەم پەرو ئەو پەری نیە بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی دروستکراوانی خۆی چونکە ئەوان خاڵی دەست پێك و خاڵی کۆتایان هەبووە و هەیە و دەبێت.

**خاڵی شەشەم**: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە هەتا زۆر تر داواو لێپارانەوەی لێبکەیت خۆشەویستر دەبیت لەلای ئەو خوا گەورەیەلەم پەرو ئەو پەری نیە

**بەپێچەوانە ی سیفەتەکانی درووستکراوانی خۆی چونکە ئەوان ئەگەر بۆچەندجارێك لێ بپارێتەوە و دەستی بۆ پان بکەیەتەوە لێت تووڕە دەبێت لێت دەگارێتەوە خاڵی دەست پێك و خاڵی کۆتایان هەبووە و هەیە و دەبێت.**

**خاڵی شەشەم: جیاوازی سیفەتەکانی خودای گەورە هەتا زۆر تر لە ئەو خوا گەورەیە نترسیت ئەبێت بەو ئەو بڕێت لەم پەڕو ئەو پەڕی نیە هیچ کەس و جێگەو کات و شوێنیتر نیە تۆپەناو حەشاربدات وبت شارێتوە لەخودای گەورەبەپێچەوانە ی سیفەتەکانی درووستکراوانی خۆی چونکە ئەوان ئەگەر لێیان بترسیت لەدەستیان دەکەیت پەنا بۆ کەسو جێگەو کاتو شوێنی تر دەبەیت خاڵی دەست پێك و خاڵی کۆتایان هەبووە و هەیە و دەبێت.**

---

دانایەی بەناوی ئەحسەنی عەبادەوە دەیوت (ئەی خودایە کەتۆ لەسەر زمانی هەموو کەسێکی .. ئەی خودایە تۆ لەناو دڵانی یادو خۆشەویستاندای.. ڕەنجەڕۆو بەدبەخت ئەوکەسەیە لاشەو لاری خۆی بۆ بێجگە لەتۆ ماندوو هیلاك بکات، پەژارەو خەمی خۆی بۆ لای بێجگە لەتۆ ببات.

ئەی خودایە تۆ بەچاو نابینرێیت، هیچ کەس هەق و مافی تەواوی تۆی نەداوە با ئەوپەڕی پیاتا هەڵبلێت ..

ئەی خودایە تۆ زانایت بە کێش و قورسایی کێوەکان، بە دڵۆپە دلۆپەی دەریاکان و بە دڵۆپەی بارینی باران باریوەکان، بەگەڵاو پەلی دارەکان ، زانایت بەهەر شتێك کە لە شەودا ببێت، هەرچیش ڕۆژی لێ هەڵبێت، لە هیچ ئاسمانێك لە ئاسمانەکانی تر لە تۆ ناشرێتەوە.

نە ئەم زەوی لە زەویەکەی تر خۆی لەتۆ دەشارێتەوە، نەهیچ کێوێك بە سەختاییەکەوە هیچی لە تۆ ون دەبێت، نە قوڵایی دەریاکان هیچیان لەتۆ لێ بزرو ون دەبێت.

بۆیە سەرم سوڕدەمێنێت لە کەسێك تۆ بناسێت دڵی بەبێجگە لەتۆ بکرێتەوە، سەرم لەو کەسەش سوڕدەمێنێت خۆشەویستی تۆی چەشتبێ و چۆن ئارامی بەخۆی دەدات دوور بێ لە تۆ.

*موسلیمی کوڕی یەسار.. ئەوەندە تامی لە نوێژ دەکرد کە دەچووە ناو نوێژەوە بێئاگا دەبوو لە دونیاو چیشی لە ناودایە، بۆیە جارێك لە گۆشەیەکی مزگەوت نوێژی دەکرد گۆشەکەی تری ڕوخا خەڵك زۆرترسان بەڵام ئەو هەر لە نوێژدابوو، هیچ ئاگای لەم ڕووداوە نەبوو.

کاتێك بڕۆیشتایە ماڵەوە منداڵەکانی هەموو بێ دەنگ دەبوون، بەڵام کاتێ لە نوێژدابوایە هەموو دەستیان بە یاری کردن و قسەکردن دەکرد، چونکە دەیانزانی ئەو بە دڵیەوە سەرقاڵی نوێژەکەیەتی، لە پاڕانەوەکانی دەیوت ئەی پەروەردگارم کەی من بگەم لیقات و تۆ لەمن ڕازی بیت!!

ئەگەر خەڵکی لەتۆ سەرقاڵ بن ئەی خودایە
ئەوا من سەرقاڵیم هەر بەتۆوەیە
ئەو پەری سەرقاڵیم هەر بۆ تۆیە
ئەی ئەو خودایەی کە دوا سەرقاڵی من تۆیە

## ( شهادة جوارح الإنسان عليه يوم القيامة )

**وعن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : كنا عند رسول الله ﷺ فضحك فقال :(( هل تدرون مما أضحك ؟ )) قال : قلنا : الله و رسوله أعلم قال :(( من مخاطبة العبد ربه يقول : يارب ألم تجرني من الظلم ؟)) قال :(( يقول : بلى )) قال : (( فيقول : فإني لا أجيز على نفسي إلا شاهداً مني )) قال :(( فيقول : كفى بنفسك اليوم عليك شهيداً وبالكرام الكاتبين شهوداً )) .قال : (( فيختم على فيه فيقال لأركانه (١) : انطقي )) قال : (( فتنطق بأعماله )) قال : ((ثم يخلي بينه وبين الكلام )) قال : (( فيقول بعداً لكن وسحقاً فعنكن كنت أناضل )) . (١)**

**دەروازەی:(گەواهی دان و شاهێدی دانی ئەندامەكانی مرۆڤ لەسەر خۆی لە رۆژی قیامەتدا.**

**وعن أنس بن مالك رضي الله عنه قال : كنا عند رسول الله ﷺ فضحك** لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە خودای لێ ڕازی بێت وتی: {ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین پێغەمبەر ﷺ دەستی كرد بە پێكەنین، **فقال :(( هل تدرون مما أضحك ؟ ))** فەرمووی: ئایا ئێوە دەزانن من بەچی هاتمە پێكەنین؟ ئەنەس دەڵێت، **: قلنا : الله و رسوله أعلم** ئێمە وتمان: خودا وپێغەمبەری خودا دەیزانن، **قال :(( من مخاطبة العبد ربه يقول : يارب ألم تجرني من الظلم ؟))** فەرمووی: لە مشت ومڕی بەندە بۆ خودای، ئەو بەندەیەی بە خودای خۆی **يقول : يارب ألم تجرني من الظلم ؟))** دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئایا تۆ پەنات نەداووم كە هیچ ستەمێكم لێ نەكرێت؟ **قال :(( يقول : بلى )) قال : (( فيقول : فإني لا أجيز على نفسي إلا شاهداً مني ))**خودای گەورە دەفەرموێت: بەڵێ، **قال : (( فيقول : فإني لا أجيز على نفسي إلا شاهداً مني ))**بەندەكە دەڵێت: ئەی خودایە من شاهێدی وگەواهی هیچ كەسێك پەسند ناكەم بەسەرمەوە مەگەر ئەندامێكی خۆم شاهێدیم بەسەرەوە بدات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **قال :(( فيقول : كفى بنفسك اليوم عليك شهيداً وبالكرام الكاتبين شهوداً ))** خودای گەورە دەفەرمووێت: بۆخۆت ئەمڕۆ شاهێدی خۆت بەسە لە

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ٢٩٦٩ ) من طريق هاشم بن القاسم عن عبدالله الأشجعي عن سفيان الثوري عن عبيد المكتب عن فضيل عن الشعبي عن أنس بن مالك رضي الله عنه به

سەر خۆت بدمیت الكاتبین شهوداً )) وتەنها شاهیدی وگەواهی فریشتە ڕێز لێنراو ونووسەرەكان بەسەر تۆوە بەسە.

پیغەمبەر ﷺ دەفەرموویت .قال : (( فیختم علی فیه فیقال لأركانه: انطقي )) خودای گەورە دەفەرموویت: ئەوكات مۆر لەسەر زار ودەمی دادەنرێت فیقال لأركانه: انطقي )) وبە ئەندامەكانی تری دەوترێت: بە قسە وشاهێد بێنن ئەوكات ئەندامەكانی بە قسە وگفت بەسەریەوە، قال : (( فتنطق باعماله )) قال : (( ثم يخلي بينه وبين الكلام )) قال : (( فیقول بعداً لكن وسحقاً فعنكن كنت أناضل )) .پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەندامەكانی بە شاهێد وبە قسە دەكەون بەسەر كابراوە بۆ هەر هەڵەیەكی كە لە دونیادا ئەنجامی دابێت. قال : ((ثم يخلي بينه وبين الكلام )) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە دواتر مۆڵەت ودەرفەتی قسەكردنی پێ دەدرێت ئەو مۆرەی بەسەر زمان ودەمیەوەیەتی لا دەدرێت بۆ ئەوەی قسەی خۆی بكات.قال : (( فیقول بعداً لكن وسحقاً فعنكن كنت أناضل )) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: كابرا دێتە قسە بەئەندامەكانی خۆی لە شاهێدو گەواهیان لەسەری دا ودەڵێت: بەدبەخت بن ودووره پەرێز بن من لە دونیادا بۆ خۆشی ئێوە تێكۆشان وخەباتی خراپەم دەكرد}.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان::

١. پێكەنینی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ئەمەش ئەوە دەر دەخات كە مرۆڤە، مرۆڤێكی كراوە وڕوو خۆش ودڵخۆش بووە ﴿ {قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا {١١٠﴾. الكهف. واتە: بەڵكو تەنهامنوەك ئێوە مرۆڤم و ئەوەی من لەئێوە جیادەكاتەوە نیگای حودایە كەبۆمن دێت.

٢. هۆكاری پێكەنینەكەشی بە هاوەڵان ڕاگەیاندووە.

٣. نەشاردنەوەی خۆشی ومایەی سەرسوڕمان بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی ئەوانیش خۆشی وسەر سوڕمانی خۆیان دەربڕن.

٤. ئەگەر وەڵامی شتێکت نەزانی کە پرسیاریان لێ کردی بڵێت خودا دەزانێ.

٥. دەرفەتدانی خودای گەورە بۆبەندەتاوانبارەکان بۆ دەربڕینی ئەوەی دەیەوێت بیڵێت...

٦. هیچ نێوانێك نامێنێ لە نێوان خودای گەورە وبەندەدا یەکسەر وبی پەردە قسە گۆڕینەوە دەبێت لە نێوانیاندا.

٧. تەنانەت مرۆڤ دەزانێت کە خودای گەورە ستەم وزۆری حەرام کردووە.

٨. خودای گەورەش لە وەڵامدا دەفەرموێت: بەڵێ من ستەمم قەدەغە کردووە.

٩. مرۆڤ مەرج دادەنێت کە هیچ شاهیدێك لەسەری نەبێت بێجگە لە ئەندامێکی خۆی نەبێت.

١٠. خودای گەورە ئەو داوایە دەدات بە مرۆڤ کە تەنها شاهێد لە ئەندامێکی خۆی وەربگرێت.

١١. لەو ڕۆژەدا خودای گەورە شاهێدی لە ئەندامەکانی مرۆڤ وەردەگرێت.

١٢. شاهێدی فریشتە بەسەر مرۆڤەوە زیاد لە نوسینەوە وکۆپی کردنی کارە ناهەموارەکانی مرۆڤەوە

١٣. خودای گەورە دەست پاکی وخاوێنی فریشتەکان ڕادەگەیەنێت کە بێگەردوو خاوێنن.

١٤. خودا مۆری بێ دەنگی بە دەمی ئەو کەسەوە دەنێت.

١٥. ئەندامەکانی مرۆڤ دەبێتە شاهێد بەسەریەوە بۆ هەر تاوان وهەڵەیەکی گەورە بێت یان بچووك.

١٦. لەپاشاندا خودای گەورە دەرفەتی قسەکردن دەداتەوە بە مرۆڤ بۆ ئەوەی مشت ومڕی خۆی لەگەڵ ئەندامەکانی خۆیدا دەست پێ بکات بۆیە زمان هاوار ودادی ئەندامەکانی خۆی دەکات، دەڵێت بۆچی ئێوە شاهێدی بەسەر منەوە دەدەن لەکاتێك کەهەر شتێکم کرد بێت لە دونیادا هەر بۆ خۆشی ئێوە بووە.

١٧. ئەندامەکانی بە قسە دێن لەگەڵی ودەڵێن ئێمەش خودای گەورە بە قسەی هێناین، ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِيأَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ {٢١}﴾فصلت.

---

ئیبن قەیم دەڵێ : ڕەحمەتی خودای لێ بێ: سەر سوڕمان نییە لە کۆیلەو بەندەی خودا کە خۆی زەلیل دەکات و پەرستنی بۆ دەکات و خزمەتی بە هەمووشێوەیەك دەکات و چونکە پێویستی دەستی ئەوی هەیە، بەڵام جێی سەرسوڕمان ئەوەیە کە خودای گەورە خاوەن هەمووشتێکە و بە زۆربەی بەهرەکانی بەندەو کۆیلەی خۆی داپۆشیوەو خۆی لە بەندەکەی نزیك دەکاتەوە بە ڕژاندنی جۆرەها بەهرە بەسەریدا، لە کاتێکا هیچ پێویستیەکی بەو بەندەیە نییە.

*هەر ئەو دەڵێت: ڕەحمەتی خوای لێ بێ:( پاك و بێگەردی بۆ خودای گەورە بەهەشت خۆی ڕازاندووەتەوە بۆ داخوازکارانی دەسا بۆیە ئێوە هەوڵبدەن بۆ بەدەستهێنانی مارەییەکەی بەهەشت، خودای گەورەو خاوەن دەسەڵات خۆی نزیك دەکاتەوەو خۆی ناساندووە بە خۆشەویستانی بە ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی ئەوان هەوڵ و کار دەکەن بۆ ئەوەی بگەن بە خزمەت لیقای خودای گەورە.. تۆش خۆت سەرقاڵ کردووە بە مرداربووەکان و بۆگەنیوەکان.

هەر ئەو دەڵێت ڕەحمەتی خودای لێبێت: خۆشەویست ڕادەکات بۆ گۆشەگیریوبۆ ئەوەی بە تەنیایی ژیان بباتە سەر لەگەڵ خۆشەویستان ئاشنا دەبێ بە باسکردنی وەك چۆن ئەهەنگ بەرەو ناو ڕادەکات و منداڵیش بەرەو دایك.

هیچ پەرستکارێك جێی حەوانەوەی نییە مەگەر ژێرداری (طوبی)نەبێت، بۆ هیچ خۆشەویستێك ئۆقرەو هێمنی نییە، تەنها لە (ڕۆژی یوم المزید) نەبێت، هەر بۆیە پێویستە خۆ سەرقاڵ بکەیت لە ژیاندا بۆ ئەوەی فریات بکەوێ لە پاش مردن.

ئەی ئەو کەسەی کە سەرمایەی تەمەنی خۆت خەرجکردووەو بردووەتە سەر لەسەر پێچی کردنی خۆشەویستەکەت، خۆتی لێ بەدوور دەگری، هیچ دوژمنێکت نییە لە خۆت دوژمنتر بێت بۆت!.

سوێند بەخودای گەورە دوژمن زاڵ نەبوو بەسەرتا مەگەر پاش ئەوەنەبێ پشتەوانیت پشتی لێ هەڵکردوویت، بەهیچ شێوەیەك وا گومان نەبەیت گە شەیتان سەرکەوتووە زاڵ بووە بەسەرتا بەڵکو بزانە پاریزەرت پشتی بەرداویت : بۆیەپێویستە هەوڵ بدەیت بۆ ڕازی کردنی خۆشەویستەکەت.

گرنگ ئەوە نییە کە ئێمە خودامان خۆش بوێت بە ئەندازەی ئەوەی کە خودای گەورە ئێمەی خۆش بوێت.

ئەگەر کەسی خۆشەویست بڕوات بەرەو خۆشەویستەکەی، هەموو ئەندامەکانی تری لەگەڵی دەڕوات، خۆشەویستیەکە لە پێش هەموو ئەندامەکانەوەیە، بەهیوابوونیش هەنگاو هەنگاو، هەنگاو هەڵ ئەنێت.

حەزبوون نارەززوەکەی پاڵی پێوەدەنێت بۆ ڕۆیشتن ترس و بیم کۆی دەکاتەوە لەسەر ڕێگە، کاتێك نزیك شاری خۆشەویست ببیتەوە ئەویش دەردەچێت بۆ ئەوەی بە خۆشەویستی بگات.

نرخ و بەهاو سەنگی ئەوە بزانە کە لێت ون بووە، بگری بە گریانی کەسێك بزانێ ئەندازەی لە دەست چووی چییە، ئەگەر ورد بیربکەیتەوە خەیاڵ و دڵغەت هەبێ بۆ نزیکی خۆشەویست من خۆم بەش بە حاڵی خۆم مژدەی نزیك بوونت بە خودای گەورە پێ دەدەم کە تۆ بەرەو خودای گەورە بڕۆیت.

( إخراج آدم لبعث النار ومثل أمة محمد ﷺ في الأمم )

عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال :(( يقول الله تعالى : يا آدم فيقول لبيك وسعديك والخير في يديك فيقول : أخرج بعث النار قال : وما بعث النار ؟ من كل ألف تسعمائة وتسعة وتسعين فعنده يشيب الصغير﴿ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَرَى وَمَا هُم بِسُكَرَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ ﴾.قالوا : يا رسول الله وأينا ذلك الواحد ؟ قال : أبشروا فإن منكم رجلاً ومن ياجوج وماجوج ألف ) ثم قال : ( والذي نفسي بيده إني أرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة ) فكبرنا ، فقال : ( أرجو أن تكونوا ثلث أهل الجنة ) فكبرنا فقال : ( أرجو أن تكونوا نصف أهل الجنة ) فكبرنا ، فقال : ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور ابيض او كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود ) . (١)

## دەروازەی: ( هەڵبژاردنی ئادەم لە مرۆڤەكان لە بەشی ئاگری دۆزەخ)

لە باوكی سەعیدی ئەل خودریەوە خودای لێ ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: {خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەم، ئادەم لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ لە خزمەت تۆ دام بۆ هەر كارێك كە فەرمانم پێ بدەیت، وهەموو خێر وبێر وبەرەكەتێك تەنها لە نێوان هەردوو دەستی تۆ دایە ئەی خودایە.

خودای گەورە دەفەرموێت: ((ئەو مرۆڤانەی بەشی ئاگرن بیانهێنە دەرەوە)) ئادەم وتی بەشی ئاگر چەندن؟ خودای گەورە فەرمووی: لە هەزار كەس نۆسەد ونەوەدو نۆ كەسە. ئا لەو كاتەدا منداڵی شیرە خۆرە سەری سپی دەبێت لە ترساندا ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ {2}﴾، واتە: هەر ئافرەتێكی سك پڕ هەبێت بە منداڵەوە سكەكەی فڕە دەدات لە ترسی ئەو ڕۆژە خەڵكی بە تێكڕا دەبینی واسەر خۆشن، لە ڕاستیدا سەر خۆش نین بەڵكو سزای خودای گەورە سەرخۆشی كردوون زۆر توووند وتیژ ودژوارە.

---

( ١ ) أخرجه البخاري في صحيحه بالأرقام ( ٣٣٤٨، ٤٧٤١ ، ٦٥٣٠ ، ٧٤٨٣ )ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٢٢ ) ( ٣٧٩ ) و ( ٣٨٠ ) والنسائي في سننه الكبرى برقم ( ١١٣٣٩ ) وأحمد في المسند برقم ( ١١٢٨٤ ) وعبد ابن حميد في المنتخب برقم ( ٩١٧ ) والطبري في تفسيره ( ١١٢/١٧ ) من طرق عن الأعمش عن أبي صالح عن أبي صالح عن أبي سعيد رضي الله عنه به .

هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد ئەو تاکە کێ یە لە ئێمەیە؟ فەرمووی ﷺ مژدەتان لێبێ لە ئێوە تەنها یەك دەچێتە دۆزەخ ولە یەئجوج ومەئجوج هەزار کەس بەرانبەر ئەو کەسەی ئێوە دەچێتە دۆزەخەوە، لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خودایەی دەرروونی منی بە دەستە من هیواو ئاواتم بۆ لای خودای گەورە ئەوەیە کە ئێوە چوار یەکی بەهەشت بن.

هاوەڵان لە خۆشیان دەستیان بە ئەڵلاهو ئەکبەر کرد بە زۆرمان زانی دواتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیواو ئاواتم بۆ لای خودای گەورە ئەوەیە ئێوە سێ یەکی بەهەشت بن هاوەڵان داوای زیاتریان کرد فەرمووی ﷺ هیواو ئاواتم ئەوەیە ئێوە نیوەی کەسانی بەهەشت بن، هاوەڵان ئەمەشیان پێ زۆر بوو کە نیوەی بەهەشت بۆ باوەڕهێنەران بێت بە پێغەمبەر و ﷺ ئایینی ئیسلام، بۆیە پێغەمبەرە ﷺ بە هاوەڵانی ڕاگەیاند کە ڕێژەی کەسانی ئیسلام بەراوورد کردن بە کەسانی بێجگە لە ئیسلام چەندە فەرمووی: ئێوەی باوەڕدار لەناو خەڵکیدا تەنها ڕێژەتان بە ئەندازەی چەند موویەکی ڕەشە لە پێستی مانگایەکی موو سپیدا، یان وەك چەند تاڵە موویەکی سپین لە پێستی گایەکی موو ڕەشدا}.

## لێکدانەوەی زاناکان

باب اخراج ادم لبعث النار ومثل امة محمد ﷺ في الامم..

(والخير في يديك) کارەکانی خودا هەموو هەر خێرە، بەڵام هەندێك مرۆڤ خراپە هەڵ دەبژێرێت، ئەمەش بۆیە بەم شێوەیە دەردەبڕێت وەك چاودێری کردنی لایەنی ڕێز وحورمەت بۆ خودای گەورە.بەڵام خێر وچاکە هەر خودای گەورە خاوەنیەتی ودروستی کردووە بەڵام هەڵبژاردن لە دەستی مرۆڤ خۆیدایە.

{اخرج بعث النار} ئەوانەی کە شیاوی دۆزەخ بوون نەك هەر بە هەوانتە گۆترە خەڵك دەربهێنرێت وفرە بدرێتە ناو ئاگر ﴿مَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ٢٩﴾ سورة (ق)

واتە: خودای گورە دەفەرموێت: ( من ستەمکار نیم لەسەر بەندەکان).

{ من كل ألفٍ تسعمائة وتسعة وتسعين فعنده يشيب الصغير ...} مەبەست ئەوەیە خەڵکی زۆرینەی هەرە زۆریان یاخی بوون وفەرمانی خودایان بە جێ نەهێناوە وشوێن پێغەمبەر ﷺ نەکەوتوون، ئەمەش زیاتر وزۆری ژمارەی نەتەوەکانی تری بێجگە لە ئیسلام دەگرێتەوە لەدوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەوان فەرمانی خودایان پاش گوێ خستووە وباوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ نەهێناوە.

{ فعنده يشيب الصغير﴿ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَرَى وَمَا هُم بِسُكَرَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴾ ئەو کاتە هەموو کەس بە موسڵمان وکافرەوە دەترسن، لە ترسان سەری منداڵی بچووك سپی دەبێت وئافرەتی سك پڕ سکەکەی فڕە دەدات وخەڵکی هەموو سەرخۆش دەبن لە کاتێکا ئەوان سەرخۆش نین بەڵکو سزای خودای گەورەیە ئەوانی سەرخۆش کردووە. مەرج نیە ئەوەی کە دەچێتە دۆزەخ هەتا هەتایی تیایدا بمینێتەوە بە تایبەت هەر باوەڕدارێك بە پێغەمبەری ﷺ خۆمان ئەگەر بە ئەندازەی تۆوی خەردەلەیەك یان گەردیلەیەك باوەڕی تیادا بێت خودای گەورە بەڕەحم وبەزەیی خۆی دەیانبووری.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. بۆ هەر فەرمانێکی خودای گەورە ئێمەی باوەڕدار دەڵێین خودایە ئێمە لە خزمەت فەرمانی تۆدا بەو پەڕی پەلەیی یەوە تۆ لەخۆمان ڕازی دەکەین.

٢. هیچ نادادپەروەریەکی تیادا نیە کەخودای گەورە فەرمان بە ئادەم دەدات کەسانی دۆزەخی جیا بکاتەوە بە ڕێیان بکات بۆ دۆزەخ، چونکە:

یەکەم: ﴿وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ٢٩﴾ سورة (ق) واتە: خودای گورە دەفەرموێت: (من ستەمکار نیم لەسەر بەندەکان).

دووەم: خودای گەورە خۆی دەزانێ کێ چاکە وکێ خراپە.

سێیەم: هەر کەسێك جیا بکرێتەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ بەهۆی کارە چەپەڵەکانی خۆیەوەیە وبێ باوەڕیەتی وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ (٣٠)﴾سورة الشورى

٣. هەموو خێرێك لە نێوان هەردوو دەستی خودای گەورەدا وهیچ شەڕێك وخراپەیەك لەلایەن خوداوە فەرمانی پێنەدراوە، وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ﴾،سورة الزمر واتە: خودا ڕازی نیە بەوەی بەندەكانی كافر بوون وبێ باوەڕی هەڵبژێرن. بێگومان كافر بوون وبێ باوەڕی سەرچاوەی هەموو شەڕو خراپەر وبەدكاریەكە، وەك چۆن باوەڕ بەخودای گەورە بوون سەرچاوەی هەموو خێر وبێریكە.

٤. خودای گەورە خاوەن دوو دەستە، ئەم باوەڕ بوونە ڕێڕەوی (اهل السنة والجماعة)یە وەك چۆن پێغەمبەر وﷺ هاوەڵان وتابعی یەكان وئیمامە گەورەكانی ئەم ئیسلامە لەسەری بوون وەك ئیمامی ئەبو حەنیفە ومالك وئەحمەد وشافعی وبوخاری ومسلم هتد.

## بەڵام چەند مەرجێك هەیە بۆ باوەڕ بە سیفەتەكانی خودای گەورەدا:

**مەرجی یەكەم:** وەك خۆی بیڕوێنی واتە نە زیاد نەكەم بۆ ئەو سیفەتە نەكرێت.

**مەرجی دووەم:** نەچوێنرێت بەهیچ كام لە دروست كراوانی، چونكە ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ {١١}﴾سورة الشورى....)

**مەرجی سێیەم:** هەر سیفەتێك هەبێت دەلالەت لە گەورەیی ودەوڵەمەندی وكارزانی ودانایی ودەسەڵاتی و ژیان دەكات لە ئەو پەڕی تەواویدا..

٥. لەهەر هەزار كەس نۆ سەدوو نەوەدوو نۆ كەس كافرە بۆ دۆزەخ دەڕوات.

## ئەمەش خۆی لە خۆیدا چەند سودێك دەگەیەنێ:

**سودی یەكەم:** زۆری میللەت ونەوەی كافر ئەمەش وەك خودا دەفەرموێت: [١١٥ وَإِنتُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ﴾ سورة الاية واتە ئەگەربێتو تۆ شوێن قسەی زۆربەی كەسانی سەر زەوی بكەوێت ئەوا تۆ گومڕا دەبیت لە ڕێگەی خودا.

**سودی دووەم:** شوێن كەوتەی پێغەمبەران( صلى الله عليهم وسلم). هەردەم كەمترن لەسەرپێچی كارانی پێغەمبەران( صلى الله عليهم وسلم).

**سودی سێیەم**: کەمێك لە مرۆڤەکان هەنە پەرستن وشوکرانەی خودا بکەن [وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَالشَّكُورُ {١٣}﴾سبأ: واتە : ((کەمێك لەبەندەکانی من ژمێریاری پێزانینی ویژدانی چاکەکاریەکانی من دەکەن)).

**سودی چوارەم**:: ئێمەی باوەڕدار شوێن زۆری وبۆری خەڵکان نەکەوین... زۆری وبۆری خەڵکی ئەوە ناگەیەنێ کەلەسەر ڕێگەی ڕاستن بۆیە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەفەرمووێت: ﴿الجماعة ماوافق الحق وان كنت وحدك﴾، واتە کۆمەڵ وتاقمی موسڵمان ئەوەیە کە فەرمان بەری خودا بەجێ بهێنێ وڕاست بێت با خۆت بە تەنهاش بیت.

**سودی پێنجەم**: ئا لەو ڕۆژەدا منداڵی شیرە خۆرە لەترسی ئەو ڕۆژەدا سەریان سپی دەبێت وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿يَوْمًا يَجْعَلُ لْوِلْدَانَ شِيبًا {١٧}﴾المزمل ئەوڕۆژە منداڵان سەریان سپی دەبێت. ئەبێت ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکی سەخت وگران ودژوار بێت کە منداڵان سەریان سپی بێت، خودای گەورە پەنامان بدات لە ناخۆشی ئەو ڕۆژە لەبەر خاتری گەورەیی خۆی.

٦. هەر لەو ڕۆژەدا ولەبەر کارەساتی زۆر قورس وگران وئەستەنگدا ئافرەتانی سك پڕ سکەکانیان دادەنێن باکاتی وساتی بوونی منداڵەکەش نەهاتبێ.

٧. خەڵکی بەتێکڕا دەبینری سەرگەردان وسەر لێشێواون وسەر خۆشن، (مەگەر کەسانێك نەبێت کە خودای گەورە خۆی ڕەحم ومیهرەبانی وسۆزی بۆیان هەبێت بۆیە بە تێکڕا تۆ هەست دەکەیت سەر خۆشن لە ڕاستیدا سەرخۆش نین بەڵکو سزای خودای گەورە زۆر سەختە.

٨. ئەوە چ سزایەکە کە مرۆڤ سەرخۆش وسەرگەردان بکات وهۆش وبیری لەسەر خۆی نەمێنێت تەنانەت هەموو دروست کراوانی خودای گەورە ڕووت وبێ پۆشاکن بەلاُم ئەوەندە سەرقاڵین هەست بە ڕووتی ناکەن!! خودای گەورە بە گەورەیی خۆی لەو ڕۆژەدا لە ژێر سێبەری عەرشی خۆیدا بمان حەوێنێتەوە.

٩. هاوەڵان ترسیان لێ نیشت بۆیە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کێ لە ئێمە ئەو تاکە کەسەیە کە ڕزگاری دەبێت؟

بۆیە پیغەمبەر ﷺ ئەم ترسەی ئەوانی ڕەواندوو فەرمووی مژدەتان لێبێ یەك لە ئێوە دەچێتە دۆزەخ بەرامبەر هەزار نەتەوەی یەئجوج ومەئجوجە، ئەمەش زۆری کافر بوونی ئەو نەتەومیە دەگەیەنێ.

١٠. وەك ئەوەی پیغەمبەر ﷺ سۆزی لە خوداوە وەرگرتبی یان ئیلهامی بۆ هاتبێ فەرمووی: هیوادارم ئێوە لە چوار یەکی بەهەشت بن، ئەم مژدەیەی بە هاوەڵانی خۆیدا بەهەمان شێوە ئەم مژدەیە بۆ ئێمەی باوەڕداریشە.

١١. بۆیە هاوەڵان لە خۆشیان دەستیان کرد بە ووتنەوەی ئەڵڵاهو ئەکبەر کردن... هەتا دەرئەنجام نیگا خرایە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ کە هیوای هەبێت ئێمەی نەتەوەی ئیسلام سێیەك بەڵکو نیوەی ئەو کەسانە بین کە دەچنە ناو بەهەشتەوە، ئەمەش پێغەمبەر ﷺ لە خۆیەوە ئەم قسە وسۆزە نادات بەڵکو :

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى {٣ {إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {٤{﴾سورة النجم الاية (٢-٤) .

واتە خۆی بەحەز وئارەزووی خۆی هیچ نالێت بەڵکو نیگای خودای گەورە وبۆ دادەبەزێت کە ڕاستێتی ئەو ئایەتە دەگەیەنیت کە خودا دەفەرمووێت: ﴿وللاخرة خير لك من الاولى ولسوف يعطيك ربك فترضى﴾ سوره الايه واتە: (کۆتایی ودوایی تۆچاکتروباشتر دەبێ لەسەرەتات وخودای‌خۆت ئەوەندەت پێدەبەخشێ هەتا تۆ رازی دەکات) وەك فەرموودەی قودسی هاتووە{انا نرضيك في امتك ولا نسؤوك}.واتە: (ئێمە تۆ رازی دەکەین لەنەتەوەکەت هەرگیز دڵی تۆناخۆش ناکەین).

## لەم خاڵەدا چەند واتا و سودێك هەیە:

**سوودی یەکەم:** ئەم ئوممەتەی ئیسلام لەهەموو ئوممەتەکانی تر زیاتر پابەندبوونیان هەیە بۆ ئەو بەرنامە وپرۆگرامەی کە خودای گەورە ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی.

**سوودی دووەم:** موعجیزەیە لە ڕووی ئەوەوە کە ئەم ئوممەتە لەچاو ئوممەتانی تری کافردا زۆر کەمە...

**سوودی سێیەم:** فێری ئەوەمان دەكات سەر بە خۆییمان هەبێت وتایبەتمەندی خۆمان لەبیر نەچێت وەك نەتەوەی ئیسلام لەناو نەتەوەكانیتردا... وەك هەر تاكێك كە بتوانێ ڕێگەی ڕاست هەڵبژێری لەناو هەر كۆمەڵگایەكدا.

**سوودی چوارەم:** لەسەر ڕاست وهیدایەت بوون نەبەستراوە بە زۆری خەڵك یان كەمی خەڵكەوە.

وەك هەر تاكێك كە بتوانێ ڕێگەی ڕاست هەڵبژێری لەناو هەر كۆمەڵگایەكدا.

**سوودی پێنجەم:** فێری ئەوەمان دەكات كە ئێمە دوور بین بین بەشتە سەرەتایی وڕووكەشەكان نەخەڵەتێین.

**سوودی شەشەم:** فێری دان بەخۆدا گریمان دەكات.

**سوودی حەوتەم:** ڕاستیەتی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دووپات دەكاتەوە كە دەفەرموێت: {انما الاعمال بالخواتیم}، واتە: دەرئەنجامی شتەكان بەستراوە بە كۆتایی یەكەوە. مەبەست ئەوەیە ئەگەر لە دونیادا كەمینە بووین یان لاواز بووین یان كەسانی تر زاڵبن دەرئەنجام ئەوەیە تۆ دوا ڕۆژ بۆ خۆت مسۆگەر بكەیت.

- ئایا دەزانیت بێدەسەلاترین و لاوازترین بێفەڕترین كەس كێیە؟!

(اعجز الناس من عجز عن الدعاء) (فەرموودە)

واتە ( بێ دەسەڵات ترین كەس ئەو كەسەیە كە بێ دەسەڵاتە لە پاڕانەوە.)

- جیاوازی سیفەتەكانی خودای گەورە هەتا زۆر تر داواو لێپاڕانەوەی لێبكەیت خۆشەویستر دەبیت لەلای ئەو خوا گەورەیەلەم پەڕو ئەو پەڕی نیە بەپێچەوانە ی سیفەتەكانی درووستكراوانی خۆی چونكە ئەوان ئەگەر بۆچەندجارێك لێیپارێتەوە و دەستی بۆ پان بكەیتەوە لێت توورە دەبێت لێت دەگارێتەوە خاڵی دەست پێك و خاڵی كۆتایان هەبووە و هەیە و دەبێت.

************************************************

************************************************

## ( صبغ أنعم أهل الدنيا في النار وصبغ أشدهم بؤساً في الجنة )

عن أنس رضي الله عنه أن رسول ﷺ قالَ :

(( يؤتى بأشد الناس كان بلاء في الدنيا من اهل الجنة فيقول : اصبغوه صبغة في الجنة فيصبغونه فيها صبغة فيقول الله عز وجل : يا ابن آدم هل رأيت بؤساً قط او شيئاً تكرهه ؟ فيقول : لا وعزتك ما رأيت شيئاً أكرهه قط ثم يؤتى بانعم الناس كان في الدنيا من أهل النار فيقول : اصبغوه فيها صبغة فيقول : يا ابن آدم هل رأيت خيرا قط او مرة بك خير قط؟ فيقول : لا وعزتك ما رأيت خيراً ولا مرة بي خير قط .

وفي لفظ :

(( يؤتى بانعم أهل الدنيا من أهل النار يوم القيامة فيصبغ في النارصبغة ، ثم يقال : يا ابن آدم هل رأيت خيراً قط ؟ هل مر بك نعيم قط؟ فيقول : لا والله يارب ، ويؤتى باشد الناس بؤسا في الدنيا ، من أهل الجنة ، فيصبغ صبغة في الجنة ، فيقال له : يا ابن آدم هل رأيت بؤساً قط ؟ هل مر بك شدة ؟ فيقول : لا والله يارب ما مربي بؤس قط ، ولا رأيت شدة قط )) . ( ١ )

## دەروازەی: خۆش گوزەرانترین مرۆڤی سەر زەوی هەڵ دەکێشرێ بە ناو ئاگری دۆزەخدا وبە پێچەوانەوەش

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خودای لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لە ڕۆژی دواییدا کابرایەك دەهێنرێت لە هەموو کەس ناخۆشی زیاتری دیبێ بەڵام باوەڕدار بێت ودان بەخودا گر بێت بۆیە چووەتە بەهەشتەوە، فەرمان دەدرێت کە بخرێتە بەهەشتەوە دەیخەنە بەهەشتەوە وخودای گەورە دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ ناخۆشیەکت دیوە ڕۆژێك لە ڕۆژان یان هەر شتێك کە لەسەر دڵت گران بێت

( ١ )أخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ٢٨٠٧ ) واللفظ الثاني له ، وأحمد في المسند برقم ( ١٣١١٢ ) واللفظ الأول له ، والبغوي في شرح السنة برقم ( ٤٤٠٤ ) والبيهقي في البعث والنشور ( ٤٣٦ )من طريق يزيد ابن هارون عن حماد بن سلمة عن ثابت البناني بن مالك رضي الله عنه به . وأخرجه أحمد في المسند برقم ( ١٣٦٦٠ ) وابن أبي شيبة في المصنف ( ٢٤٨/١٣ ) وأبو يعلى في مسنده برقم ( ٣٥٢١ ) من طريق عفان بن مسلم عن حماد به . وأخرجه ابن ماجه في سننه برقم ( ٤٣٢١ ) من طريق محمد بن إسحاق عن حميد عن أنس رضي الله عنه به .

ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژیانی دونیادا؟ کابراش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر سوێند بەگەورەییت ئەی خودایە هەرگیز هیچ شتێکم نەدیوەلەدڵم ناخۆش بێ،

لەپاشاندا. و: { لە دواییدا کابرایەك دەهێنرێت لە هەموو کەس خۆشی زیاتری دیبێ دابەڵام دۆزەخی بێت بۆیە دەخرێتە دۆزەخەوە، فەرمان دەدرێت کە بخرێتە دۆزەخەوە دەیخەنە دۆزەخەوە وخودای گەورە دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ خۆشیەکت دیوە ڕۆژێك لە ڕۆژان یان هەر شتێك کە لەسەر دڵت پێت خۆش بووبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژیانی دونیادا؟ کابراش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر سوێند بەگەورەییت ئەی خودایە هەرگیز هیچ شتێکم نەدیوەکەدڵم خۆش بێ،..

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە دەفەرموویت: کەسێك دەهێنرێت کە خۆشگوزەرانترین مرۆڤی سەر ڕووی زەوی، بەڵام دوور لە خودا بوو، دۆزەخیە... لە هەموو کەس خۆشی زیاتری دیبێ بەڵام دۆزەخی بێت بۆیە دەخرێتە دۆزەخەوە فەرمان دەدرێت کە بخرێتە دۆزەخەوە دەیخەنە دۆزەخەوە وخودای گەورە دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ خۆشیەکت دیوە ڕۆژێك لە ڕۆژان یان هەر شتێك کە لەسەر دڵت پێت خۆش بووبێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژیانی دونیادا؟ کابراش لە وەڵامدا دەڵێت نەخێر سوێند بەگەورەییت ئەی خودایە هەرگیز هیچ شتێکم نەدیوەکەدڵم خۆش بێ.
لە دواییدا کابرایەك دەهێنرێت لە هەموو کەس ناخۆشی زیاتری دیبێ بەڵام باوەڕدار بێت ودان بەخودا گر بێت بۆیە چووەتە بەهەشتەوە، فەرمان دەدرێت کە بخرێتە بەهەشتەوە دەیخەنە بەهەشتەوە وخودای گەورە دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ ناخۆشیەکت دیوە ڕۆژێك لە ڕۆژان یان هەر شتێك کە لەسەر دڵت گران بێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژیانی دونیادا؟ کابراش لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر سوێند بەگەورەییت ئەی خودایە هەرگیز هیچ شتێکم نەدیوەلەدڵم ناخۆش بێ،

## لێکدانەوەی زاناکان بۆ فەرموودەکە

---

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. كە دەفەرموویێت دەهێنرێت مەبەست ئەوەیە لەلای خودای گەورە ئەم عیلم وزانستە موحەقەقە ودەزانێت هەتا هەتایی هەرچی ڕوو دەدات ئەمەیە بیر وباوەڕی موسڵمان.

٢. ئەو كەسەی كە باوەڕدار بێت ودان بە خۆدا بگرێت لەسەر ناخۆشی یەكانی وبەڵاكانی دونیا خودای گەورە لەبەرامبەریدا پاداشتی بەهەشتی دەداتەوە كەهەمو ئەو خەم وخەفەت وناخۆشی وبەڵایەی دونیای لەبیر دەباتەوە.

٣. ئەو كەسەی كە باوەڕدار نەبێت با هەر چەندە لەخۆشی وئایلاف یوودا بژی هیچ دەردەسەری وخەم وخەفەتی نەدیبێ خودای گەورە دەیخاتە ئاگری دۆزەخ، ئەوەندە سەختە هەموو خۆشی یەكانی دونیای لەبیر دەباتەوە.

٤. خۆشی یەكانی دونیا هەر چەندە بێت هەر كەمەو بەراورد پێ كردنی نیە لەبەرامبەر خۆشی یەكانی بەهەشتدا.

٥. ناخۆشی یەكانی دونیا هەر چەندە دژوار بێت هەر بەرامبەر سزا وئەشكەنجە وئازاری دۆزەخ سووك وئاسانە بەراووردی لەگەڵ ناكرێت لە دژواری وسەختی ئاگری دۆزەخ.

٦. گفت وگۆی نێوان خودای گەورە وبەندە دیار دەكات.

٧. سوێند خواردنی بەندە بەگەورەی ودەسەڵاتی خودای گەورە، ئێمەش ئەوەی لێوەردەگرین كە تەنها سوێند بەخودای گەورە بخورێت.

٨. ئەم جیاوازی خۆشی یەی بەهەشت بەراوورد بەخۆشی یەكانی تەنها چوونە ناو بەهەشت دەردەكەوێت.

٩. جیاوازیەكانی ناخۆشی ئەشكەنجە وئازاری دۆزەخ تەنها بە چوونە ناوەوەی دیار دەبێت ودەردەكەوێت.

١٠. غەسل دەماغ شوێنەوارو سڕنەوەی مێشك هەیە لە خۆشی یەكانی بەهەشت بۆ ناخۆشی یەكانی دونیا، بەهەمان شێوە غەسل دەماغ هەیە لە ناخۆشی یەكانی دۆزەخ بۆ ئەو خۆش گوزەرانیەی دونیا.

١١. لەبیر چوونەوە لە سروشتی مرۆڤە.

١٢. ئێمە تەنهادواترین شتمان بەبیر دەمێنێ ئەنجامەكانی شتەكانیش پەیوەستە بە دەرئەنجامەكانیەوە وكۆتاییەكەیەوە.

١٣. تەنها خودای گەورە فەرمان بە فریشتە دەكات كە ئەم كەسە ببنە بەهەشتەوە یان بیبەنە دۆزەخەوە.

١٤. هیچ شتێك بە بێ زانین وفەرمانی خودای گەورە نابێت ورووندادات.

---

• ودای گەورە دەفەرموێت ( ان ینصركم الله فلا غالب لكم وان یخذلكم فمن ذا لذي ینصركم من بعده وعلى الله فلیتوكل المؤمنون)سورة ال عمران ایة (٥١)

واتە(ئەگەر خودای گەورە سەرتان بخات هیچ كەس زاڵ نابێت بەسەرتانا ئەگەر سەر شۆڕتان بكات كێیە سەرتان خات لە پاش خودای گەورە ، تەنها پشت بەستنی بە خودای گەورە دەبێت كەسانێك كە باوڕدارن.

• ﴿ [٥] إیاك نعبد ﴾ خوایە تەنها هەر ئەتۆ دەپەرستین، تەنیا بەرنامەو پرۆگرامەكەی تۆمان لاپەسەندە، هەر گوێ رایەڵ و ملكەچی تۆ دەبین، یەكتاپەرستیی (توحید الألوهیە)ـی راستەقینە - كە گەلێ كەس تێیدا دەكەوێتە هەڵەو، هەڵە دەبێ- بەم شێوەیە جێبەجێ دەبێ و لەلای خوا قبووڵە ﴿ وإیاك نستعین ﴾ وە تەنها هەر لەتۆ داوای یارمەتیی و كۆمەك دەكەین، تەنها ئەتۆی كەبتوانی لەرۆژە سەختەكاندا یارمەتیمان بدەیت و سەرمان خەیت بەسەر دوژمنی خۆت و ئێمەدا، (توحید الربوبیە)ی راستەقینەش ئەمەیەو، نەبێ هەموو شتێكمان بیگێڕینەوە بۆلای خوا ﴿ [٦] إهدنا الصراط المستقیم ﴾ خوایە رێنماییمان بكە بۆ رێگەو رێبازە ڕاستەكەی خۆت كەئایینی پیرۆزی ئیسلامەو شارەزامان بكە، وەهەر لەسەر ئەورێیەش بەهەمیشەیی سەقامگیرو دامەزراومان بكە ﴿ [٧] صراط الذین انعمت علیهم ﴾ رێی ئەو كەسانەی كەنازو نیعمەت و بەخششی خۆتت بەسەرد رشتوون -لەپەیامبەران و، ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاكان- ﴿ غیر المغضوب علیهم ولاالضالین ﴾ نەك رێی ئەوانەی كە خەشم و قینی تۆیان بەسەردا رژا وەك گەلی یەهوود، وە نەك رێی ئەوانەیش كە گومڕاو سەرلێشێواو بوون، وەك گەلی گاوران سەبارەت بە فەزڵ و گەورەیی ئەم سوورەتە گەلێ فەرمووده هەیە،((بگەڕێوە بۆ تەفسیری رامان ))

## ( إعطاء أهل الجنة ما تشتهيه نفوسهم )

عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ كان يوماً يحدث – وعنده رجل من أهل البادية :-
(( أن رجلاً من أهل الجنة استأذن ربه في الزرع فقال : أولست فيما شئت ؟ قال : بلى ولكني أحب أن أزرع وبذر فتبادر الطرف نباته واستواؤه واستحصاؤه (١) وتكويره (٢) أمثال الجبال فيقول الله تعالى : دونك يا ابن آدم فإنه لا يشبعك شيءٌ )).
فقال الأعرابي : يا رسول الله لا تجد هذا إلا قرشياً أو أنصارياً فإنهم أصحاب زرعٍ فأما نحن فلسنا بأصحاب زرعٍ ، فضحك رسول الله ﷺ .(١)

## دەروازە: بەهەشتی یەکان حەزیان بەهەرچی بێ پێیان دەدرێت

عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ كان يوماً يحدث – وعنده رجل من أهل البادية :-لە باوکی هورەیرەوە خودای لێ ڕازی بێت، أن النبي ﷺ كان يوماً يحدث پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکا فەرمودەی بۆ باس دەکردین– وعنده رجل من أهل البادية وکابرایەکی دەشتەکی لە خزمەتی دانیشت بوو، (( أن رجلاً من أهل الجنة استأذن ربه في الزرع فقال : أولست فيما شئت ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، {کابرایەك لە بەهەشتی یەکان داوای مۆڵەت ودەرفەتی ئەوەی کرد کە خوای گەورە مۆڵەت ودەرفەتی چاندن وجوتیاری کشتوکاڵ کردنی بداتێ فقال : أولست فيما شئت خودای گەورە پێی فەرموو، بۆ ئایا تۆ هەرچیت حەز لێبێ پێت نەدراوە؟ قال : بلى ولكني أحب أن أزرع وبذر فتبادر الطرف نباته واستواؤه واستحصاؤه ) وتكويره أمثال الجبال کابرای بەهەشتی وتی، بەڵێ ئەی خودایە من هەرچیم بوێت پێم دراوە، ولكني أحب أن أزرع بەڵام من خۆم سروشتم حەزی بەومیە جوتیاری کشتوکاڵ چاندن بکەم وبذر فتبادر الطرف نباته واستواؤه واستحصاؤه وتكويره بۆیە خودای گەورە دەرفەتی پێدەدات بۆ ئەوەی بە خۆی چاندن بکات فتبادر الطرف بۆیە

---

١)أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٢٣٤٨ ، ٧٥١٩ ) وأحمد في المسند برقم ( ١٠٦٤٢ ) من طريق عبد الملك بن عمر و عن فليح عن هلال بن علي عن عطاء يسار عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٢٣٤٧ ) من طريق محمد بن سنان عن فليح به .

کابرای بەهەشتی یەکسەر دەست بە چاندن دەکات نباته واستواؤه واستحصاؤه وتكويره ویەکسەر دانەوێڵە وچێنراوەکان گەورە دەبن واستواؤه ولەسەر بنجەکانی خۆیان ڕادەوەستن، واستحصاؤه ئەویش یەکسەر دەست بە دووروێنەی دەکات وتكويره ولەسەر یەکیان دادنێت، **أمثال الجبال فيقول الله تعالى : دونك يا ابن آدم فإنه لا يشبعك شيءٌ** )) .

وەك نموونەی کێوەکان زۆر وگەورە دەبن لە کۆکراوەی دانەوێلەکانی.

**فيقول الله تعالى : دونك يا ابن آدم فإنه لا يشبعك شيءٌ** بۆیە خودای گەورە پێ دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم بەسە بۆ تۆ کە هیچ شتێك تێرت ناکات. **فقال الأعرابي : يا رسول الله لا تجد هذا إلا قرشياً أو انصارياً فإنهم أصحاب زرعٍ فاما نحن فلسنا بأصحاب زرعٍ ، فضحك رسول الله ﷺ** . ئا لەو کاتەدا پیاوێکی دەشتەکی لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، وتی ئەم کابرا بەهەشتی یە بریتی یە لە کەسێك لە قورەیشی یەکان یان ئەنساری یەکان **فإنهم أصحاب زرعٍ فاما نحن فلسنا بأصحاب زرعٍ** چونکە هەر ئەوان خاوەن پیشەی جوتیارین **فاما نحن فلسنا بأصحاب زرعٍ** بەلام ئێمەی دەشتەکی خاوەن جوتیاری نین بەلکو خاوەن مەڕو مالات وحوشتر بەخێو کردنن، **فضحك رسول الله ﷺ** . بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەم قسەیە پێکەنی وبێدەنگ بوو}.

## لێکدانەوەی زاناکان بۆ فەرموودەکە

## اعطاء اهل الجنة ما تشتهيه نفوسهم

{**اولست فيما شئت؟**} ئەوەی تۆی لەسەر لەو نیعمەتانە تۆ ڕازی ناکات؟

{**فتبادر الطرف**} واتە ڕواو سەریان وەدەر کەوت پێش ئەوەی چاو بکرێت وبەربدات واتە بەخێرایی زیاد لە سنوور وپێوەری مرۆڤ.

{**دونك**} واتە بۆ خۆتی ببە.

{**فانة لا شبعك شيء**} هیچ شتێك تێرت ناکات ئەگەر بلێیت پێچەوانەی ﴿ان لك الا تجوع فيها ولا تعرى﴾ یە وەلامت دەدەمەوە لە فەرموودە قودسیەکەدا کە دەفەموێت: هیچ شتێك تۆ تێر ناکات، وئایەتەکە دەفەرموێت: تۆ لە بەهەشتدا برسی نابیت وبێ پۆشاك نابیت، هیچ دژایەتیەکی تیادا نیە چونکە تۆ تێر نابی مەبەست ئەوە نیە کە مرۆڤ

برسی بێت، بەڵکو زۆر جار مرۆڤ زۆر تێر ودەوڵەمەندە وبەڵام هەر چاو برسیە ومرۆڤ هەرگیز لە خۆشیەکانی بەهەشت تێر نابێت.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. بەهەشت هەموو خۆ شی یەکی تیادایە کە بەهەشتی یەکان حەزیان بۆی بچێت.

٢. گفت وگۆ وئاخاوتنی یەکسەری نێوان خودای گەورە وبەهەشتیەکان بۆ داخوازیەکانیان ئەگەر هەیان بێت.

٣. پێغەمبەر ﷺ هەر شتێك کە خۆشی یەك بخاتە دڵی هاوەڵان وموسڵمانانەوە باسی دەکات.

٤. هەر شتێك کە پێغەمبەر ﷺ باسی لێوە بکات بێ حیکمەت نیە.

ئەو شتانەش هەموو نیگایە خودای گەورە بۆی دەنێرێت ﴿وَمَا يَنطِقُ عنِ الْهَوَى {٣} إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى {٤}﴾سورة النجم واتە خۆی بەحەز وئارەزووی خۆی هیچ ناڵێت بەڵکو نیگای خودای گەورە وبۆ دادەبەزێت

٥. بەجێ هێنانی سۆز وپەیمانی خودای گەورە خۆی بۆ بەهەشتی یەکان؛

﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَاخَالِدُونَ {٧١} وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْتَعْمَلُونَ {٧٢} لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ {٧٣}﴾.سورة الزخرف

٦. بەهەشتی لەهیچ خۆشی یەکیان کەم نیە ئەگەر هیواو ئاواتێکیان هەبێت تەنها وەك ئاواتێکە وبۆ بەسەر بردنی کاتەکانیان.

٧. پیت وبەرەکەتی زەوی بەهەشت چۆن بەرووبوومی کابرای وەك کێوەکان گەورە وزۆر بوون.

٨. سروشتی مرۆڤ ئەوەیە بەهیچ تێر نابێت مەگەر خودای گەورە خۆی قەناعەت بۆ مرۆڤ دروست بکات، ئەمەش هەمان سیفەتی مرۆڤە لە دونیاشداکاتێك لە فەرمودەدا هاتووە، {ولن يملا فاه الا التراب} متفق عليه.

٩. گفتوگۆ كردن لەگەڵ هەر كەسە وبەپێی هۆشی خۆی ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگ بوو لەوەی كابرای دەشتەكی كاتێك وتی ئەو جوتیارە بەهەشی یە قوریشیە یان خەڵكی مەدینەیە واتە ئەنساریەكان.

١٠. بێدەنگ بوون كاتێك شتێك بكرێت بە حەزی تۆ نەبێت لەسەری نەڕۆیت كۆتایی پێ بهێنی.

١١. بەڵام ئەگەر سنووری خودای گەورەی تیادا شكا ئەو كات تۆ بەم شێوازە هەڵسوكەوت دەكەیت:

ا)ئەگەر توانیت بە دەست دەیگۆڕی بە مەرجێك زەرەری زیاتر نەبێت.

ب) یان بە وتەو ئامۆژگاری هەوڵی گۆڕینی دەدەیت بەلام ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾المؤمنون الایة٩٦،

ت) ئەگەر هەر نەبێ لێی بێ دەنگ دەبی

پ)بەڵام لە دڵەوە زۆرت پێ ناخۆش بێت.

١٢. موجامەلە وهەڵسوكەوت كردن لەگەڵ كەسێك كە دڵی ڕەق بێت یان شێوازی هەڵسوكەوتی ڕەق بێت.

١٣. تێكەڵ بوون لەگەڵ بەرامبەردا بەوەی ئەو دەری دەبڕێ وگۆڕینەوەی هەڵویست لەگەڵی دەربڕینی ئەوەی كە تۆ بە بۆچوونەكەی بە گرنگ وپڕ بەها سەیر دەكەیت.

١٤. بۆ ئەم كارەش شێوازی زۆرە لەوانە بتوانێت خەندە وپێكەنین بەرووبەود بكەیت.

- ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ﴿ التغابن : ١ ﴾واتــە : پاك و بێگەردی خودای گەورە دەنوێنێ هەرشتێك كە لەئاسمانەكان و زەویدا هەیە دەسەڵات و سامان و هەموو سوپاسێك هەرشیاوی ئەوخودایەیە ، ئەو خودایە بە توانایە بەسەر هەموو شتێك
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لو انكم تتوكلون على الله حق توكله، لرزقكم كما يرزق الطير تغد وخماصا وتر بطانا)[1]واتە (ئەگەر ئێوە پشت بەستنتان لەسەر خودای گەورە ڕاست بێت ڕۆزیتان دەدات وەك چۆن ڕۆ باڵندە دەدات، كە لە بەیانیدا بە سكی خاڵی دەردەچێ لە ئێوارەدا بە سكی پڕی دێتەوە.

## باب(خروج بعض اهل النار لمحاسبتهم على اعمالهم)

**عن أنس بن مالك رضى الله عنه أن رسول الله (ﷺ) قال :**

**يخرج من النار أربعة يعرضون على الله عزوجل فيامر بهم إلى النار فيلتفت أحدهم فيقول : ئي رب قد كنت أرجو إن أخرجتني منها أن لا تعيدني فيها ، فيقول : فلاّ نعيدك فيها )(١)**

دەروازەی : ( هەندێك لە دۆزەخیەكان دەهێنرێنە دەرەوە بۆ سەر زەنشتی وژماردنی چاكەكانیان).

- لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ڕەزای خودای لێبێت دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {چوار كەس دەهێنرێنە دەرێ لە دۆزەخ بۆ لێپرسینەوەی چاكەكانیان ئەم لێپرسینەوەیە بە دادگایی كردنی خودایی یە، لەبەر ئەوەی كە كردەوەی خراپیان زاڵتر وگەورەتر وزۆرترە لە ئاست كردەوە چاكەكانیان بۆیە دووبارە خودای گەورە فەرمانیان پێ دەدات بۆ ئەوەی ببرێنەوە بۆ دۆزەخ، جا لەو كاتەدا یەكێكیان ئاووڕ دەداتەوە ودەڵێت: ئەی خودایە من گومانم بە شێوەیەك بوو وهیوام وابوو كە ئەگەر لە دۆزەخ من بهێنیتە دەرەوە جارێكیتر نامگێڕیتەوە بۆ ناو دۆزەخ، بۆیە خودای گەورە بە زەیی بەكابرادا دێت ودەفەرموێت: ئەوا ناتگێڕمەوە بۆ ناو دۆزەخ}

## لێكۆڵینەوەی زاناكان بۆ فەرموودەكە

---

**(١)أخرجه أحمد في المسند برقم (١٣٣١٣) من طريق حسن عن حماد عن ثابت البناني وأبي عمران الجوني عن أنس بن مالك رضي الله عنه به . وإسناده صحيح .**

**والحديث أخرجه مسلم في صحيحه برقم (١٩٢) وأحمد في المسند برقم (١٤٠٤١) وعبد بن حميد في المنتخب برقم (١٣١٢) والطحاوي في شرح مشكل الآثار برقم (٥٦٦٧) والبغوي في شرح السنة برقم (٤٣٦٢) من طريق حماد بن سلمة به .**

**لكن بلفظ : (( يخرج أربعة من النار فيعرضون على الله ، ثم يؤمر بهم إلى النار ، قال : فيلتفت أحدهم فيقول : أي رب ، قد كنت أرجو إذ أخرجتني منها أن لا تعيدني فيها ، فينجيه الله منها )).**

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. ئەو چوار کەسە بۆ ئەوە دەهێنرێنە دەرەوە لە ناو ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوەی بەراوو ردی چاکەکانیان بکرێت شیاوی بەهەشت بن یان لەوانەیە ئەوماوەیەی کە لە ناو ئاگری دۆزەخدا ماونەتەوە وئازار وسزادرا بن بۆ ئەوەی بزانرێت خاوێن بوونەتەوە وبخرێنەناو ئەهەشتەوە.

٢. ئەم نیشاندانەی کردەوەکانیان بۆ لای خودای گەورە بۆ ئەوە نیە کە خودای گەورە نەزانێت ئەم کەسانە کە گوایە خاوێن بوونەتەوە وشیاوی بەهەشت دەبن چونکە ئەم جۆرە بیر وباوەڕە لە مرۆڤی باوەڕدار ناوەشێتەوە ودەبێتە هۆی پووچەڵ کردنەوەی بیر و باوەرشی باوەڕدار پەنا بەخوا، چونکە خودای گەورە هەر لەوکاتەوەی لە پێنووسی دروست کردوە فەرمانی پێداوە کەچی دەبێت وروودەدات لە دونیا ولە دوا ڕۆژدا وگەورە بێت یان بچووک، نهێنی بێتیان ئاشکرا... هەتا دواتر بەڵکو ئەم پێشاندانەی ئەو چوار کەسە :

بۆ یەکێك لەم حیکمەتانەیە:

**حیکمەتی یەکەم:** چونکە هیچ شتێك بەبێ فەرمانی خودای گەورە نابیچت وحێ بەجێ ناکرێت وەك خودای گەورە دەفەموێت: ﴿لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ﴾ الروم الایه(٣) واتە: هەموو فەرمانەکان لە ئەوەڵو لە کۆتادا هەربۆخودایە

یا ن ﴿بَل لِّلَّهِ الْأَمْرُ جَمِيعًا﴾الرعدالایه(٣٠)واتە: هەموو شتێك تەنها بە دەستی خودی گەورەیە.

**حیکمەتی دووەم:** بۆ دادوەری خودای گەورە دەسەلێنێ کە لە ئەو پەڕی دەسەڵاتدایە بەڵام هیچ زیاد لە تاوان سزا نادرێت بەڵکو خودا زۆر لێخۆشبووە تەنانەت بۆ زۆر تاوانیش لێبووردەیی ولێخۆش بوون وسۆزی هەیە.

**حیکمەتی سێیەم:** بۆ دانپیانانانی بەندەکەیە بە تاوان وگوناهکاریەکانی خۆیدا.

**حیکمەتی چوارەم:** خستنەوە پێش چاوی ئەم چوار کەسە وخەڵکانی تریش کە میهرەبانی خودایان بۆ دەردخات.

٣. ئێمەش فێری ئەوە دەکات کە دادپەروەر بین لە گەڵ ئەو کەسانەی کە لە ژێر دەستماندایە.

٤. پێدانی دەرفەت بۆ ئەوەی کەسی هەڵە کار وهەڵە کردوو پاساوی خۆی بهێنێتەوە.

٥. گوێ گرتن بۆ پاساوەکان وقسەکانی، ئینجا وەڵام دانەوەی ولایەنی کەم وکورتی دەرخستنی تیایدا.

٦. ئەو کەسەی کە دەچێتە دۆزەخ لە پاش خاوێن بوونەوەی بە سزاکان وتۆڵە لێسەندنەوەی خودای گەورە ڕزگاری دەکات ودەچێتەوە ناو بەهەشت.

٧. بەڵام بەهەشتی یەکان بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان دەرناکرێن لە بەهەشتدا، بەڵکو بەردەوام پلەیان لەبەرز بوونەوەندایە.

٨. دوای ئەوەی کە خودای گەورە فەرمانی پێدەدات کە بیگەڕێننەوە بۆ دۆزەخ لەم کاتەشدا ولەدوای فەرمان دانیش بۆ گەڕانەوەی بۆ دۆزەخ بۆ جارێکیتر خودای گەورە لێبووردەی خۆی دەکات ونابرێتەوە بۆ دۆزەخ بەڵکو بۆ بەهەشت دەبرێت.

## ئەم خاڵەش چەند سوودێکمان پێ دەگەیەنێ:

**سوودی یەکەم:** ئەوەیە کاتێك بڕیارێك دەدەین لە پاشاندا چاکتر هەبێت ئەو بڕیارە بگۆڕین بۆ چاکترەکە.

**سوودی دووەم:** هیچ نەنگی تیادا نیە ئەگەر مرۆڤ لەبڕیاری خۆی پاش گەر ببێتەوە بەتایبەت ئەگەر سوود وقازانجی بەرچاوی بۆ خەڵکی تیادا بێت.

**سوودی سێیەم:** مرۆڤ بوێر بێت چۆن بەردەوامە لەسەر بڕیاری چاك بەهەمان شێوە زوو پەلە بکات لە گۆڕینی بڕیار ئەگەر چاکتر هەبوو لە بەرژەوەندی دروست کراواندا.

٩. کابرا دان بەهەڵەکانی خۆیدا دەنێت وهیچ نکولی پێناکرێت تەنها یەك هیوای دەمێنێ ئەویش هیوای میهرەبانی خودایە.

١٠. بۆیە دەڵێت ئەی خودایە من هیوام بە میهرەبانی وبەزەیی تۆ ئەوەیە كە من ئەگەر لە دۆزەخ هێنرامە دەرێ جارێكیتر نام گەڕێنیتەوە ناو ئاگری دۆزەخ، ئەم هیوا بوونەش ڕاستیەتی ئەم فەرمووده قودسییەیە دەگەیەنی كە خودا دەفەرموێت: {انا عند ظن عبدي فليظن بي ماشاء} متفق عليه

**١١. یەكسەر خودای گەورە سۆزی بۆ ئەم كابرایە دەچێت وسۆزو بەڵێنی ئەوەی پێ دەدات كە نەیگەڕێنێتەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.**

**١٢. ئەم خاڵەش چەند خاڵێكی لێ وەردەگیرێ و لێ وەردەگرین:**

**خاڵیَ یەكەم:** هەتا بتوانین لە جێی گومانی باشی خەڵكیدا بین واتە ئەگەر خەڵكی هیواو مەبەستێكیان پێمان هەبوو بە پێ ی توانا بۆیان بەجێ بهێنین.

**خاڵی دووەم:** هەردەم هیوای چاك بە خودا ببرێت لە پاشاندا بە دەسەلاتدارانیش بەهەمان شێوە.

**خاڵی سێیەم:** بوێر بیت بۆ دەربڕینی ئەو هیواو ئاواتەی كە بە كەسێكی دەسەلاّتداری دەبەیت.

**خاڵی چوارەم:** هەردەم كەسی خودا پێداو یان كەسی دەسەلاّتدار زیاد لەمافی هەر كەسێك بدات كە خۆی شیاوەیەتی لەبەردەستەكانی.

---

١. ئەگەر پشت بەستن بە جگە لە خودابێ هەموو سەر شۆڕیەك روو لە مرۆڤ دەكات لە هەموولایە كەوە . ﴿ باوكی فیراس حەمەدانی ﴾

٢. ئەگەر رازی بوونی خودا نەخەیتە پێش هەموو شتێكی ترەوە لە حەزەكانت ئەوا تۆبەدان بە خۆگر نادانرێت ﴿ باوكی عەتاهی یە ﴾

٣. تەنــها بۆ لای خـــودا بگەڕێوە نە بۆ ئەم لاو ئەولا چونكە بەندەی خودایت و خودای گەورە پادشـــاتە ﴿ باوكی عەتاهی یە ﴾.

## ( إحلال الرضوان على أهل الجنة فلايسخط عليهم أبداً )

**عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال النبي ﷺ .(( إن الله يقول لأهل الجنة : يا أهل الجنة : فيقول ون : لبيك ربنا وسعديك والخير في يديك فيقول : هل رضيتم ؟ فيقولون : وما لنا لا نرضى يا رب وقد أعطيتنا : ما لم تعط أحداً من خلقك : فيقول : ألا أعطيكم افضل من ذلك ؟ فيقولون : يارب وأي شيء أفضل من ذلك ؟ فيقول : أحل عليكم رضواني فلا أسخط عليكم بعده أبداً )).(١)**

**دەروازە: (ڕەزامەندی هەمیشەیی وهەتا هەتایی خودایی بۆ بەهەشتییەکان که بەهیچ شێوەیەك له شێوەکان توڕەیی خودایی نابینن به چوونه بەهەشتەوە)**

عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال : قال النبي ﷺ **له باوکی سەعیدی کوری خودری یەوە، ڕەزای خوای لێبێت، وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** .(( إن الله يقول لأهل الجنة {**خودای گەورە بە کەسانی بەهەشتی یەکان** يا أهل الجنة : فيقولون : لبيك ربنا وسعديك والخير في يديك **دەفەرموێت: ئەی ئەو کەسانەی ناو بەهەشت،** : فيقولون : لبيك ربنا وسعديك والخير في يديك **ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئەی خودایە ئێمە له خزمەت فەرمانی تۆ داین بەختەوەری بۆ ئێمە هەر لەلای تۆوەیە، هەموو خێر وبێرێك تەنها له نێوان هەردوو دەستی تۆ دایە ئەی خودای...** فيقول : هل رضيتم؟ **خودای گەورە دەفەموێت: ئایا ئێوە ڕازیبوون بە خۆشی یەکانی بەهەشت؟** فيقولون : وما لنا لا نرضى يا رب وقد أعطيتنا : ما لم تعط أحداً من خلقك : **بەهەشتیەکان دەڵێن: ئەی ئێمە بۆمان نیە ڕازی نەبین له کاتێکدا کە تۆ ئەی خودای گەورە ئەوەندەت پێداوین و بەسەردا باراندووین** ما لم تعط أحداً من خلقك **بەسەر هیچ کەسیکیتردا له**

---

(١)أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٦٥٤٩)ومسلم في صحيحه برقم ( ٧٧٤٩ ) والترمذي في سننه برقم ( ٢٥٥٥ ) والنسائي في سننه الكبري برقم ( ٧٧٤٩ ) أحمد في المسند برقم ( ١١٨٣٥ ) وأبو نعيم في الحلية ( ٣٤٢/٦ ) و ( ١٨٤/٨ ) من عطاء بن يسار عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه به .وخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٧٨١٨ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٨٢٩ ) وابن حبان في صحيحه برقم (٧٤٤٠ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ٤٣٩٤ ) من طريق ابن وهب عن مالك به .

درووست كراوانت پێنەداوون نەتباراندووە بەسەریاندا، فیقول : ألا أعطیكم أفضل من ذلك ؟ فیقولون : یارب وأي شيء أفضل من ذلك ؟ فیقول : أحل علیكم رضواني فلا أسخط علیكم بعده أبداً )) .

خودای گەورە دەفەرمووێت: ئایا هێشتا چاكتریشتان پێنەدەم لەو هەموو خۆشیەی كە ئێوەی تیادایە؟ فیقولون : یارب وأي شيء أفضل من ذلك ؟ بەهەشتیەكان دەڵێن، ئەی خوایە چ شتێك هەیە لەو خۆشیانەی كە ئێمەی تیادایە لە بەهەشتدا چاكتر بێت وگەورە تر بێت؟ فیقول : أحل علیكم رضواني فلا أسخط علیكم بعده أبداً )) .

خودای گەورە دەفەرمووێت: میهرەبانی ورازی بوونی خۆمتان پێ ڕەوا ببینم فلا أسخط علیكم بعده أبداً هەرگیز لە دوای ئەوە لێتان تووڕە نابم}

## لێكدانەوەی زانایان بۆ فەرموودەكە

## دەروازەی: احلال الرظوان علی اهل الجنة فلا یسخط علیهم ابدا

قوله "احل" لە حەلالەوە هاتووە واتە بۆم دابەزاندن، یان "احل" بەواتای بۆ ئێوەم پێویست كردووە لەسەر خۆم كە لێتان ڕازی بم وهەرگیز بەهیچ شێوەیەك لە ئێوە تووڕە نەبم، ئەمەش حیكمەتەكەی ئەوەیە ئەوان لە دونیادا هەموو هەوڵێكیان ئەوە بووە خودایان لێ ڕازی بێت وخودایان لێ تووڕە نەبێت بۆیە بەهەمان شێوە پاداشت دەدرێنەوە

{الجزاء من جنس العمل} واتە: بەپێی كاری خۆیان پاداشت دەدرێتەوە.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. یەكسەر وڕاستەوخۆ گفتوگۆی نێوان خودای گەورە وبەهەشتی یەكان دەر داخات بە بێ هیچ پەردە ونێوانێك.

٢. بەزمانێك خودای گەورە قسەیان لەگەڵ دەكات هەموو بەتێكڕا لەخودای گەورە تێدەگەن بە بێ ئەوەی هیچ پێویست بە وەرگێران هەبێت.

٣. بەهەشتیەكان بە یەكدەنگ دەڵێن ئەی خودایە ئێمە لە خزمەت تۆ داین بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانەكانت كە تۆ فەرمانمان پێ بدەیت.

**٤. بەهەشتیەكان هەست دەكەن خۆشیەكانی خۆیان بێ سنووره لەهەموو كەسانێكی تر چاكتر وباشترن.**

**٥. هەر لەبەر ئەو خاڵەیە بۆیە دەڵێن ئێمە چۆن ڕازی نابین بەو چاكانەی تۆ ئەی خودایە بەسەرمانەوە.**

**٦. هەر چەندە لەخۆشیدا بی خۆشتر وچاكتر هەیە لە لای خودای گەورە.**

**٧. مرۆڤ ئەوەی خۆی لەسەریەتی وخودای گەورە پێی داوە ڕێزی بگرێت بە بەهاو بەهرەیەكی زۆر گەورە لە پێش چاو بگرێت وپێزان بێت بەو چاكانەی خودا بەسەریەوە.**

**٨. فەزڵ وگەورەیی ومیهرەبانی بەخشینی خودای گەورە هەردەم زیاتر وگەورەترە زۆر لەوەی كە مرۆڤ هەژماری بۆ بكات ولێكی بداتەوە وچاوەڕوانی بێت.**

**٩. گەورەترین بەهرەی خودای گەورە ئەوەی كە خودای گەورە لە مرۆڤ ڕازی بێت ولە دواتریش هەرگیز وهەرگیز خودا توڕەیی وغەزەبی نابێت بۆ ئەو كەسەی سۆزی میهرەبانی بەسەردا باراندووە.**

**١٠. ئەگەر خودای گەورە ڕازی بوونی خۆی بەرەوای كەسێك ببینێت ئەوا هەموو خێر وخۆشیەك ڕوو لەو مرۆڤە دەكات كە هیچ چاوێك نەیبینی بێت وهیچ گوێیەك بۆی باس نەكرا بێت بە دالْغەی دڵی هیچ كەسێكدا نەهاتووە.**

**١١. لەهەموو ئەم شتانە خۆشتر شاد بوون وسەرفراز بوونە بە ڕوانین خودای گەورە خۆی كە هەموو بەهرە ونیعمەتەكانی تریش لەبیر مرۆڤ دەباتەوە وسەرقاڵی خۆشی ولەزەت وچێژ وەرگرتن دەبن لە ڕوانینیان بۆ خودای گەورە.**

ناردنی پێغەمبەر هەموو میهرەبانی وشادی خۆشی یەو لابرنی كۆت وزنجیرە كەلەسەر گەلانی تر هەیە وەك دەفەرموێت((ویضع اصرهم والاغلال التي كانت على أعناقهم)).بۆیە پیشەوا ئیبن ئەل قەیم دەڵێ: ((پێغەمبەر ﷺ شوێن كەوتوانی بەوەی كەخودا ڕێزی هەردوو جیهانیان لێ دەگرێت.*بەلاَم ئەو كەسانەی كەیاخی دەبن وپشت هەڵ دەكەن خودا هەندێ لەسزاكانی خۆی بەنە وان دەنو ێنێ بۆ ئەوەی گەورەی ودژواری سزای دۆاڕۆژیان بۆ دەركەوێ.*بەلاَم ئەو كەسانەی باوەڕدارن سوود مەند دەبن لەوەی كە هیچ كەسێك بۆی نی یە سنووریان ببەزێنێ وتەنگو چەڵەمەو ئازاریان بۆدروست بكرێت.بەگشتی جیهانەكان سوود مەندبوون بەهاتنی .*تەنانەت دوو ڕووەكانیش سوود مەنددەبن بەوەی كەخۆیان بەباوەڕدار لەپێنووس دەدەن، كەخوێنیان دەپارێزرێ ماڵ وسامانیان بۆ دەمێنێ، هەرچ مافێك كەبۆ باوەڕدار هەبێ ئەوانیش دەگرێتەوە.* تەنانەت ئەو گرۆ وكەسانەی كەئایینی ئیسلام وناردی پێغەمبەریان ﷺ، پێ نەگەیشتووە یان باوەڕیان پێ نەهێناوە سوود مەندن لەوەی كەخوای گەورە بەهاتنی پێغەمبەر سزای لە سەر هەڵ گرتوون. كەواتە سودی محمدبەتێكڕا مرۆڤایەتی گرتوودتەوە.

## ( بيان أنه سبحانه وتعالى لم يكلف عباده إلا ما يطيقونه)

عن ابن عباس رضي الله عنه قال :(( لما نزلت هذه الآية : [ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ ] قال : دخل قلوبهم منها شيء لم يدخل قلوبهم من شيء ، فقال النبي ﷺ : (( قولوا سمعنا وأطعنا وسلمنا )) قال : فألقى الله الآيمان في قلوبهم فأنزل الله تعالى : [ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أخطأنا] قال : قد فعلت [ رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ] قال : قد فعلت [ وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا ] - سورة البقرة : الآية ٢٨٦ قال : قد فعلت )) .(١)

## دەروازەی: ((ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە خودای گەورە هیچ فەرمانێك نادات بەسەر هیچ کەسێکدا تەنها لە کار وفەرمانێك نەبێت کە لە توانا ودەسەڵاتی ئەودا نەبێت))

عن ابن عباس رضي الله عنه قال :(( لما نزلت هذه الآية : [ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ ] **لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە، ڕەزای خودای لێبێت دەڵێت: {کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وان تبدوا مافي انفسكم او تخفوه يحاسبكم به الله﴾البقرة ئەوەی کە لە دڵی خۆتانی بخەن چ ئاشکرای بکەن یان بیشارنەوە خودای گەورە لێپرسینەوەتان لەسەر دەکات.** قال : دخل قلوبهم منها شيء لم يدخل قلوبهم من شيء ، **عەبدوڵڵا وتی لە دڵی باوەڕدارانیدا شتێك دروست بوو دەربارەی ئەم ئایەتەوە نە ئەچوو بە دڵیاندا،** فقال النبي ﷺ : (( قولوا سمعنا وأطعنا وسلمنا )) **بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: "بڵێن ئێمە گوێمان لە فەرمانی خودا بوو، گوێڕایەڵ دەکەین وخۆمان دەدەینە دەستی هەر فەرمانێکی خودای گەورە کە فەرمانی پێبدات"** قال : فألقى الله الآيمان في قلوبهم فأنزل الله تعالى : [ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ١٢٦ ) ( ٢٠٠ ) والترمذي في سننه برقم ( ٢٩٩٢- والنسائي في الكبرى برقم ( ١١٠٥٩ ) وأحمد في المسند برقم ( ٢٠٧٠ ) والحاكم في المستدرك ( ٢٨٦/٢ ) والطبري في تفسيره ( ١٦٠/٣ ) والبيهقي في الأسماء والصفات ( ص ٢١٠ - ٢١١- من طريق آدم بن سليمان عن سعيد بن جبير عن ابن عباس رضي الله عنهما به

مَا كَسَبَتْ وَعَلَيهَا مَا أَكْتَسَبَتْ رَبَنَا لَا تُوَاخِذنَآ إن نَّسِينَآ أَ, أخطأ،نا] عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێت: خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً إلاَّ وُسعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذنَآ إن نَّسِينَآ أَ, أخطأ،نا﴾البقرة واتە: خودای گەورە هیچ فەرمانی بەجێهێنانی هیچ کارێك نادات بەسەر هیچ دەروونێکدا مەگەر بە پێی توانای خۆی نەبێت، هەر کەسێك هەر خێرێك بکات پاداشتی دەداتەوە، هەر خراپەیەك دەکات تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە ئەی خودامان نەنگیمان لێ نەگریت لەبیرچووەکانمان وهەڵەکانمان، خودای گەورە لە وەڵامی ئەو پاڕانەوە وداوایەی باوەڕداراندا فەرمووی: (قد فعلت) داواو پاڕانەوەی ئێوەم بە جێ هێنا، قال : قد فعلت [ رَبَّنَا وَلَا تَحمِلْ عَلَينَآ إصراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبلِنَا ] ﴿ربنا ولا تحمل علينا اصرا كما حملته على الذين من قبلنا﴾ واتە: ئەی خودایە بۆ ئێمە بارگران نەکەیت بە تاوان وگوناهەکان وەك چۆن تۆ کەسانی لە پێش ئێمەت بارگران کردووە، خودای گەورە لە وەڵامی پاڕانەوە وداوای باوەڕداراندا فەرمووی بۆم بەجێهێناون، قال : قد فعلت [ وَاغْفِر لَنَا وَارحَمنَا أنتَ مَولَنَا ] قال : قد فعلت )) .

﴿وَاغْفِر لَنَآ وَارحَمنَا أنتَ مَولَنَا﴾ باوەڕداران دەپاڕێنەوە ودەڵێن: تۆ ئەی خودایە لێمان خۆش بە وبەزەیی وسۆزی خۆت بە ئێمەدا هەبێت، چونکە هەر تۆ ئەی خوایە گەورەی ئێمە وسەرپەرشتیاری ( خودای گەورە لە وەڵامیاندا فەرموی بۆم بەجێهێناون) }.

## لێکدانەوەی زاناکان بۆ فەرموودەکە

## باب: بيان انه سبحانه وتعالى لم يكلف عباده مالا يطيقون

﴿لا نفرق بين احد من رسله﴾ واتە ئێمە جیاوازی ناخەینە نێوان پێغەمبەران ﷺ لە باوەڕ پێ هێنانیان کە باوەر بە هەندێك بهێنن باوەڕ بەهەندێکی تریان نەهێنن نەك مەبەست ئەوە بێت جیاوازیان نەکەن لە گەورەییان بۆ نموونە "اولو العزم" لە هەموو پێغەمبەرەکانی تر گەورە ترن ومحەمەد ﷺ لە هەموویان گەورەترە.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. کاتێك بووە خودای گەورە لێپرسینەوەی خەیاڵ ودالغەی ناو دڵی مرۆڤی کردووە.

٢. سۆزو میهرەبانی خودای گەورە دەردەخات کاتێك مرۆڤ شتێك نەتوانێت خودای گەورە بۆی ئاسان دەکات.

٣. هاوەڵان زۆر نیگەران بوون بەخاڵی یەکەم کە خودای گەورە لێپرسینەوەی ناو دڵیشیان لێبکات، چونکە لەوە ترسان هیچیان لە سزا وتۆڵە ڕزگاریان نابێت.

٤. لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ئەوانی هێمن کردەوە ودڵنیای کردنەوە بەوەی کە خودای گەورە میهرەبانی زیاتر لە تۆڵە وسزاکەی هەر بۆیە پێیانی فەرموو ئێوە بڵێن ئەی خودایە: (ئێمە گوێ بیست وفەرمان بەجێی فەرمانەکانی تۆ بووین هەر کارێك کە تۆ فەرمانی پێبدەیت ئێمە خۆمان داوەتە دەستی بۆ).

٥. بۆیە لە پاداشتی ئەم خۆدان بەدەستی خودای گەورەوە ئیمان وباوەڕی خستە دڵیانەوە ولە دڵیاندا چەسپا وهەر بۆیە خودای گەورە سەرجەم ئایەتەکانی تری دابەزاند وەك لە لێکدانەوە وواتاکەی باسمان لێوە کرد.

### ٦. لەدەر ئەنجامی خاڵی پێنجەمی ڕابووردوو ئەم خاڵانەی تر ڕوویدا:

أ- میهرەبانی خودا زاڵترەو لە پێش ترە لە توڕەیی خودا.

ب- هەر کەسە بە پێی توانایی ولێهاتوویی خۆی فەرمان پێ دەدرێت لە یاسای خودان لەهەموو کات وسەردەمێکدا.

### ت- چەند حاڵەتێك مرۆڤ تاوانی لەسەر نانوسرێت:

**حاڵەتی یەکەم:** کاتێك مرۆڤ هەڵەیەك بکات.

**حاڵەتی دووەم:** خودای گەورە ئەو کۆت وزنجیرەی کە بەسەر نەتەوەکانی ترەوە هەبوون لەسەر ئەم نەتەوەیە لابرد ولەسەری هەڵگرتن.

**حاڵەتی سێیەم:** کاتێك لەبیر چوونەوەی هەبێت بۆ جێ بەجێکردنی فەرزێك.

**حاڵەتی چوارەم::** هەتا مرۆڤ بەڕاستی داوای لێخۆشبوون بکات خودای گەورە لێی خۆش دەبێت.

**حاڵەتی پێنجەم:** هەتا مرۆڤ بەڕاستی داوای میهرەبانی خودای گەورە بکات ئەوا خودای گەورە سۆزی ئەوەی پێداوە کە میهرەبان بێت پێی لە ژیانی دونیادا ولە ژیانی دوا ڕۆژیشیدا..

**تێبینی:**\\ ئەمانە هەمووی بەڵێنی خودای گەورە هیچ لادانێکی تیادا نیە، چونکە خوای گەورە پێویستی بە ئێمە نیە لە هیچ شتێك وبۆ هیچ شتێك ئالەو کاتەدا کە ئێمە پێویستمان بە خودایە لەهەموو شتێکدا وبۆ هەموو شتێکدا، خودای گەورە ئەم بەڵێنانەی پێ داین لەسەر سۆز ومیهرەبانی خۆیەوە.

٧. هەردەم مرۆڤ زمان پاراوە بە نزا وپاڕانەوە وسکاڵا ونوزاندنەوە بۆ لای خودای گەورە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەم شێوەیە بێت گرنگی پەسند بوونی پاڕانەوەکەیە.

- ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ سورة النحلواتە : (هەرکەسێ کاری باش ئە نجام بدات لە پیاوان و ئافرەتان باوەڕی بە پاداشت هەبێت ، ئەوا ئێمە بە ژیانێکی خۆشی و سەرفرازی دەی ژییە نین) . پاداشتی زۆر چاکیان دەدەینەوە لەو کارەی خۆیان زیاتر و باشتر کە ئەنجامیان داوە لە دونیادا )
- ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ {٨١إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ {٨٢﴾

. ﴿ يس : ٨١-٨٢ ﴾واتە : ئایا ئەوکەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بەدەسەڵات تر نی یە کە نموونەی وەك ئەوان دروست بکات : بەڵێ خودای گەورە زۆر و ئێجگار دروست کارە و ئەوپەڕی زانایی هەیە بەسەردروست کراوەکاندا هەمووشتێکی تریش. فەرمانی خودا تەنها ئەوەندەیە کە دمیەوێت شتێك ببێ پێی دەفەرمووێت ببە و دەبێ. کەواتە پاك و بێگەردی بۆ ئەوخودایەی کە هەموو شتەکانی بە دەستەوەیە و هەموویش دەگەڕێنەوە بۆلای خودای گەورە.

## ( قبول التوبة من الذنوب وإن تكررت الذنوب )

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : سمعت النبي ﷺ قال :(( إن عبداً أصاب ذنباً - وربما قال : أذنب ذنباً – فقال : ربِّ أذنبت ذنباً – وربما قال : أصبت فاغفر ، فقال ربه : أعلم عبدي أن له ربًّا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ غفرت لعبدي .ثم مكث ماشاء الله ، ثم أصاب ذنباً أو أنياً – فقال : رب أذنبت – أو أصبت – آخر فاغفره فقال : أعلم عبدي أن له ربًّا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ غفرت لعبدي . ثم مكث ماشاء الله ثم أذنب ذنباً – وربما قال: أصاب ذنباً – فقال : رب أصبت –أو أذنبت – آخر فاغفره لي ، فقال : أعلم عبدي أن له ربًّا يغفر الذنب ويأخذبه ؟ غفرت لعبدي ثلاثاً فليعمل ما شاء)) . (١)

## دەروازەی:(پەسند بوونی تەوبە لەتاوانەکان با خوا نەخواستە دووبارە تاوان بکاتەوە وگەڕانەوەی بەدوادا بهێنێت)

عن أبي هريرة رضي الله عنه قال : سمعت النبي ﷺ قال **لە باوکی هورەیرەوە ڕەزای خودای لێبێت وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** (( إن عبداً أصاب ذنباً - وربما قال : أذنب ذنباً – فقال : ربِّ أذنبت ذنباً – وربما قال : أصبت فاغفر {**بەندەیەك تووشی تاوانێك دەبێت** - وربما قال : أذنب ذنباً **لەوانەیە فەرموو بێتی گوناهێك بکات**. فقال : ربِّ أذنبت ذنباً **لە پاشاندا بڵێت ئەی خودایە تاوانێکم کرد** وربما قال : أصبت فاغفر ، **لەوانەیە بڵێت توشی تاوانێك بووم، بەڵام ئەی خودایە لێە خۆش بە،** ، فقال ربُّه : أعلم عبدي أن له ربًّا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ غفرت لعبدي **.خودای گەورە پێی دەڵێت، ئایا بەندەکەم دەزانێت** أن له ربًّا يغفر الذنب **کەخودایەکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت** ويأخذ به ؟ **سزاو تۆڵەی لەسەرومر دەگرێتەوە؟** غفرت لعبدي **لێی خۆش بووم،** ثم مكث ماشاء الله ، ثم أصاب ذنباً أو اذنب ذنباً – فقال : رب أذنبت – أو أصبت – آخر فاغفره فقال : أعلم عبدي أن له ربًّا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ غفرت لعبدي . **لەپاشاندا ئەم کابرایە هەندێك دەمێنێتەوە ئەوەندەی خودا حەز بکات**. ثم أصاب ذنباً أو اذنب ذنباً – **لەپاشاندا توشی هەڵەیەك دەبێتەوە یان تاوانێك دەکات،**

---

(١)أخرجه البخارى في صحيحه برقم ( ٧٥٠٧ )ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٧٥٨ ) وأحمد في المسند بالأرقام ( ٧٩٤٨ ، ٩٢٥٦ ، ١٠٣٨٠ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦٢٢ ) الحاكم في المستدرك ( ٢٤٢/٤) والبيهقي في سننه (١٨٨/١٠ ) من طرق عن همام بن يحي عن إسحاق اب عبدالله بن أبي طلحة عن عبدالرحمان بن أبي عمرة عن أبي هريرة رضي الله عنه به .

فقال : رب أذنبت – أو أصبت – آخر فاغفره دەڵێت ئەی خودایە تاوانێكم كرد یان تووش بووم بە تاوانێك فاغفره لي. بەڵام ئەی خودایە لێم خۆش بە، فقال ربُه : أعلم عبدي أن له ربًا يغفر الذنب ويأخذ به ؟. خودای گەورە پێی دەڵێت، ئایا بەندەكەم دەزانێت أن له ربًا يغفر الذنب كەخودایەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت ويأخذ به ؟ سزاو تۆڵەی لەسەرومر دەگرێتەوە؟ غفرت لعبدي لێی خۆش بووم، ثم مكث ماشاء الله ، ثم أصاب ذنباً أو اذنب ذنباً – فقال : رب أذنبت – أو أصبت – آخر فاغفره فقال : أعلم عبدي أن له ربًا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ غفرت لعبدي . لەپاشاندا ئەم كابرایە هەندێك دەمێنێتەوە ئەوەندەی خودا حەز بكات، ، ثم أصاب ذنباً أو اذنب ذنباً – لەپاشاندا توشی هەڵەیەك دەبێتەوە یان تاوانێك دەكات، فقال : رب أذنبت – أو أصبت – آخر فاغفره دەڵێت ئەی خودایە تاوانێكم كرد یان تووش بووم بە تاوانێك فاغفره لي. بەڵام ئەی خودایە لێم خۆش بە، فقال ربُه : أعلم عبدي أن له ربًا يغفر الذنب ويأخذ به ؟ خودای گەورە پێی دەڵێت، ئایا بەندەكەم دەزانێت أن له ربًا يغفر الذنب كەخودایەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت ويأخذ به ؟ سزاو تۆڵەی لەسەر دەگرێتەوە؟ غفرت لعبدي لێی خۆش بووم. غفرت لعبدي لێی خۆش بووم. ثلاثاً سێجار ئەم تاوانەی بەندە سێبارە دەبێتەوە و خودای گەورەش هەر بەبەردەوام لێی خۆش دەبێت هەتا بۆ دوا جار خودای گەورە دەفەرمووێت مادەم لە دوای هەر تاوانێک بگەڕێتەوە بۆ لای من هەر لێی خۆش دەبم فليعمل ما شاء هەرچی دەكات بابكات)) .

## لێكدانەوەی فەرموودەكە ئەم تاوانەی بەندە سێبارە دەبێتەوە
## باب قبول التوبة من الذنوب وان تكررت الذنوب والتوبة

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا ژمارەی (٢٧٥٨/٦٩١٩-٢٩)لە هەمان دەروەازەدا دەڵێت ئەم فەرموودانە رووكەشەكەی ئاشكرا ودیارە كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر مرۆڤ سەد جاریش وهەزار جار وزیاتریش گوناه وتاوان بكات ویەكسەر بۆ هەر گوناه وتاوانێك تەوبە بكات تەوبە وگەڕانەوەی لێ وەردەگیرێ، گوناهەكانی دەسڕێتەوە، ئەگەر هاتوو دوای ئەو هەموو تاوانە یەك جار تەوبە بكات وبگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە

خودای گەورە تەوبەکەی لێوەردەگرێت، ئەمەش تێگەیشتنە لە دەقی فەرموودەکە {اعم ما شئتم فقدغفرت لك} واتا مادەم تۆ دەزانیت لە دوای تاوان ئەبێت مرۆڤ تەوبە بکات لێ خۆش بووم.صحیح مسلم بشرح النووی بەرگی ٩

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. بەندەیەك لە بەندەکانی خودای گەورە تاوانێ دەکات، بەڵام دەڵێت خودایە لێ خۆش بە خوداش لێی خۆش دەبێ.

٢. هەر چەندە تاوان بکرێت ئەگەر تەوبەی بەدوادا بێت خودا هەر لێخۆشبووە.

٣. تەنانەت با ئەو هەڵەیە دووبارە وسێ بارەش ببێتەوە، ئەگەر گەڕانەوە وداوای لێخۆش بوونی لێبکرێت خودای گەورە لێ خۆش دەبێ.

٤. ماوەیەك تێپەڕ دەبێت کە دور لە هەڵە دەبێت بەڵام تەنها لە نێوان خودای گەورە وبەندەدا دووبارە دەکەوێتەوە هەڵە.

٥. پیرۆزی وگەورەیی دانان بە هەڵە وتاواندا.

٦. مرۆڤ لایەنی نەنگی خۆی بزانێت وهەوڵی چاککردنەوەو پڕ کردنەوەی بکات.

٧. هەوڵدان بۆ چاککردنی هەڵە ونەنگی یەکان پیرۆزیە پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە.

٨. واز نەهێنان لە تەوبە وگەڕانەوە لەهەموو کاتێکدا بە تایبەت لە کاتی هەڵە کردندا...

٩. کاتێك کەسێك هەڵەی لێ دووبارە دەبێتەوە بێ هیوا نەبێت مەبە لە ئەوەی کە ڕۆژێك دەگەڕێتەوە.

١٠. بەهیچ کەسێك نەڵێت خودا لێت خۆش نابێ با تاوانی دووبارە وسێ باره بوونەوەش هەبێت.

١١. دان نان بە گەورەیی وخودایەتی خودای گەورە هۆی سڕینەوە ولێخۆش بوونی زۆر گەورەی تیادایە.

١٢. بەلأم هەر كەسێك دان بە گەورەی وخودایەتی خودادا نەنێت ونەگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە خودا لێی خۆش نابێ با هەڵە وتاوانیشی كەم بێت.

١٣. بەس خودای گەورە خاوەن دەسەلأت وخاوەن میهرەبانیە بۆ لێخۆشبوون وسڕینەوەی تاوانەكانی. هەر چەند گوناه گەورە بێت لێخۆش بوونی خوای گەورە گەورە ترە...

١٤. هەرچەندە گوناه گەورە بێت هێشتا لێخۆشبوونی خودایی هەر گەورەترە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لو ان الله عذب اهل السموات واهل ارضه لعذبهم وهو غير ظالم لهم، ولو رحمهم لكانت رحمته لهم خيرا من اعماله، ولو انفقت مثل احد ذهبا في سبيل الله، ما قبله الله منك حتى تؤمن بالقدر، فاعلم ان ما اصابك لم يكن ليخطئك، وما اخطاك لم يكن ليصيبك ولو من على غير هذا لدخلت النار) ([1])بە كورتی (ئەگەر خودای گەورە كەسانی لەناو ئاسمان و زەویدا سزا بدات هیچ ستەمێكی لێ نەكردوون، ئەگەر سۆزو میهرەبانیشی هەبێت بۆیان باشترە لە كارەكانیان ئەگەر بە گەورەیی كێوی (ئوحود) (زێڕ) بەخێر بكەیت لەپێناو خودادا، خودای گەورە لێت وەرناگرێت هەتا باوەڕ بە (قەدەر) نەهێنیت، وات لێبێت بزانیت هەرچی خودای گەورە بۆی نووسیت ئەبێت هەر ببێت، هەرچیش خودای گەورە نەینووسیبێت تووشت نابێت، ئەگەر ئەم باوەڕەت نەبێت بمریت ئەوا دەچیتە ئاگری دۆزەخەوە.)

# ( فضل ألأذان والصلاة )

عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول(( يعجب ربكم من راعي غنم في رأس شظية بجبل ، يؤذن بالصلاة و يصلي ، فيقول الله عز وجل : انظروا الى عبدي هذا يؤذن و يقيم الصلاة يخاف مني ، فقد غفرت لعبدي و أدخلته الجنة )) .( ١)

## دەروازەی : (پیرۆزیو گەورەی بانگدان و نوێژکردن)

عن عقبة بن عامر رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول **لە عوقبەی کوڕی نافیعەوە رەزای خودای لێبێ دەڵێت: ( گوێم لێبووە پێغەمبەری خودا ﷺ دەیفەرموو** (( يعجب ربكم من راعي غنم في رأس شظية بجبل **((خودای گەورە عەجەب دەیگرێت کاتێك بەندەیەکی خۆی شوانی مەڕوماڵاتی خۆی بێت لەکاتی بانگداندا لە سەرچیایەکبێت** يؤذن بالصلاة و يصلي **بانگ بداتو نێژەکەی بکات ،** فيقول الله عز وجل : انظروا الى عبدي هذا يؤذن و يقيم الصلاة يخاف مني **بۆیە خودای گەورە دوفەرمو یت بەفریشتەکانی بڕوانن بۆ ئەم بەندەمە بانگ دوەدات نێژ دەکات لە ترسی من** فقد غفرت لعبدي و أدخلته الجنة )) . **ئەوا ئێو شاهێد بن کەمن لە م بەندەمەخۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە).**

## گرنگترین رێنمایییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

**١. (عجب) ی خودای گەورە وەك سەر سوڕمانی بەندەکانی نیە چونکە بەندەکان کاتێك شتێك بەلایانەوە چاوەڕوان نەکرابێت روو بدات لەپاشاندا بەهەر هۆکارێك رووبدات دەبێتە مایەی سەر سوڕمانیئەوان و سەریان سوڕدەمێنێ بەڵام (عجب)ی خودای گەورە بۆ دەربڕینی**

---

١) أخرجه أبو داود في سننه برقم (١٢٠٣) و النسائي في سننه ( ١٠٨/١) من طريق ابن وهب عن عمرو بن الحارث عن عشانة المعافري عن عقبة بن عامر رضي الله عنه به .و إسناده صحيح .و الحديث صححه العلامة الألباني رحمه الله في صحيح سنن أبي داود برقم (١٠٦٢)

راز یبوونی خۆیەتی بەرانبەر ئەوکارەی بەندە کە دەیەوێت خودای گەورەی پێرازی بکات لەخۆی زوك جۆن ئەم فەرموودەیە دەقەو بەڵگیە لەسەر ئەم بۆچوونە کەدەفەرموێت:(انظروا الى عبدي هذا يؤذن و يقيم الصلاة يخاف مني،فقد غفرت لعبدي وأدخلته الجنة).بۆیەخودای گەورە دوفەرموێت بەفریشتەکانی بڕوانن بۆ ئەم بەندەمە بانگ دوەدات نێژدەکات لە ترسی من.

٢. ئەگەر مرۆڤ بزانێت تێکەڵبوونی لەگەڵخەڵکی زیان بەئایینی دەگەیەنێت ئەوکات بۆی هەیە گۆشەگیر بێت لە تیکەڵبوونیان .

٣. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بتونێت کاریگەری لەسەر خەڵکی هەبێت بۆ فەرمان بەچاکە کردن قەدەغە لە خراپەکردن ئەوە خێرە لەناو خەڵکیدا بمێنێتەوەو دان بەخۆیدا بگرێت ئارام گربێت لەبەرانبەر خراپەی خەڵکی بۆیوەك پێغەمبەر دەفەرموبێت (ﷺ)المؤمن الذي يخالط الناس ويصبر على اذاهم خير من المؤمن الذي لا يخالط الناس ولايصبر على أذاهم)صحيحة

٤.سوننەتە مرۆڤ ئەگەر تەنهاش بوو لەهەرکوێدا بانگدانی خۆی بکات و قامەت بکات نوێژە کەی بکات بابەتەنهاش بێت.جاله جیا وشاخ وداخ دۆڵونشێو بێت.

٥.سوننەتە شاهێدی گرتن و گەواهی گرتن بکرێت بۆ توندو تۆڵکردنی پەیوەندی و گرێبەستی ئەو شتەی کەتەوی٢ ئەنجامی بدەێت.

٦.جاری وادەبێت بەکارێکی زۆر کەم کەئێمە لەوانە هیچ جۆرە حسابێکی بۆ نەکەین بەڵام ئەو کارە خودای گەورە زۆر پاداشتی گەورەو چاوەڕوان نەکراوی بۆئێمە دادەنێت بۆ نموونە بانگدان و نوێژێکردن پاداشتی لێخۆشبوون و چوونەوبەهەشت وەردەگرین.

٧. گەورەترین شت کەمرۆڤ پاداشتی لەسەر وەرگرێت ئەو کارەیە کەتایبەتی بێت بۆخودای گەورە ونهێن بێت لەنێوان خودای گورەو بەندەدا .چونکە کابرا تەنها لەترسی خودانەبێت چاوەڕوانی پاداشتی کەسنیە.

٨. خۆشحاڵی رازیبوونی خودایی بۆ ئەو بەندەیەی کە خودای گەورەی خۆی لەخۆی رازی دەکات بشێوەیەك لەشێوەکان.بۆ نموونە (وان تشكروا يرضه لكم.)

٩. ناخۆشحاڵی ونارازیبوونی خودتایی بۆ ئەو بەندەیەی کە خودای گەورە لەخۆی نارازی دەکات بشێوەیەك لەشێوەکان.بۆنموونە( ولا يرضى لعباده الكفر).

---

(ولقد نعلم انك يضيق صدرك بما يقولون (٩٧) فسبح بحمد ربك وكن من الساجدين، واعبد ربك حتى ياتيك اليقين) سورة الحجر اية (٩٧-٩٩).واتە (ئێمە دەزانین تۆ دڵت تەنگ دەبێ بەوەی کە کافرەکان دەیڵێن، (٩٧) دەسا تۆ ئەی محەمەد ﷺ پاك و بێگەردیو سوپاسی خودای خۆت بکەو کوڕنۆش بەرە لەگەڵ کڕنۆشبەران پەرستنی خودا بکە هەتا دەمریت.)

## (( فضل الجهاد في سبيل الله تعالى ))

و عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال :(( انتدب الله لمن خرج في سبيلة _ لا يخرجه إلا ايمان بي و تصديق برسلي _ أن ارجعه بما نال من أجر أو غنيمة أو ادخله الجنة ، ولولا أن أشق علي ما قعدت خلف سرية ، ولوددت أني اقتل في سبيل الله ثم احيا ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل )) .(١)

## دەروازەیگەورەیی وپیرۆزی تێكۆشان وخەبات لە پێناو خودای گەورەدا

و عن ابي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال :(( انتدب الله لمن خرج في سبيله _ لا يخرجه إلا ايمان بي و تصديق برسلي _ أن ارجعه بما نال من أجر أو غنيمة أو ادخله الجنة ، **لە باوكی هورەیرەوە خودای لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی:** (( انتدب الله لمن خرج في سبيلة _ **{خودای گەورە سۆز وپەیمانی داوە بە كەسێك كە لە پێناو خودا دەرچوو بێ،** لا يخرجه إلا ايمان بي **هیچ مەبەستێكی نەبێت لەو دەرچوونەی تەنها ئەوە نەبێت باوەڕی بەمن بێت** و تصديق برسلي **وپێغەمبەری ﷺ من بەڕاست بزانێت،** _ أن ارجعه بما نال من أجر أو غنيمة أو ادخله الجنة **كە بیگێڕێتەوە بەو پاداشت ودەستكەتەوە** أو ادخله الجنة **یان ئەوە دەیخەمە بەهەشتەوە،**( ولولا أن أشق علي ما قعدت خلف سرية ، ولوددت أني اقتل في سبيل الله ثم احيا ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل )) . **ئێنجا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت سوێند بەخودای گەورە ئەگەر بەزەحمەتم نەزانیایە لەسەر نەتەوەكەم لەهیچ سریەیەك دوا نەكەوم ودانەنیشم** ولوددت أني اقتل في سبيل الله ثم احيا **سوێند بەخودای گەورە حەز دەكەم من بكوژرێم لە پێناو خودادا ولەپاشاندا زیندوو بكرێمەوە** ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل)) **لە پاشاندا بكوژرێم ولەپاشاندا زیندوو بكرێمەوە** ثم اقتل **لە پاشاندا بكوژرێم**

---

**(١) أخرجه البخاري في صحيحة برقم (٣٦) واحمدي في المسند برقم (٨٩٨٠) والبهيقي في سننه (١٥٧/٩) من طرق عن عبدالواحد بن زياد عنه عمارة القعقاع ، عن ابي زرعة عن ابي هريرة رضي الله عنه به . وأخرجه مسلم في صحيحه برقم (٧٨٧٦) والنسائي في سننه (٢٧٥٣/٨) من طرق عن عمارة بن القعقاع به .**

# لێکدانەوەی زاناکان بۆ فەرموودەکە

# باب فضل الجهاد في سبيل الله تعالى

(انتدب) ندبه لامر انتدب له ، بانگی بکەیت بۆ شتێك وەلآمت بداتەوە وبە قسەت بکات

(الندب) ای تکفل، واتە خودای گەورە سۆز وپاداشت دانەوەی داوە.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. گەورەیی نیازی مرۆڤ لە پشت کارەکانیەتی.

٢. دروستە بڵێت خۆزگە فلآن شت بەدەست بهێنم لە کاتێکا دەزانی کە محاڵە بە دەستی بهێنی.

٣. جیهاد وتێکۆشان فەرزی کفایەیە نەك فەرزی عەین بێت.

٤. هەوڵبدەی ئەو ناخۆشیەی کە لەسەر مرۆڤی موسڵمانە لەسەری لابدەیت.

٥. هەر کەس بۆ جیهادی دژی سنووربەزان بووەستی بچێت جیهادە.

٦. هەر کەس فەرمان بە چاکە بکات قەدەغەش لە خراپە بکات هەر جیهادە.

٧. سۆزو پەیمانی خودای گەورە بۆ کەسێك کە تێکۆشانی بۆ خودا بێت لە ڕێگەی خودا دابێت.

٨. مەبەستی لەم تێکۆشانەدا باوەڕ بوون بەخودای گەورە وپێغەمبەران ﷺ بەڕاست بخاتەوە.

٩. گەورەیی وپیرۆزی کەسێك کەلە پێناو خودای گەورەدا تێکۆشان وخەبات بکات.

١٠. سۆزی خودایە کە پاداشتی بداتەوە ودەست کەوتی بەدەست بخات یان ئەوەتا خودای گەورە لە کاتی شەهید بوونی بەبەهەشتی شاد دەکات.

١١. بەزەیی وسۆزی پێغەمبەر ﷺ دەردخات بەنەتەوەکەی کەهەرشتێك ببێتە هۆی ئەوەی رەحمەت ونارەحەتی بێت لەسەریان فەرز نەکات نەوەك نەتوانن بە جێی بهێنن

توشی ماندوو بوون هیلاك بوون بن یان نەتوانن بەم كارە هەستن لە دەرئەنجامد دووچاری سزا وتۆڵەی خودایی ببنەوە.

١٢. دلێری وبوێری وئازایەتی پێغەمبەر ﷺ نیشان دەدات رۆح سووکی ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە پێناو خودای گەورەدا رۆحی خۆی خەڵات بکات.

١٣. فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەموو هەر لێی دڵنیاین بە سوێند خواردنی زیارت ئێمە لە مەسەلەکان دڵنیاتر دەکاتەوە.

١٤. هەر چەندە مرۆڤ بە ئێش وئازار بێت لە پێناو خودای گەورەدا هەر هێشتا حەزی بەوە بێت زیاتر خۆی خەڵات بکات بۆ تێکۆشان لە پێناوی خودا.

١٥. هەر شتێك تایبەتی نەبێت بۆ خودای گەورە ئەوا هیچ سود وقازانجێکی پێناگەت بەڵکو رەنجەرۆی دوارۆژ دەبێت ئەگەر کەمترین مەبەست ونیازی بۆ بێجگە لە خودی گەورەی تیادا بێت.

١٦. فەزڵ وگەورەیی وپیرۆزی ئەو کەسەی کە لە پێناو خودای گەورە تێکۆشان وخەبات دەکات کاتێك پاداشت دەدرێتەوە لەلایەن خوداوە حەز وئاواتی ئەوە دەخوات کە زیندوو بکرێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر خۆی بکات بەخەڵات لەتێکۆشانی لە پێناو خودادا، ✲ سێ ئەم ئاواتە دەخوازێت ودووبارە دەکاتەوە.

---

• خودا دەفەرموێت ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنْفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾ البقرة/١٥٥

واتە : ( بەڕاستی و بەدڵنیایی ئێمە، ئێوە تاقی دەکەینەوە بەترس و برسیەتی و کەمی ماڵ و مرۆڤەک بەروبوومەکان، ئەی پێغەمبەر ﷺ ( تۆ مژدەی رزگار بوون پاداشت بدەبە ئەو کەسانەی کە دان بەخۆیاندا دەگرن

• ( ارسلنی لصلة الارحام، وكسر الاوثان، وان يوحدالله ولايشرك به شيئا)﴾ فەرموودە •

واتە : خودا منی ناردووە بۆ ئەوەی خزمایەتی بگەیەنم بتەکان بشکێنم : تەنها خو بپەرسترێ هیچ هاوەڵێ بۆ پەیدا نەبێ و نەکرێ .

• ئەگەر خۆت بەهێز کرد ئەوا بۆ لە خودا ترسین خۆت بەهێز بکە : ئەگەر لاواز بووی خۆت لەسەر پێچی کردنی خودا لاواز بە ﴿ ئیمامی عەلی ﴾

## ((بيان ان ارواح الشهداء في الجنة ))

وأنهم احياء عند ربهم يرزقون عن مسروق قال : سألنا عبدالله ( هو ابن مسعود ) عن هذه الآية [ وَلا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله بل احياء عند ربهم يرزقون (١٦٩) ] (١) قال : اما إنا قد سألنا عن ذلك فقال :(( أرواحهم في جوف طير خضر لها قناديل معلقة بالعرش تسرح من الجنة حيث شاءت ثم تأوى الى تلك القناديل فاطلع اليهم ربهم اطلاعة فقال : هل تشتهون شيئا ؟ قالوا : أي شيء تشتهي ؟ ونحن نسرح من الجنة حيث شئنا ، ففعل ذالك بهم ثلاث مرات فلما رأوا أنهم لن يتركوا من أن يسألوا قالوا : يا رب نريد ان ترد أرواحنا في اجسادنا حتى تقتل في سبيلك مرة اخرى فلما رأي أن ليس لهم حاجة تركوا))( ١)

## دەروازەی روونكردنەوەی ئەوەی كە رۆحی خەلات بووان بۆ رێگەی خودای گەورە لەبەهەشتدایە وئەوان زیندوون لەلای خودای خۆیانن ورۆزی دەدرێن

وأنهم احياء عند ربهم يرزقون عن مسروق قال : سألنا عبدالله ( هو ابن مسعود ) عن هذه الآية [ وَلا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله بل احياء عند ربهم يرزقون ))

**لە (مەسروقەوە ڕەحمەتی خودای لێبێت دەڵێت؛ پرسیارمان لە عەبدوڵلا كرد (كە عەبدوڵلای كوڕی مەسعوودی هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ لەواتای ئەم ئایەتە؛ ﴿ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احياء عند ربهم يرزقون﴾ال عمران؛ واتە؛ ئێوە گومانتان بەو شێوە نەبێت بەرامبەر ئەو كەسانەی كە كوژراون لە پیناو خودای گەورەدا كە ئەوان مردوو بن، بەڵكو ئەوان لەلای خودای خۆیان زیندوون ڕۆزی دەدرێن.** قال : اما إنا قد سألنا عن ذلك فقال :(( أرواحهم في جوف طير خضر لها قناديل معلقة بالعرش تسرح من الجنة حيث شاءت ثم تأوى الى تلك القناديل فاطلع اليهم ربهم اطلاعة فقال : هل تشتهون شيئا ؟ **عەبدوڵلای كوڕی مەسعود وتی؛ بەڕاستی ئێمەش --**

---

١)اخرجه مسلم في صحيحة برقم (١٨٨٧) و ابن ماجه في سننه برقم (٢٨٠١) و ابن أبي شيبة في المصنف (٣٠٨/٥) من طريقة ابي معاوية عن إسحاق بن إبراهيم عن جرير و عيسى بن يونس عن الاعمش عن عبدالله بن مرة عن مسروق به . و أخرجه الدارمي في سننه برقم (٢٤٥٤) والطيالسي في مسنده برقم (١١٤٣) من طريق شعبة عن سليمان عن عبدالله بن مرة به .وأخرجه الترمذي في سننه برقم (٣٠١١) من طريق أبي عمر عن الأعمش به .

هەمان پرسیارمان لە پێغەمبەر ﷺ كرد، فەرمووی: {ڕۆحەكانیان لە ناو سكی باڵندەی سەوزن لها قناديل معلقة بالعرش جێی نیشتنەوە وخۆ لەسەر ڕاگرتنیان هەیە كە هەڵپەسراوە بە عەرش (تەختی خودای گەورە) تسرح من الجنة حيث شاءت دەفڕن لەناو بەهەشتدا بۆ هەر كوێ حەزیان لێبێت ثم تأوى الى تلك القناديل ولە پاشاند دەگەڕێنەوە بۆ جێی نیشتنەوەكانی خۆیان فاطلع اليهم ربهم اطلاعة خودای گەورە خودی خۆی نیشان ئەوان دەدات، فقال : هل تشتهون شيئا ؟ پێیان دەفەرموێت: ئایا حەزتان بە هیچ شتێك نیە؟ قالوا : أي شيء تشتهي ؟ ونحن نسرح من الجنة حيث شئنا ، ففعل ذالك بهم ثلاث مرات ئەوانیش دەڵێن ئەی خودایە ئێمە حەزمان بۆچی بچێت؟ ونحن نسرح من الجنة حيث شئنا ، لە كاتێكا دەفڕین بەناو بەهەشتدا بۆ هەر كوێمان بوێت دەڕۆین ففعل ذالك بهم ثلاث مرات تا لێرەدا خودای گەورە سێ جار ئەمەیان لێ دووبارە دەكاتەوە، فلما رأوا أنهم لن يتركوا من أن يسألوا قالوا : يا رب نريد ان ترد أرواحنا في اجسادنا حتى تقتل في سبيلك مرة اخرى فلما رأي أن ليس لهم حاجة تركوا )) . كاتێك دەزانن ودڵنیا دەبن لەوەی كە خودای گەورە وازیان لێناهێنێ وهەر پرسیاریان لێدەكرێ حەزیان بۆ چی دەچێ، ئا لەو كاتەدا داوای خۆیان دەكەن قالوا : يا رب نريد ان ترد أرواحنا في اجسادنا ودەڵێن ئەی خودایە ئێمە دەمانەوێ ڕۆحەكانمان حتى تقتل في سبيلك مرة اخرى بۆ لاشەمان بگێڕێتەوە هەتا بۆ ئەوەی جارێكیتر لە پێناو تۆدا بكوژرێینەوە، فلما رأي أن ليس لهم حاجة تركوا )) .كاتێك خودای گەورە دەزانێت ولە دوای ئەو هەموو پرسیارانە بۆ داخوازیەكانیان كە ئەوانیش هیچ پێویستیەكیان نیە تركوا وازیان لێدەهێنرێت}

## لێكدانەوەی زاناكان

### باب : بيان ان ارواح الشهداء في الجنة وانهم احياء عند ربهم يرزقون

### گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. (قاضي) دەڵێت: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕۆحەكان دەمێننەوە وتیا ناچن چاكە كار پاداشتی دەدرێتەوە وخراپە كاریش تۆڵەی لێ وەردەگیرێتەوە.

٢. بەهەشت دروست کراوە وئامادەیە ئەمەش ڕێڕەوی ئەهلی سوونە وجەماعەیە.

٣. ئەو بەهەشتەی ئادەمی لێ دەرکرا هەمان بەهەشتە کە موسڵمانان دەچنە ناوی لە دوا ڕۆژدا.

٤. پاداشت وتۆڵە وەرگرتنەوە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت.

بێجگە لە شەهیدان خەڵکان لە ئێواران وبەیانیاندا جێگەی خۆش (یان) ناخۆشی خۆیان پێ نیشان دەدەن، [٤٥ النَّارُيُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ {٤٦{ ] غافر: ٤٦ .

٥.تأوي الى قناديل تحت العرش، ئەمە بەهۆشی مرۆڤ ناپێورێت بەڵكو زیاترە لەوەی کە مرۆڤ هزری ببڕێت.

٥. مرۆڤ وقوتابی زانست ئەگەر لە شتێك تێنەگەیشت یەکسەر بگەڕێتەوە بۆ لەخۆی زاناتر نەك بەبێ هیچ زانستێك بۆچوونی خۆی دەربڕێ.

٦. یەکەم سەرچاوەی تێگەیشتن لە قورئان ڕوونکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ.

٧. ئەو ژیانەی کە ڕۆحی شەهیدانی ڕێگەی خودای گەورەی تیادایە جیاوازە لە هەر جۆرە ژیانێکی تر کە ئێمە دەرك وپەی پێ ببەین.

٨. شەهیدان لەلای خودای گەورە زیندوون وژیان دەبەنە سەر وڕۆزی تایبەتیان بۆ هەیە لەلایەن خوداوە.

٩. هەتا ڕوونکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ هەبێت نابێت مرۆڤ پەنا بۆ پەی بردن لە واتاکانی فەرموودەی خودای گەورە بۆ هیچ کەسێکی تر ببات.

١٠. ڕۆحی شەهیدەکان لەناو سك وسنەی جۆرە باڵندەیەکە کە خودای گەورە تایبەتی کردووە بۆ خزمەتکردنی ئەم شەهیدانە لەخۆشی یەکانی بەهەشتدابن هەتا ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت.

١١. جێگەی حەوانەوەی ئەو باڵندانە لە ژێر عەرشی خودای گەورەدایە کە ڕۆحی شەهیدەکان هەموو خۆشیەك لەوێدا بەدی دەکەن.

١٢. بۆ هەر کوێیان بوێت وپێخۆش بێت دەفڕن ودەچن بۆ ئەوێ هیچ دووری ونزیکی ئاستەنگ نابێت لە بەربەستیان.

**١٣. خودای گەورە بەگەورەیی خۆی پرسیاری حاڵیان دەکات لەخۆشیان دەپێچێتەوە...**

**لێرەشدا چەند حیکمەت هەیە:**

**حیکمەتی یەکەم:** گەورەیی وپیرۆزی شەهیدان دووپات دەکاتەوە.

**حیکمەتی دووەم:** گرنگی ورێزلینانیان ئەی چی لەوە رێزلێنانترە کە مرۆڤ خودای گەورە خۆی پرسیاری داخوازیەکانت بکات بۆت بەجێ بهێنێ؟!

**حیکمەتی سێیەم:** بۆ ئەوەی ئێمەش ڕێزیان لێبگرین وچاویان لێ بکەین.

**حیکمەتی چوارەم:** خزمەتی بەجێماوانیان لە کەس وکاریان بکەین وسەرپەرشتیان لێبکرێت بە هیچ شێوەیەك فەرامۆش لەخزمەت کردنیان نەکرێت.

١٥) پرسیار لێکردنیان بۆ جاری سێیەم بۆ زیاتر گرنگی پێدان ورێز لێنانیانە کە خودای گەورە زۆر زیاتری بۆ ئەوان دەوێت کە ئەوان بۆ خۆیانیان دەوێت وپێخۆشە.

١٦) شەهیدان زۆر بەبەشی خۆیان ڕازین وسوپاسی خودای لەسەر دەکەن وبەلایانەوە سەیرە کە هیچ خۆشیەك نیە کە ئەوان لە زەتی لێ نەبکەن و بۆیان ئاسان نەکرا بێت.

17) کاتێك کە دڵنیا دەبن لەوەی کە ئەبێت داخوازی خۆیان هەر بکەن لەوپەڕی پڕ بەهاییدا، تەنها داوایان ئەوەیە خودای گەورە بیانگێڕێتەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی جارێکیتر بکوژرێن.

18) ئەمەش لە سوننەتی خودا دا نیە کە کەسێك چووە بەهەشت یان دۆزەخ بگەڕێتەوە بۆ دونیا، چونکە ژیانی دونیا تەواو بەسەرچووە یان ئەوتا خۆشی هەتا هەتایی یان سزا وئەشکەنجەی هەمیشەیی وبێ بڕان.

---

- ئەگەر خودا کەسێکی خۆش بوێ خۆشەویستی ئەخاتە دڵی خەلکی یەوە. ((عەبدول مەلیك کوڕی مەروان)).
- ئەگەر پشت بەستن بە جگە لە خودابێ هەموو سەر شۆڕیەك روو لە مرۆڤ دەکات لە هەموولایە کەوە . ﴿ باوکی فیراس حەمەدانی ﴾

## ( فضل أمة محمد ﷺ )

وعن أبي موسى الاشعري رضي الله عنه قال : قال رسول الله :( اذا كان يوم القيامة دفع الله عز وجل إلى كل مسلم يهوديا أو نصرانياً فيقول: هذا فكاك من النار) (١) .

## دەروازەی: پیرۆزی نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ

**لە باوکی موسای ئەشعەریەوە ڕەزای خودای لێبێت وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: :(( اذا كان يوم القيامة دفع الله عز وجل إلى كل مسلم يهوديا أو نصرانياً {کاتێک ڕۆژی قیامەت دێت خودای گەورە بۆ هەر موسڵمانێک جولەکەیەک یان گاورێک دەداتە دەستی و فيقول : هذا فكاك من النار )) دەفەرمووێ: ئەمە فیدیە بریتی ورزگار بوونی تۆیە لەئاگری دۆزەخ}.**

## لێکدانەوەی زاناکان باب فضل امه محمد ﷺ

**{هذا فكاكك من النار} ڕزگار بوونتە وخستنە جێی تۆ لە ئاگری دۆزەخدا، واتەی فەرموودەکە بەگشتی ئەوەیە لە فەرموودەی تر هاتووە لە ڕێگەی باوکی هورەیرەوە ڕەزای خودای لێبێ.**

**{ لكل احد منزل في الجنة ومنزل في النار فالمؤمن اذا دخل الجنة خلفه الكافر في النار لاستحقاقه ذلك بكفره} واتە بۆ هەر کەسێک دوو جێگە هەیە جێگەیەک لە بەهەشت وجێگەیەک لە دۆزەخ، باوەڕدار کاتێک دەچێتە بەهەشت کافر وبێ بڕوا جێگەکەی**

---

١)اخرجه مسلم في صحيحه برقم (٢٧٦٧) (٤٩) و أحمد في المسند برقم (١٩٦٧٠) والبيهقي في شعب الإيمان (٣٧٥) وأبو نعيم في اخبار أصبهان (٨٠/٢ و ١٨٩) من طريق ابو اسامة عن طلحة بن يحيى عن أبي بردة عن ابي موسى رضي الله عنه به .
و أخرجه مسلم في في صحيحة برقم (٢٧٦٧) (٥٠) و أحمد في المسند برقم (١٩٤٨٥) و الطيالسي في مسنده برقم (٤٩٩) و أبو يعلي في مسنده برقم (٧٢٨١) من طريق همام عن قتادة عن سعيد بن أبي بردة عن أبيه عن أبي موسى رضي الله عنه به .وأخرجه البخاري في التاريخ الكبير (٣٨/١) و الطبراني في مسند الشاميين برقم (٢٥٥٤) والبهيقي في البعث والنشور (٩٣) من طريق عبدالملك بن عمير عن أبي بردة به .

دەگرێتەوە لە دۆزەخ، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە شیاوی دۆزەخە بە هۆی کافر بوونەکەیەوە.

واتای {فكاكك من النار} ڕزگار بوونە وفیدیەی تۆیە لە ئاگر ئەوەیە تۆی باوەڕدار نزیك وخەریك بووی بکەویتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، چونکە بەڕاستی خودای گەورە ئەندازەی پڕ بوونەوەی بەهەشت ودۆزەخی داناوە کاتێك کافرەکان دەچنە دۆزەخ بەهۆی کافر بوونیانەوە، وەك جێ گۆڕکی کردنی لێ دێت.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. پیرۆزی ڕێزی نەتەوەی موسڵمانان لەلای خودای گەورەوە بەسەر هەموو نەتەوەکانی بێجگە لە موسڵمانمان دیار دەکات.

٢. هەموو موسڵمانێك دەچێتە بەهەشت لەپاش تۆڵە وسزای تاوانەکانی.

٣. هەر کەس موسڵمان نەبێت هەرگیز ناچێتە بەهەشت، باهەر چەند خێرخواز بێت لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ مەرجە باوەڕهێنان بە پێغەمبەر ﷺ.

٤. جیاوازی نەکردن لە نێوان پێغەمبەراندا ﷺ.

٥. باوەڕ بوون بەسەرجەم پێغەمبەران ﷺ ناتەواوە ئەگەر باوەڕ بوونی بەخودی محەمەد ﷺ تیادا نەبێت.

٦. ناعەدالەتی خودای گەورە نیە کاتێك بۆ هەر موسڵمانێك کافرێك دەبێتە ڕزگار بوونی ئەو لە دۆزەخ، چونکە خۆیان نایانەوێ بچنە بەهەشتەوە لە کاتێکا کە بڕوا بە پێغەمبەر ﷺ ناهێنن.

٧. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە لە دونیادا مافیان بخۆین وستەم وزۆریان لێبکرێت، نەخێر زۆر بە پێچەوانەوە نەبێت هەموو مافێکی ڕەوای مرۆییان بۆ دابین بکرێت بەم چەند بەڵگەیە:

لەو بەڵگانە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {من دوژمنی کەسێکم دەعوای لەسەر دەکەم لە خزمەت خودای گەورەدا ئەگەر بێت وکەسێك لە پەیمان دراوان (لە کافرەکان دەکات) بکوژێت یان ماڵی بخوات)) فەرموودەکە راستەو صحیحە.

٨. ئەو فیدیە بوونەی بێ بڕوا بە چاودێری وفەرمانی خودای گەورە خۆی دەکرێت ودەبێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەسە بۆ یەکسانی ودادپەروەری مەسەلەکە.

٩. بە دەقی فەرموودەی خودای گەورە ئەم دادوەری یە جێ بەجێ دەکرێت.

---

١خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ سورة الرحمن١

واتـە :(  هـەر لـە ئـەو دەپاڕێنـەوە ئـەو کەسـانەی لـە ئاسمانـەکان و زەوی دان ، هـەموو ڕۆژێك خەڵك لە ناخۆشی قوتار دەکات فەقیر و نەبوون دەوڵەمەند دەکات).

١. باهەر کەسێك لە ئێوە یەکترتان خۆش بوێت. ((عیسی پێغەمبەر سەلامی خودای لێ بێ)).

٢. ئەگەر رازی بوونی خودا نەخەیتە پێش هەموو شتێکی ترەوە لە حەزەکانت ئەوا تۆبەدان بە خۆگر نادانرێت ﴿ باوکی عەتاهی یە ﴾

٣. تەنــها بۆ لای خـــودا بگەڕێوە نە بۆ ئەم لاو ئەولا چونـــــکە بەندەی خودایت و خودای گەورە پادشـــاتە ﴿ باوکی عەتاهی یە ﴾

٤. ئاگادار بن هەموو شتێك بێجگە لە خودای گەورە پووچەڵ هەموو بەهرەیەکیش دەڕوات و نامێنـــــێ ﴿ کەبیدی کوڕی رەبیعە ﴾

٥. دەستی خۆت توند گرێ بدە بەپەتی خوداوە چونکە بەراستی هەر ئەو پایەیە کاتێك پایەکانی تر ناپاکیت لە گەڵ بکەن. ﴿ باوکی فەخری موسڵێ ﴾

٦. هیچ فەرمانێك نابێ بێتە جێ ئەگەر فەرمانی خودای گەورەی شکاند . ﴿ بنچینەیەکی فیقهی یە ﴾

# ( فضل أمة محمد ﷺ )

وعن ابن عمر رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال :(( إنما بقاؤكم فيمن سلف من الأمم كما بين صلاة العصر إلى غروب الشمس ، أوتي أهل التوراة التوراة فعملوا به حتى انتصف النهار ثم عجزوا فأعطو قيراطا قيراطا ، ثم اوتي أهل الإنجيل الإنجيل فعملوا به حتى صليت العصر ثم عجزوا فأعطو قيراطا قيراطا ، ثم أوتيتم القرآن فعملتم به حتى غربت الشمس فاعطيتم قيراطين قيراطين ، فقال اهل الكتاب : هؤلاء اقل منا عملا واكثر أجرا : قال الله : هل ظلمتكم من حقكم شيئاً ؟ قالوا : لا فقال : فهو فضلي اوتيه من آشاء ) .(١)

## دەروازەی: پیرۆزی نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ

وعن ابن عمر رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال :(( إنما بقاؤكم فيمن سلف من الأمم كما بين صلاة العصر إلى غروب الشمس ، **لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ڕەزای خودایان لێبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** :(( إنما بقاؤكم فيمن سلف من الأمم كما بين صلاة العصر إلى غروب الشمس { **مانەوەی ئێوە لە ناو ئوممەتەکاندا کە لەپێش ئێمە ڕۆیشتوو تێپەڕ بوون وەك نێوان عەسرە بۆ مەغریب ورۆژ ئاوا بووندا،** ، أوتي أهل التوراة التوراة فعملوا بها حتى انتصف النهار ثم عجزوا فأعطو قيراطا قيراطا .

---

(١) اخرجه البخاري في صحيحة برقم (٧٤٦٧) و أحمد في المسند برقم (٦٠٢٩) و البيهقي في سننه (٦/١١٨ - ١١٩) من طريق أبي اليمان عن شعيب عن الزهري عن السالمبن عبدالله عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما به .وأخرجه البخاري في صحيحة برقم (٧٥٣٥) من طريق عبدان عن عبدالله عن يونس عن الزهري به .وأخرجه البخاري في صحيحة برقم (٥٥٧) و أحمد في المسند برقم (٦١٣٣) و الطيالسيفي مسنده برقم (١٨٢٠) و أبو يعلي في مسنده برقم (٥٤٥٤) من طرق عن ابراهيم بن سعد عن الزهري به .وأخرجه البخاري في صحيحة برقم (٢٢٦٨) و أحمد في المسند برقم (٤٥٠٨) و عبدالرزاق في المصنف برقم (٢٠٦٥٦ ، ٢٠٩١١) والبيهقي في سننه (٦/١١٨) من طرق عن ايوب عن نافع عن ابن عمر رضي الله عنه به . وأخرجه البخاري في صحيحة برقم (٣٤٥٩) و عبد بن حميد في المنتخب برقم (٧٧٣) والبغوي في شرح السنة برقم (٤٠١٧) من طرق عن نافع عن ابن عمر به .

ثم اوتي أهل الإنجيل الإنجيل فعملوا به حتى صليت العصر ثم عجزوا فأعطو قيراطا قيراطا ، خاوەنی پەڕتووكی تەوڕات، تەوڕاتیان پێدرا وكاریان پێكرد هەتا نیوەی ڕۆژ ثم عجزوا فأعطو قيراطا قيراطا ، لە پاشا ندا نەیانتوانی كارەكە بۆ ئێوارە پەرە پێ بدەن وبەردەوام بن لەبەر ئەوە تەنها بە ئەندازەی كارەكەی خۆیان هەندێك پارەی كەمیان پێدان.

ثم اوتي أهل الإنجيل الإنجيل فعملوا به حتى صليت العصر لەپاشاندا خاوەن ئینجیلەكان ئینجیلیان پێدرا لە پاشاندا نەیانتوانی كارەكە بۆ ئێوارە پەرە پێ بدەن وبەردەوام بن لەبەر ئەوە تەنها بە ئەندازەی كارەكەی خۆیان هەندێك پارەی كەمیان پێدان.

... ثم أوتيتم القرآن فعملتم به حتى غربت الشمس فاعطيتم قيراطين قيراطين ، فقال اهل الكتاب : هؤلاء اقل منا عملا واكثر أجرا : قال الله : هل ظلمتكم من حقكم شيئاً ؟ قالوا : لا فقال : فهو فضلي اوتيه من آشاء ) .

لە پاشاندا قورئان درا بە ئێوە كارتان پێكرد هەتا ڕۆژئاوا بوو فاعطيتم قيراطين قيراطين لەبەر ئەوە دوو ئەوەندەی ئەوانیتر پارە وهەقی ماندوو بوونتان درایەوە.

فقال اهل الكتاب : هؤلاء اقل منا عملا واكثر أجرا : بۆیە كەسانی خاوەن پەڕتووكە ئاسمانیەكان دەڵێن ئەوننە كاریان كەمتر بووە وپاداشتیان زۆر تر بووە، قال الله : هل ظلمتكم من حقكم شيئاً ؟ قالوا : لا فقال : فهو فضلي اوتيه من آشاء ) .

خودای گەورە دەفەرمووێت: ئایا هیچ ستەمێكم لێكردوون كە لە ماف ئێوە كەم بكەم؟ قالوا : لا ئەوانیش دەڵێن نەخێر، فقال : فهو فضلي اوتيه من آشاء ) .

خودای گەورە دەفەرمووێت: ئەوە چاكە وپیرۆزی خۆمە بەهەر كەسێكی بدەم كە خۆم بمەوێ}.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. كاتی عەسر وئێوارە هەتا خۆر ئاوا بوونە.

٢. جاری وا دەبێت كارێكی كەم دەكەیت پاداشتێكی گەورە وتەواو وەردەگریت، وەك چۆن مرۆڤ كاتێك دەگاتە یەك ركات نوێژی جەماعەت خودای گەورە خێری هەموو نوێژەكەت پێ دەگەیەنێ.

٣. چاكترین نوێژ نوێژی عەسرە.

٤. بێگومان نوێژی عەسر لەسەرەتاوە بكرێت خێرترە بەڵام ئەگەر هاتوو دوا بكەوێت پێش خۆر ئاوا بوون خێرەكەت دەگاتێ.

٥. ئەمەش هیچ پێوەرێك ناگرێتەوە وەك ئەوەی ئەگەر كەسێك لە عەسرەوە بەرۆژوو بێت چاوەڕوانی خێرو پاداشت بێت لەوەڵامداپ هیچ خێری ناگاتێ، چونكە لە عیبادەتدا قیاس كردنی نیە. {انما بقاءكم فيما سلف من الامم قبلكم} مانەوەی ئێوە لەچاو تەمەنی بەسەر چووی ئەوانەوە وەك كاتی ماوەی عەسرە بۆ مەغریب.

٦. {حتى انتهى النهار عجزوا} ئەمە بۆ ئەو كەسانەیان لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ باوەری پێ نەهێنابێ، بەڵام ئەو كەسانەیان لەسەر ئایینی خۆیان بوون و وەفاتیان كرد بێ ئەوانە پاداشتی تەواو وەردەگرن.

٧. گەورەیی وپیرۆزی دەرئەنجام وخێری ئەم نەتەوەیە.

٨. كۆتای ودەرئەنجامی كارەكان بەستراوە بەكۆتایی ودەرئەنجامانەوە بە خێركۆتایی بێت ئەوا هەموو خێرەیان بێت ئەوا هەمووی بەشەڕ كۆتایی پێ دێت.

٩. نەتەوەی پێش ئێمە لەڕابوردوودا بە تەواوی هەڵنەساون بە كارەكانیان وبە تێرو تەسەلی ڕایان نەپەڕاندووە.

١٠. نە ئەهلی تەورات بە تەواوی كاریان بە تەورات كردووە، نەئەهلی ئینجیل كاریان بە ئنجیل كردووە.

١١. بەڵام نەتەوەی ئیسلام كاری تەواویان بە ئیسلام كردووە وبەتەواوی ڕایان پەڕاندووە، ئەم جێبەجێ كردنەش تەنها پەیوەست نەبووە بەسەردەمی هاوەڵانەوە بە لەو پەری لووتكەی جێبەجێ كردنیدا بوو بن، بەڵێ تا دواین گرۆی ئەم نەتەوەی ئیسلامە هەر دەست بە ئیسلامەتیەوە دەگرێت، ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە {لا تجمع امتي على ضلالة} ئەمەش تایبەت نیە بە كات وسەردەمێك.

١٢. هەر كەسە وبە پێی كار وكارداری خۆی پاداشت وەردەگرێت بەبێ ئەوەی هیچ لەماق خۆی كەمتر وەرگرێت.

## ( الترهيب من الغدر وأكل مال الناس بالباطل )

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال : (( قال الله تعالى : ثلاثة أنا خصمهم يوم القيامة : رجل أعطى بي ثم غدر ، ورجل باع حرا فأكل ثمنه ، ورجل استأجر أجيراً فاستوفى منه ولم يعطه أجره )) . (١ )

**دەروازە: ترسناكی وگوناهی ئەم جۆرە كەسانەی خوارەوە كە باسيان لێوە دەكەين**

**لەباوكی هورەيرەوە خودای گەورە لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموويەتی:** (( قال الله تعالى : ثلاثة أنا خصمهم يوم القيامة : **خودای گەورە دەفەرموێت: سێ كەس هەن من ((داوا و دژايەتی و دەعوايان دەكەم)) لەسەر دەكەم لە ڕۆژی قيامەتدا:** رجل أعطى بي ثم غدر **كابرايەك پەيمانێك بدات بەمن لە پاشاندا ناپاكی لەو پەيمانە بكات** ورجل باع حرا فأكل ثمنه **كابرايەك كەسێكی سەربەست بكات بەبەندە و "كۆيلە" بيفرۆشێت نرخەكەی بخوات** ورجل استأجر أجيراً فاستوفى منه ولم يعطه أجره )) **كابرايەك كەسێك بەكرێ بگرێت هەموو ئيش وكارەكانی خۆی پێ بكات بەڵام مافی ڕەو وتەواوی خۆی پێنەدات...**

**لێكدانەوەی زاناكان بۆ فەرموودەكە**

**باب الترهيب من الغدر واكل مال الناس بالباطل وشەی (الخصم) خەتتابی دەڵێت: بريتی يە لەو كەسەی كە زۆر دژايەتيت دەكات وزۆر خۆش حاڵ بێت لە دژايەتی كردنی تۆ وشارەزا وپسپۆڕ بێت لە ((دەگەلێدان))((خەنجەر لێدان لەپشتەوە)) وزاڵ بوون**

---

(١ ) أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٢٢٢٧ ، ٢٢٧٠ ) وابن ماجه في سننه برقم ( ٢٤٤٢ ) وأحمد في المسند برقم ( ٨٦٩٢ ) وأبو يعلى في مسنده برقم ( ٦٥٧١ ) وابن الجارود في المنتقى برقم ( ٥٧٩ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٧٣٣٩ ) والبيهقي في سننه ( ١٤/٦، ١٢١ ) والبغوي في شرح السنه برقم ( ٢١٨٦ ) والطحاوي في شرح مشكل الآثار برقم ( ١٨٧٨ ) من طرق عن يحيى بن سليم عن إسماعيل بن أميه عن سعيد ابن أبي سعيد المقبري عن أبي هريرة رضي الله عنه به.

بەسەرتا.وشەی (اعطی) ئەوەیە سۆز وپەیمان بدات بەناوی خوداوە، واتە بەناوی خودای گەورە بە کار بهێنێ بۆ فێلٚ وتەڵەکەبازی کردن لە خەڵکی یان لە دوژمنانی.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. گەورەیی تاوانی ئەو سێ جۆرە کەسە دەردەخات.

٢. هەر کەس پێغەمبەر ﷺ دووژمن ودژایەتی بکات، ئەوە بەدڵنیایی ڕیسوایی هەمیشەیی هاوبەشیەتی.

٣. ئەمە حاڵی هەر کەسێکە دووژمنایەتی لەگەڵ خودا دەکات پەنا بەخودای گەورە.

٤. کەسی یەکەم ئەو کەسەیە سەرپێچی لەسۆز وپەیمان وبەڵێنەکانی دەکات، ئەمەش واتای نزیك ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً {٣٤} ﴾ سورةالاسراء الاية

بەتایبەت کاتێك سۆز بەخودای گەورە بدات کە چاکەی هەبێت بۆ بەندەکانی خودا، بەڵام لەدەرئەنجامدا ناپاکی پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات، یان سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودای گەورە بکات.

٥. کەسێك کە کابرایەکی سەربەست بکاتە کۆیلە وبیفرۆشێت تاوانێکی زۆر گەورەی کردووە ولێخۆش بوونی نیە، چونکە خوای گەورە ژیانی سەربەست بەو کەسەی داوە لێی داگیر دەکات ولێی وەردەگرێتەوە، وەك ئەوە وایە جەنگ لەگەڵ خودای گەورە بەرپا بکات.

ب ە پێچەوانەوە ئەگەر بتوانرێت کەسێك ئازاد وسەربەست بکەیت لە کۆیلایەتی جا هەر جۆرە کۆیلایەتیەك بێت ئەوا خودای گەورە بەپێی هەر ئەندامێکی ئەو کەسە ئەندامێکی تۆ لەئاگری دۆزەخ ڕزگار دەکات، ئەمەش فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە.

٦. هەر کەسێك وەك خوێن مژ وابێت

**٧. بەس خوێن لەخەڵکی بمژێت وکار وکاسبیان پێ بکات ئەوەی دەوێت بەئەوانی ئەنجام بدات، بەڵام ئەوەی هەقی ڕەوای ئەوان دەبێت لە دەرئەنجامی ئەو کارانەدا ئەو نکۆڵی لێ دەکات یان بەتەواوی ماف ڕەوای خۆیان پێنادات.**

**ئەمەش لە تاوانە گەورەکانە، چونکە هەر ئیش وکارێك دەکرێت چۆن ئەوەی دەتەوێ لەئیش وکارەکان پێ ی ئەنجام دەدەیت بەهەمان شێوە ئەبێت ماف ڕەوای ئەوانیش بخەیتە سەر چاوی خۆت، زۆر بەخۆش حاڵیەوە ئەو مافەیان بەتەواوی وتێروتەسەلی پێ بدەیت.**

---

کەسێك لەپیاو چاکان و پیاوانی خودا خۆشەویستی خودای دەکرد بۆ ئەوەی بەختەوەربێت، لەهەمووکەس بەختەوەر تر ئەو کەسەیە کەهەموو هیواو ئاوات و مەبەستێکی لەم دونیایەدا خۆش ویستنی خودابێت، ئەی چەندە جوانە ئەو ووشەیەی ﴿یحبهم ویحبونه﴾ خودا خۆشی دەوون ئەوانیش خودایان خۆش دەوێت.

بۆیە هەندێ زانا دەڵێن ئەوە زۆر گرنگ نیە کە خۆشیان دەوێ بەڵام ئەوە گرنگە خودا ئەوانی خۆشی بوێ، ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ال عمران/٣١

بڕوانە بۆ ئەو ڕێزەی ئیمامی عەلی کەتاجی بێ وێنەیی لەسەر نرا (پیاوێکە خودا و پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێ خوداو پێغەمبەریش ﷺ ئەویان خۆش دەوێت ).

یاوەرێك سورەتی (الاخلاص) ی خۆش ویست لەهەموو نوێژەکانیا هەر دەیووت و دووبارەی دەکردەوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (حبك اياها ادخلك الجنة) واتە خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو سورەتە تۆی بردە بەهەشتەوە

**چاودێری سپاردە بکە ، لە ناپاکی دوور بە ، داد پەروەر بە ستەم مەکە ، ئەگەر بۆ کارێك ووتت بەڵێ بە تەواوی ئەنجام بدە ، ئەگەر نا بڵێ ناتوانم و ناکەم نەوەك بڵێ بەڵێ بۆ کارێك و نەتوانی ئەنجامی بدە و خەڵك بڵێن درۆزنە . ﴿ باوکی تەممام ﴾**

# (النذر)

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال : (( لا يأتي آدم النذرُ بشيء لم يكن قد قدر ته ولكن يلقيه القدر وقد قدرته له أستخرج به من البخيل )) ( ١ )

## دەروازە: لەخۆ گرتن (النذر) كە هیچ سوود قازانجێك نلكەیەنێ

لە باوكی هورەیرەوە خودای لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: (( لا يأتي آدم النذرُ بشيء { نەوەی ئادەم بەنەزر ولەخۆ گرتن هیچ شتێك بەدەست ناهێنێ لم يكن قد قدرته مەگەر بەشتێك نەبێت كەمن خۆم ئەو شتەم ڕێك نەخستبێ ونەنوسی بێ ولكن يلقيه القدر بەڵام جاری وا دەبێت ئەو خێر بۆ كراوەی بەجێ دەهێنێ كە لەوە وپێش نووسیبووم كە ئەبێت ئەو شتە بەبەشی ئە كەسە ببێت... وقد قدرته له أستخرج به من البخيل ))تەنها سوودی نەزر ئەوەندەیە، ئەم لەخۆ گرتنە ماڵ وسامانێك لە گیرفانی ڕەزیل وچاو چنۆكان بەم شێوەیە نەبێت دەرناچێ لە گیرفانیان}.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژكاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. لەخۆ گرتن هیچ سوودێكی ئەو تۆی نیە.

٢. هەر شتێك خودای گەورە خۆی "تقدير" تەقدیر وڕێكخستن وفەرمانی نەكرد بیچت هەرگیز ڕوو نادات ونابێت.

٣. خودای گەورە پێی خۆش نیە مرۆڤ لەخۆ گرتن بكات.

---

( ١ )أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٦٦٠٩ ) من طريق عبد الله بن المبارك عن معمر عن همام بن منبه عن أبي هريرة رضي الله عنه به وأخرجه أحمد في المسند برقم ( ٨١٥٢ ) وابن الجارود في المنتقى برقم ( ٩٣٢ ) من طريق عبد الرزاق بن همام عن معمر به . وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٦٦٩٤ ) وأبو داود في سننه برقم ( ٣٢٨٨ ) والنسائي في سننه ( ١٦/٧ ) وابن ماجه في سننه برقم ( ٢١٢٣ ) وأحمد في المسند برقم ( ٧٢٩٧ ) من طرق عن أبي الزناد عن الأعرج عن أبي هريرة به .قال الحافظ ابن حجر رحمه الله في الفتح ( ٥٧٩/١١ ) هذا من الأحاديث القدسية لكن سقط منه التصريح بنسبته إلى الله عزوجل .

## تێبینی/ لەخۆگرتن دوو شێوازی هەیە:

**شێوازی یەكەم:** واجبە بەجێ بهێنرێ كاتێك لەخۆ گرتنێك لەم شێوەیە دەكرێت وەك ئەوەی كابرا بڵێت ئەگەر كورەكەم سەركەوتوو بێت ئەوا ئەوەندە پارە دەكەم بەخێر یان ئەوەندەرۆژ بەرۆژو دەبم ئالەم كاتەدا پێویست وفەرز دەبێت ئەم نەزرە بەجێ بهێنرێت.

**شێوازی دووەم:** نابێت بەجێ بهێنرێت لەخۆ گرتنی حەرامە وەك ئەوەی قوربانیەك لەخۆ بگرێت لەجێگەیەكدا گۆڕستان وشتێكی تیادا ئەنجام بدرێت بۆ بێجگە لەخودای گەورە.

یان كابرایە بڵێت بە ڕۆژو دەبم بەبێ ئەوەی بچمە سێبەر وخۆم فێنك بكەمەوە ئالێرەدا بەڕۆژوو دەبێت، بەلأم نابێت برگەی دووەم بەجێ بهێنێ بەوەی خۆی فێنك نەكاتەوە یان نەچێتە سێبەر.

٤. جاری وا دەبێت لە تەقدیری خودای گەورەدا ئەوە ڕوو دەدات كاتێك كابرایەك خێرێك نەزرێك لەخۆ دەگرێت بەنیازی ئەوەی كە خودای گەورە بۆی بەجێ بهێنێ نەك بەهۆی لەخۆگرتنەكەوە ئەو خێرەی دەست گیر ببێت.

٥. خێر وچاكە بوون وچاكە كردن خودای گەورە فەرمانی پێداوە وپێی خۆشە وپاداشتی مرۆڤی لەسەر دەدرێتەوە، بەڵكو خێر وچاكە كردن بەماڵ وسامان سوود وقازانجی دەبێت لەبەلأكانی دابەزی و دانەبەزیو.

٦. كابرای لەخۆ گرتوو ئەگەر شتێك لەخۆ بگرێت نابێت هیچی لێ بخوات.

٧. خێر وچاكە بوون وچاكە كردن خودای گەورە فەرمانی پێداوە وپێی خۆشە وپاداشتی مرۆڤی لەسەر دەدرێتەوە، بەڵكو خێر وچاكە كردن بەماڵ وسامان سوود وقازانجی دەبێت لەبەلأكانی دابەزی و دانەبەزیو.

٨. ئەو كەسەی لەماڵ وسامان خەرج نەكات تەنها لەڕێگەی لەخۆگرتنەوە بێت بەرامبەر بەشتێك وەك مەرج لەگەڵ خودای خۆی دەكات ئەم جۆرە كەسانە چاو چنۆكن بە دەقی فەرموودەی خودای گەورە وپێغەمبەریش ﷺ.

**تێبینی/ کەواتە جیاوازی لە نێوان لەخۆگرتن (النذر) لەگەڵ خێر وچاکە بەماڵ وسامان، ئەوەیە (نەزر) لەخۆگرتن بەمەرجی دەکرێت لەگەڵ خودای گەورە، ئەگەر فلأنە شتی بۆ بکرێت ئینجا لەپاش ئەوەدا نەزرەکە دەکات.**

بەلأم خێرو چاکە یەکسەر دەکرێت ودەبەخشرێت بەهەژاران وبەهیوای ئەوەی خودای گەورە بەلأی لەسەر ئاسان بکات یان کارەکەی بۆ ئاسان وبگونجێنێ، کەواتە زۆر بەکورتی نەزر ناکات مەگەر لەدوای بەدەست هێنانی شتەکە نەبێت، بەلأم خێر وچاکە "الصدقة" دەکرێت پێش ئەوەی کە بەلأکەت لەسەر لابرابێت یان خۆشیەکەت دەست گیر بووبێت.

٩. ئەگەر لەخۆ گرتن بەجێ نەهێنێ تاوانێکی گەورەی کردووە.

١٠. لەخۆگرتن بەمەرجەکانیەوە پێویست و واجبە بەلأم خێرکردن سوننەتە.

١١. ئەگەر بەلەخۆگرتن لەخودا نزیك ببێتەوە وەك ئەوەی فەرزێکت بەجێ هێنابێ کەخۆت لەسەر خۆت فەرز کردووە ئەوا بەخێرکردن لەخودای گەورە نزیك دەبێتە وەك کارێك کە تۆ خۆت بەرەغبەت وحەز وزیادە کردن (النافلة، التطوع، المستحب) سوننەتە لەخودا بەجێهێناوە.

١٢. ئەگەر مرۆڤ لەهەموو تەمەنی بۆی بکرێت هیچ نەزر لەخۆی نەگرێت هیچ تاوانێکی نەکردووە.

١٣. بەلأم خێر کردن بەپێی توانای خۆت هەر کات وساتێك بۆت لوا خێری خۆت بکە.

---

زیادە ڕەوی لە خەرج کردندا ئەوەیە چاك بەکار بهێنی بۆ شتی خراپ . ﴿ سەعید کوڕی باوکی جوبەیر ﴾

# (تحية المسلمين )

عن أبي هريرة رضي الله عنه النبي ﷺ قال : (( خلق الله آدم على صورته طوله ستون ذراعاً ، فلما خلقه قال : أذهب فسلم على أولئك نفر من الملآئكة جلوس فسلم عليهم فاستمع ما يحيونك فإنها تحيتك وتحية ذريتك ، فقال : السلآم عليكم ، فقالوا : السلام عليك ورحمة الله ، فزرادوه : ورحمة الله ، فكل من يدخل الجنة على صورة آدم ، فلم يزل الخلق ينقص بعد حتى الآن )) . ( ١ )

## دەروازەی: **سەلام كردنی موسڵمانان لەیەكتری چۆنە**

عن أبي هريرة رضي الله عنه النبي ﷺ قال :. **لەباوكی هورەیرەوە خودای گەورە لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە** ﷺ **فەرمووی:** (( خلق الله آدم على صورته طوله ستون ذراعاً {**خودای گەورە ئادەمی لەسەر شێوازی دروستی ئادەمیزاد دروست كردبوو تەنها لەدرێژیەكەی نەبێت، كە درێژی یەكەی شەست باڵ بوو**} فلما خلقه قال : أذهب فسلم على أولئك نفر من الملآئكة جلوس **كاتێك دروستی كرد پێی فەرموو: "بڕۆ سەلام لەو چەند كەسانە لەفریشتەكان بكە** فاستمع ما يحيونك فإنها تحيتك وتحية ذريتك ، **لەپاشاندا جوان گوێ بیست بە كە ئەوان بە چ سەلام لە تۆ دەكەن، ئەوە سەلامی تۆ ونەوەكانی تۆیە** فقال : السلآم عليكم **بۆیە ئادەم وتی سەلامی خوداتان لەسەر بێت.** فقالوا : السلام عليك ورحمة الله ، فزرادوه : ورحمة الله ، **ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: سەلامی خودای گەورە ومیهرەبانیەكەیشی لەتۆ بێ ئەی ئادەم، فریشتەكان میهرەبانی خودایان بۆ سەلامەكەی ئادەم زیاد كرد** ، فكل من يدخل الجنة على صورة آدم ، **بۆیە هەر كەس كەدەچێتە ناو بەهەشتەوە لەسەر شێوازی ئادەم دەچێتە بەهەشتەوە** فلم يزل الخلق ينقص بعد حتى الآن )) **بۆیە دروست بوونی نەوەكانی ئادەم هەر**

---

( ١ )أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٣٣٢٦ ، ٦٢٢٧ ) وفي الأدب المفرد برقم ( ٩٧٨ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٨٤١ ) ( ٢٨ ) وأحمد في المسند برقم ( ٨١٧١ ) وعبد الرزاق في المصنف برقم ( ١٩٤٣٥ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦١٦٢ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ٣٢٩٨ ) من طريق عبد الرزاق عن معمر عن همام بن منبه عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه الترمذي في سننه برقم ( ٣٣٦٨ ) والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ( ٢١٨ ، ٢٢٠ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦١٦٧ ) والحاكم في المستدرك ( ٦٤/١ ) من طريق الحارث بن أبي ذباب عن سعيد بن أبي سعيد المقبري عن أبي هريرة رضي الله عنه به

لەکەمبوونەوەدا بوون هەتا ئێستا}

## لێکدانەوەی زاناکان

## باب تحية المسلمين

(على صورته) مەبەست بە شێوازی ئادەمە کە لەکاتی سەرەتای دروستبونی بە تەواوی دروست بوو شەست باڵ بوو، بە پێچەوانەی خەڵکی کە بە کاتە جیاجیاکاندا تێپەڕ بوون ودەبن لە پشتی پیاو ئینجا لەناو ڕەحم ولە خوین وگۆشت ولینجا و گۆرپەیی و منداڵی ئینجا گەنجی وتەواوی ئینجا پیری...

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژکاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. پیرۆزی ئادەم کەخودای گەورە بەدەستە موبارەکەکانی خۆی دروستی کرد.

٢. ئادەم بێ دایك وباوك دروست بووە.

٣. تەمەنی ناو ڕەحم وکۆرپەیی ومنداڵی وموراهیقی نەدیووە.

٤. بڵندی وبەرزی ئادەم شەست باڵ بووە کەنزیکەی سی مەتر دەکات.

٥. بەڵام شێوازی دروست بوونی ئادەم لەگەڵ نەوەکانی هیچ جیاوازیان نیە ونەبووە، مەگەر لە بڵندی نەبێت کە ئادەم بریتی بوو لەشەست باڵ، مناڵەکانی بەهەمان شێوە بوون، بەڵام لە دوواتر بە تێپەڕ بوونی کات وساتەکان بڵندی وبەرزی مرۆڤ لە کورتی دا هەتا گەیشتووەتە ئەم شێوازەی ئەم ڕۆمان.

٦. کاتێك ئادەم دروست بووە خودای گەورە یەکسەر وبەبێ نێوان قسەی لەگەڵ دەکرد.

٧. فەرمانی ئەوەی پێدا کە بچێت فێری سەلام کردن بێت لە فریشتەکان.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەم چەند وانەیەی لێ وەردەگرین:

**وانەی یەکەم:** فێر بوونی زانستەکان بەهۆی مامۆستایەتیەوە.

**وانەی دووەم:** مرۆڤ هەردەم پێویستی بەسوود وەرگرتن لەیەکتری هەیە.

**وانەی سێیەم:** ئەو کەسەی کە پیرۆز وباشە لەخەڵکانی تر مەرج نیە لە ئەوانیش شارەزاتر بێت لەهەموو شتێکدا.

**وانەی چوارەم:** شەرم نەبێتە ئاستەنگ بۆ فێر بوون.

**وانەی پێنجەم:** خۆ بەگەورە زانین نەبێـتە هۆی ئەوەی کە فێری شتەکان نەبین.

**وانەی شەشەم:** بەفێربو ون ئێمە دەگەینە ئەو ئاستەی کە خودامان لێی ڕازی بێت.

**وانەی حەوتەم:** بەفێر بوون دەتوانین لەیەکتر تێ بگەین.

٨_ فریشتەکانیش کۆڕو کۆمەڵی دانیشتنیان هەیە، بەڵام تەنها لە عیبادەت وخودا پەرستی ولەخودا نزیك بوونەوەو گەیاندنی سوودێك لە سوودەکانی بە دروست کراوانی خودای گەورە بە فەرمانی خودای گەورە.

٩) سەلام کردنی فریشتەکانیش هەمان سەلام کردنی ناو ئێمەیە.

10) کەسێك قسەت لەگەڵ دەکات گوێ بیست بیت لە پاشاندا وەڵامی پێویستە بەزیاتر بدەیتەوە، ﴿ {وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْبِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا {٨٦{.﴾.سورة النساء الاية

11) ئەگەر کەم وکوڕی هەبوو لە ووتە یان هەڵسووکەوت بەهێواشی وهێمنی ولەسەر خۆیی لە کەم وکورتی یەکەی ئاگادار بکەرەوە.

١٢) سەلام کردنی سەرجەم پێغەمبەران ﷺ وسەرجەم شوێن کەوتوانی هەمان سەلام کردنە کە خودای گەورە بە ئێمەی نەتەوەی ئیسلام هەڵبژاردووە.

١٣-)پێویستە ئێمە لەکاتی بە یەك گەیشتنمان بڵێن (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته).
ئینجا لە پاشتر بۆت هەیە بڵێت ئەم کاتەت چاك یان باش.

١٤-) لە جیابوونەوەش هەر هەمان ووشە دەڵێینەوە (السلام عليكم ورحمه الله وبركاته).

)-15 لە چوونە ناو بەهەشت هەریەك لە باوەڕداران لەسەر شێواز و وێنەی باوکمان ئادەمە واتە بەدرێژی شەست باڵدەچێتە بەهەشتەوە.

١٦-) ئەم فەرموودەیە پەرچ دانەوەی ئەو بیرۆکە درۆزنانەیە کە ئەڵێت مرۆڤ لە مەیموون وهەندێك گیان لەبەریتر دروست بووە نابێت بەهیچ شێوەیەك سووکایەتی بە مرۆڤ بکرێت کە بەڕێزترین دروست کراوانی خودایە ببرێتە ئاست دڕندە وئاژەڵەکانی تر.

**١٧-) ئەم بیرۆکەیە پێچەوانەی هەموو پەیامەکانی پێغەمبەرانە ﷺ.**

**18) ئاشکرا دیارە خودای گەورە بەدەستی خۆی ئادەمی دروست کردووە لەسەر شێوازی ئەمڕۆی مرۆڤەکان تەنها لە بڵندی جیاوازیان هەیە.**

**١٩-) بۆ جارێکیتر مرۆڤ بالأکەی بەرز وبڵند دەبێتەوە کاتێك دەچنە بەهەشتەوە.**

---

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (٨٥) ( ان الله اذا احب قوما ابتلاهم فمن رض فله الرضا ومن سخط فله السخط)[١] واتە : خودا ئەگەر کەسانێکی خۆش بوێ تاقیان دەکاتەوە هەر کەس رازی بێ بەویستی خودا، خوداش لەئەو رازی دەبێ، هەرکەسێ بەشی خودای پێ باش نەبێ خوداش لەوڕازی نابێ.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (٨٦): ( اشد الناس بلاء الانبیاء، ثم الامثل فالامثل ، یبتلی الرجل علی قدره دینه فان كان في دینه صلابة اشتد بلاؤه، وان كان في دینه رقة ابتلی علی قدره دینه فما یبرح البلاء بالعبد حتی یترکه یمشی علی الارض وما علیه من خطیئة)[١]. واتە : ( لەهەموو کەس زیاتر کە تووشی بەلا دەبن پێغەمبەرانن (درودی خوایان لەسەر بێت) ، لەپاش هەر کەس وەك ئەوان، ئینجا هەر کەس وەك ئەوان بن ، مرۆڤ هەریەك بەپێی باوەڕەکەی تاقی دەکرێتەوە .

ئەگەر لەناو ئایینەکەی توندو تۆڵ بێت ئەوا تاقی کردنەوە توندو گەورە دەبێ .

بەلأم ئەگەر باوەڕت زۆر بەهێز نەبێ نەرم و لازاو بێت بەپێی ئەم نەرم و لاوازییەی خۆی تاقی دەکرێتەوە، بەلا دەرفەت بەمرۆڤ ناداو کۆڵی لێ نادا هەتا کاتێ بەجێی دەهێڵێ ئەومرۆڤە بەسەر زەویدا دەڕوات هیچ گوناهی نەماوەو خاوێن و باوێن دەبێتەوە لەگوناهەکان).

- **هەموو کارەکانت دەگەڕێتەوە بۆ رەوشتت دەروونی خۆت راست بکەرەوە بەڕەوشت مرۆڤ ڕاست دەبێتەوە .** **﴿ ئەحمد شوقی ﴾**

## ( سؤال اليهود رسول الله ﷺ )

عن ثوبان مولى رسول الله ﷺ قال :كنت قائماً عند رسول الله ﷺ فجاء حبر من أحبار اليهود فقال : السلام عايك يا محمد فدفعتهُ دفعة كاد يصرع منها : فقال لم تدفعني فقلت : ألأتقول يا رسول الله ﷺ (( إن اسمي محمدٌ الذي سماني به أهلي )) فقال اليهودي : جئت أسألك ، له رسول الله ﷺ : (( أينفك شيء لإن حدثتك )) قال : أسمع بأذني ، فنكت رسول الله ﷺ بعودٍ معه فقال : (( سل فقال اليودي : أين يكون الناس يوم تبدل الأرض غير الأرض والسماوات ؟ فقال رسول الله ﷺ : (( هم في الظلمة دون الجسر )) قال : فمن أول الناس إجازة ؟ قال : (( فقراء المهاجرين )) قال اليهودي : فما تحفتهم (١) حين يدخلون الجنة ؟ قال : (( زيادة كبد النون )) (٢) قال : فما غذاؤهم على إثرها قال : (( ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها )) قال : فما شرابهم علية ؟ قال : من عين فيها تسمى سلسبيلا )) قال : صدقت .وقال : جئت أسألك عن شيء لا يعلمه أحدٌ من أهل الأرض إلا نبيٌ أو رجل أو رجلان قال : (( ينفعك إن حدثتك ؟ )) قال : أسمع بأذني . قال : جئت أسألك عن الولد ؟ قال . (( مء الرجل أبيض ، وماء المرأة أصفر فإذا اجتمعا فعلا منيً الرجل منيً المرأة أذكر يأذن الله وإذا علاّ منيُ المرأة منيً الرجل آنثا بإذن الله )) قال اليهودي : لقد صدقت وإنك النبي ثم انصرف فذهب ، فقال رسول الله ﷺ (( لقد سألني هذا عن الذي سألني عنه وما لي علمٌ بشيء منه حتى أتاني الله به )) . فقال اليودي : أين يكون الناس يوم تبدل الأرض غير الأرض والسماوات ؟ فقال رسول الله ﷺ : (( هم في الظلمة دون الجسر )) قال : فمن أول الناس إجازة ؟ قال : (( فقراء المهاجرين )) قال اليهودي : فما تحفتهم حين يدخلون الجنة ؟ قال : (( زيادة كبد النون )) قال : فما غذاؤهم على إثرها قال : (( ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها )) قال : فما شرابهم عليه ؟ قال : من عين فيها تسمى سلسبيلا )) قال : صدقت .وقال : جئت أسألك عن شيء لا يعلمه أحدٌ من أهل الأرض إلا نبيٌ أو رجل أو رجلان قال : (( ينفعك إن حدثتك ؟ )) قال : أسمع بأذني . قال : جئت أسألك عن الولد ؟ قال . (( ماء الرجل أبيض ، وماء المرأة أصفر فإذا اجتمعا فعلا منيً الرجل منيً المرأة أذكر يأذن الله وإذا علاّ منيُ المرأة منيً الرجل آنثا بإذن الله )) قال اليهودي : لقد صدقت وإنك النبي ثم انصرف فذهب ، فقال رسول الله ﷺ (( لقد سألني هذا عن الذي سألني عنه وما لي علمٌ بشيء منه حتى أتاني الله به )) . ( ١ )

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ٣١٥ ) من طريق الحسن بن علي الحلواني عن الربيع بن نافع عن معاوية بن سلام عن زيد عن أبي سلام عن أبي أسماء الرحبي عن ثوبان رضي الله عنه به .

## دەروازەی: شارەزایی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو زانستانەی کە لای جووەکان هەیە بە هۆی نیگای خوداوەیە

عن ثوبان مولى رسول الله ﷺ قال لە ئە وبانی خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ ڕەزای خودای لێبێت، وتی، كنت قائماً عند رسول الله ﷺ فجاء حبر من أحبار اليهود فقال : السلام عايك يا محمد من ڕاوەستا بووم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ زانایەك لە زاناكانی جوولەكەكان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: سەلامی خودات لێبێ ئەی محەمەد، فدفعةً كاد يصرع منها : لم تدفعني فقلت : ألن تقول يا رسول الله ﷺ ئە وبان دەڵێت من پاڵێکم پێوەنا خەریك بوو بكەوێت بەهۆی ئەو پاڵ پێوەنانەی منەوە بۆ ئەو بۆیە كابرای زانای جوولەكە وتی: بۆچی پاڵم پێوە دەنێیت، منیش وتم: ئەی بۆچی تۆ ناڵێیت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها دەڵێیت ئەی (محەمەد)،(( فقال الرجل اليهودى انا ندعوه باسمه الذى سماه اهله به))كابرای زانای جوولەكە وتی: ئێمە بەو ناوە بانگی لێوە دەكەین كە خزمان ودایك وباوكی ناویان لێناوە،فقال ﷺ (( إن اسمي محمدٌ الذي سماني به أهلي )) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناوی من محەمەدە، وكەسانم ئەو ناوەیان لێناوم، كابرای زانای جوولەكەكە وتی: هاتووم پرسیارت لێدەكەم فقال اليهودي : جئت أسألك ، فقال لـه رسول الله ﷺ : (( أينفعك شيء لإن حدثتك )) قال : أسمع بأذني ، فنكت رسول الله ﷺ بعودٍ معه فقال ﷺ سل فقال لـه رسول الله ﷺ : (( أينفعك شيء لإن حدثتك )) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هیچ سوودێك بەتۆ دەگات كە بۆت باس بكەم، قال : أسمع بأذني ،كابرای زانای جوولەكە وتی: من دەبیستم لێت بە گوێیەكانم.

فنكت رسول الله ﷺ بعودٍ معه فقال ﷺ سل پێغەمبەر ﷺ بەدارێك كە بەدەستیەوە بوو لە زەویدا هێنا وهێڵی پێكێشا ولەپاشاندا فەرمووی پرسیاری خۆت بكە، فقال اليودي : أين يكون الناس يوم تبدل الأرض غير الأرض والسماوات ؟ فقال رسول الله ﷺ : (( هم في الظلمة دون الجسر )) قال : فمن أول الناس إجازة ؟ قال : (( فقراء المهاجرين )) قال اليهودي : فما تحفتهم حين يدخلون الجنة ؟

قال : (( زيادة كبد النون )) قال : فما غذاؤهم على إثرها قال : (( ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها )) قال : فما شرابهم عليه؟ قال : من عين فيها تسمى سلسبيلاً )) قال : صدقت .

**كابرای زانا جوولەكەكە وتی: هاتووم بۆ ئەوەی پرسیارت لێبكەم خەڵكی لە كوێ دەبن كاتێك زەوی وئاسمانەكان دەگۆڕێن؟** فقال رسول الله ﷺ : (( هم في الظلمة دون الجسر )) **پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {ئەوان لە تاریكیدان پێش ئەوەی بگەنە پردی (صراط)** قال : فمن أول الناس إجازة ؟**كابرا وتی: كێن یەكەم كەسانێك كە دەپەڕنەوە؟** قال : (( فقراء المهاجرين )) **فەرمووی: هەژارەكانی كۆچكردووان،** قال اليهودي : فما تحفتهم حين يدخلون الجنة ؟

**كابرای جوولەكە وتی: چیان پێشكەش دەكری لە چوونە ژوورەوەیان؟** قال : (( زيادة كبد النون )) **فەرمووی بەشێكی زیادەیە لە جگەری نەهەنگەكان،** قال : فما غذاؤهم على إثرها **كابرا وتی: ئەی لەپاش ئەوە چی دەخۆن؟** قال : (( ينحر لهم ثور الجنة الذي كان يأكل من أطرافها )) **فەرمووی: گای بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕێت، ئەوەی كە لەم لا وئەولا بەهەشتتدا دەلەوەرا،** قال : فما شرابهم عليه؟ **كابرا وتی: ئەی چ خواردنەوەیەك دەخۆنەوە؟** \ قال : من عين فيها تسمى سلسبيلاً )) .

**فەرمووی لە چاو گەیەك لە بەهەشتدا ناونراوە بەسەل سەبیل،** قال : صدقت **كابرا وتی: ڕاست دەكەیت.**

وقال : جئت أسألك عن شيء لا يعلمه أحدٌ من أهل الأرض إلا نبيٌ أو رجل أو رجلان قال : (( ينفعك إن حدثتك ؟ )) قال : أسمع بأذني . قال : جئت أسألك عن الولد ؟ قال . (( ما ء الرجل أبيض ، وماء المرأة أصفر فإذا اجتمعا فعلا منيُّ الرجل منيَّ المرأة أذكرا بإذن الله وإذا علاّ منيُّ المرأة منيَّ الرجل آنثا بإذن الله )) قال اليهودي : لقد صدقت وإنك النبي ثم انصرف فذهب ، فقال رسول الله ﷺ (( لقد سألني هذا عن الذي سألني عنه وما لي علمٌ بشيء منه حتى أتاني الله به )) .

**كابرا وتی: هاتووم پرسیارێكت لێدەكەم لە شتێك هیچ كەسێك لەخەڵكی ئەم زەویە نایزانی مەگەر پێغەمبەر بێت یان كەسێك یان دوو كەس وەڵامی ئەم پرسیارە دەزانن،** قال : (( ينفعك إن حدثتك ؟ )) **پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر پێم وتی هیچ سوودێك بەتۆ دەگات؟** قال : أسمع بأذني **كابرا وتی: من تەنها گۆی بیست دەبم،** قال :

جئت أسألك عن الولد ؟ كابرا وتی: هاتووم پرسیاری منداڵت لێدەکەم کە چۆن دەبێتە کوڕ یان کچ دەبێت؟؟ قال . (( ماء الرجل أبيض ، وماء المرأة أصفر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئاوی (تۆوی) پیاو سپییە، ئاوی (تۆوی) ئافرەت زەردە فإذا اجتمعا فعلا منيّ الرجل منيَّ المرأة أذكرا بإذن الله ئەگەر کۆ بوونەوە ئاوی پیاوەکە زاڵ بوو ئەوا منداڵی کوڕیان دەبێت بە ئیزنی خودای گەورە، وإذا علاّ منيُّ المرأة منيَّ الرجل آنثا بإذن الله )) ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی تۆوی پیاوەکەدا ئەوا منداڵی کچیان دەبێت بە ئیزنی خودای گەورە، قال اليهودي : لقد صدقت وإنك النبي ثم انصرف فذهب کابرای جوولەکە وتی: ڕاست دەکەیت، بەڕاستی تۆ پێغەمبەری ﷺ لەپاشاندا پشتی هەڵ کردوو ڕۆیشت، فقال رسول الله ﷺ (( لقد سألني هذا عن الذي سألني عنه وما لي علمٌ بشيء منه حتى أتاني الله به )) . پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم کابرایە ئەو پرسیارەی لێ کردم هیچ شتێکم لە وبارەیەوە نەدەزانی هەتا خودای گەورە ئەم هەواڵەی پێدام بۆ ئەو پرسیارانە.

## لێکدانەوەی زاناکان

## باب سؤال اليهود لرسول الله ﷺ

(فنكت رسول الله ﷺ بعود) پێغەمبەر ﷺ بەو دارەی بە دەستیەوە بوو هێڵێکی ڕاکێشا، شوێنەواری دارەکە لەسەر زەوی بەجێما، ئەمەش کارێکە مرۆڤ پێی هەڵدەستێ کاتێك بیر بکاتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە بۆ دروستیەتی ئەم جۆرە کارە، هیچ لە مروئەتی پیاو کەم ناکاتەوە بەڵکو لەسەر دەمی ئەمڕۆی زانستیدا ئەوە سەلمێنراوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی مێشك تواناکانی لەبەر کردن وتەرکیز کردنی زۆر زیاتر بێت، بگەڕێوە بۆ پەرتووکی (عطا برکات، کیف نربي اولادنا).

(زيادة كبد النون) تەنها بۆ ئەو کاتە نەك لە هەموو کاتێکدا هەر ئەوە خواردنیان بێت بەڵکو لە هەموو جۆرە خۆشیەکانی خواردنیان هەیە ﴿فيها ماتشتهيه الانفس﴾ سورە الایە ﴿من عين فيهاتسمى سلسبيل﴾ زمانەوان و ڕاڤیاران دەڵێن (السلسبيل) ناوە بۆ چاوگەی ئاوەکە.

(منیش دەڵێم ) لە فەرموودەکە ئاشکرایە کە ئاوە بۆ چاوگەی ئاوەکەی لە پێشکەشیدا دەکرێت.

موجاهید وبێجگە لەویش دەڵێن: ئەو ئاوە زۆر بەخێرایی دەچێتە خوارێ واتە بەتە وچێژ وشرینە، هەندێکی تر دەڵێن نەرم وڕەوانە، منیش دەڵێم ئەمانە هەموو سیفەتی ئەو ئاوەیە.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی هاوەڵانی کە چەندەها کەس خۆی یەکلای کردووەتەوە بۆ خزمەتکردنی پێغەمبەر ﷺ بە ئەرکێکی پیرۆز وپەرستنێکی گەورەیان لە پێنووس دەدا.

٢. ئەم خزمەتکارەی پێغەمبەر ﷺ لە خزمەت پێغەمبەر دا ﷺ ڕاوەستا بوو بۆ بەرەڤانی وبەرگری لە پێغەمبەر ﷺ لە دوژمنانی پەیامی خودای گەورە.

٣. ئەنانەت بەرگری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد لە کەسانی تر ئەگەر لە ووتەکانیان هەستێك بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەوەی تیادا بووایە کە ڕێزی پێغەمبەر ﷺ بە پێی پێویست نەگرتبێ.

٤. کابرا ی جوولە کە وتی: (ئەی محەممەد) بۆیە خزمەتکارەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆری لەسەر دڵ گران بوو بۆچی ناڵێت ئەی پێغەمبەری ﷺ بۆیە ئەمەی پێ هەڵ نەگیرا وپێی پەسەند نەبوو یەکسەر پاڵی بە کابرای جوولەکەوە نا خەریك بوو بکەوێت بەهۆی ئەو پاڵ نانەوە، کابرا وتی بۆچی بەو شێوەیە پاڵم پێوەدەنێیت خزمەتکارەکە وتی: ئەی تۆ بۆچی ناڵێیت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، کابرا وتی: چونکە ئێمە بەو ناوەی بانگ لێوە دەکەین کە خزمانی ناویان لێیان ناوە.

٥. پێغەمبەر ﷺ لە پاڵ پێوە نانی خزمەتکارەکەی بۆ کابرای جوولەکەکە بێ دەنگ بوو، چونکە ئەو بۆ بەرگری کردنی لە پێغەمبەر ﷺ بەکاری پێویست وشیاوی خۆی هەستاوە.

٦. سینەی پێغەمبەر ﷺ فراوان بوو کە کابرای جوولەکەکە پێی وت ئەی "موحەممەد" لە پاشاندا فەرمووی من خزمانم ناویان لێناوم "موحەممەد" وەك پاسا وهێوانەوەیەك بۆ کابرای جولەکە کە بەو ناوە بانگی لە پێغەمبەر ﷺ کرد.

٧. کابرا بۆ پرسیار کردن هاتبوو تا بزانێت پێغەمبەر ﷺ چ زانستێکی پێغەمبەرانەی لەلا هەیە.

٨. کابرا خۆی لە ئایینەکانی جوولەکە زۆر زانا بوو.

٩. پێغەمبەر ﷺ هەر کەسەو بەپێی هۆش وعەقڵی خۆی قسەی لەگەڵ دەکرد وهەڵسووکەتی لێ قبووڵ دەکرد.

١٠. مرۆڤ پرسیارێ بکات سوودی بۆی هەبێت.

١١. زانست بەخشین بەمەرج نەگیرێت.

١٢. تەنانەت ئەگەر بزانێت کابرا نیازی دونیایی هەیە بۆ فێربوونی زانست ئەم هۆکارە نابێتە هۆی ئەوەی زانستی لێ بگیرێتەوە.

١٣. مرۆڤ وا چاکترە شتێکی بەدەستەوە بێت وەك پێنووس یان ڕاستە یان هەر شتێکی تر بۆ وانە لێکدانەوە، یان بۆ هەر شتێکیتر سوودی لێ وەربگرێت.

١٤. کابرا پرسیاری ڕۆژی قیامەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، چونکە ئەم جۆرە پرسیارە تەنها زانست ئەبێت لەلای خوداوە دابەزیبێت هیچ کەس بۆی نیە بە هەومنتە(گۆترە) قسەی لەسەر بکات.

١٥. خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت دا کاتێك زەوی وئاسمان دەگۆڕێن وتیا دەچن لە جێگەیەکی تاریکیدا هەموو خەڵکی لە ئادەمەوە هەتا دواین مرۆڤ کۆ دەکرێنەوە پێش ئەوەی بگەنە پردی سەر پشتی دۆزەخ.

١٦. پرسیاری دووەمی ئەوە بوو کێن یەکەم کەسانێك کە لەسەر پردی دۆزەخ دەپەڕنەوە، لە وەڵامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەژارەکانی کۆچکردووان بۆ ڕێگەی خودای گەورە.

١٧. ئەم زانستە وزانینە لە تەوڕاتە ڕاستەکەدا بەهەمان شێوە باس کراوە.

١٨. پرسیاری سێیەمی جولەکەکە ئەوە بوو کاتێك خەڵکی دەچنە بەهەشت بە دیارییەك پێشوازیان لێ دەکرێت و پێشکەشیان دەکرێت. لەوەڵامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پارچە جگەرێکی زیادەی نەهەنگ.

١٩. پرسیاری چوارەمی جوولەکەکە ئەوە بوو ئەی لە پاش زیادەی جگەری نەهەنگ کە پێش کەش بەهەشتیەکان دەکرێت چ خواردنێکیان دەدرێتێ بۆ خواردن، لەوەڵامـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((گای بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕدرێت ئەو گایەی کە لە لەوەڕگاکانی بەهەشت گژو گیای دەخوارد.

٢٠. پرسیاری پێنجەمی جوولەکەکە ئەوەبوو ئەی خواردنەوەیان چ دەبێ؟ لەوەڵامـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی لە چاوگەیەکە ناو نراوە سەل سەبیل، کابرای جوولەکە لە دوای ئەم هەموو پرسیارە وتی تۆ ڕاست دەکەی.

٢١. پرسیاری شەشەمی کابرای زانای جوولە ئەو پرسیارە بوو کە هیچ کەسێك لە ڕووی ئەم زەویەدا وەڵامی ئەو پرسیارە نازانێ مەگەر پێغەمبەر ﷺ بێت، یان کەسێك تا دوو کەس وەڵامی ئەو پرسیارە دەزانن.

## لێرەدا چەند سەرنج وتێڕامانێك:

**سەرنجی یەکەم:** ئەم کابرایەی جوولەکە زۆر زانابوو بە ئایینەکەی خۆیان بۆیە دەڵێت هیچ کەس وەڵامی ئەو پرسیارە نازانێت.

**سەرنجی دووەم:** لە پەڕتووکی ئەوانیشدا هەیە کە پێغەمبەرێك دێت وەڵامی ئەو پرسیارە دەزانێت.

**سەرنجی سێیەم:** ئەو کەسانەی ئەم پرسیار و وەڵامەیان لەلایە تەنها دوو کەسن.

**سەرنجی چوارەم:** ئەوان مەبەست بە جولەکەکەیە خۆیان ئەم زانستەیان شاردووتەوە بۆیە دەزانن تەنها پێغەمبەر ﷺ یان دوو کەس هەیە ئەم وەڵامە بزانێت ئەمەش

خۆی لەخۆیدا ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ {٧١}﴾سورة ال عمران الاية ئەوان هەق وڕاستیەکان دەشارنەوە.

**سەرنجی پێنجەم:** خۆیان چاوەڕوانی ئەو پێغەمبەرە بوون.

**سەرنجی شەشەم:** چاك ڕەوشتی ئەو پێغەمبەرەیان دەزانی ودەناسی.

**سەنجی حەوتەم:** دەترسان خەڵکی ئەو ڕاستیە بزانن.

**سەرنجی هەشتەم:** هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ ئەوەی هەق وڕاستیەکان بشارنەوە خەڵك باوەڕ بە محەمەد ﷺ نەهێنین.

**سەنجی نۆیەم:** ئەوان نەفرینیان لێکراوە کاتێك هەق وڕاستی دەزانن ودەیشارنەوە ﴿ {لُعِنَ الَّذِينَكَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ {٧٨}كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ {٧٩}﴾سورة المائدة.الاية

**سەرنجی دەیەم:** خودای گەورە خۆی هەردەم ئایینەکەی خۆی سەر دەخات یا ئەوانیش پێیان ناخۆش بێت، ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّأَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ {٣٢}﴾سورةالتوبة الاية.

**سەرنجی یانزەهەم:** ئەوان بەم کردەوەیان کافر دەبن تەنانەت پێغەمبەرەکەی خۆشیان بەدرۆ دەخەنەوە کە فەرموویەتی ئیمان بەو پێغەمبەرە ﷺ بهێنن کە لەپاش من دێت.

٢٢. ئیمان نەبوون بە پێغەمبەرێك لەنێوان سەرجەم پێغەمبەران ئیمان نەبوونە بەهەموویان ﴿لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ﴾السورة البقرة الاية.

٢٣. بۆت هەیە هەمان پرسیار دووبارە بکەیتەوە بۆ زیاتر دڵنیا بوون لەوەڵامی ڕابووردوو.

٢٤. پرسیارو وەڵامەکەی هیچ کەس نەیدەزانی ئەوە بوو وتی: منداڵ چۆن دەبێت بە کوڕ یان بەکچ؟ واتە لە ناو ڕەحمی دایکیدا پێش بوونی، لەوەڵامدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئاوی تۆوی پیاو سپیە ئاوی تۆی ئافرەت زەردە، کاتێك کۆ دەبنەوە ئەگەر

تۆوی پیاوەکە زاڵ بێت وسەرکەوێ ئەوا ئەو منداڵەی دەیان بێت کوڕ دەبێت بە ئیزنی خودای گەورە. ئەگەر هاتوو تۆوی ئافرەتەکە زاڵ بوو بەسەر تۆوی پیاوەکەدا ئەوا کچیان دەبێت بە ئیزنی خودای گەورە.

٢٥. کەواتە کچ بوون تاوانی ئافرەت نیە بەڵکو تاوانی پیاوەکەیە کە تۆوەکەی لاوازە بۆیە تۆوی ئافرەتەکە زاڵ دەبێت.

٢٦. کابرا گەواهی وشاهێدی دا کە پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەرە وڕاستە لە پاشاندا کابرا پشتی هەڵکردوو ڕۆیشت.

٢٧. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی من هیچ زانستێکم دەربارەی ئەو پرسیارانە نەبوو، هەتا خودای گەورە خۆی نیگای بۆ ناردم لەلای خۆیەوە ئەم شتانەی فێر کردم.

٢٨. خودای گەورە هەرگیز پێغەمبەرەکەی فەرامۆش ناکات کە پرسیارێکی لێبکرێت وفریای نەکەوێت ووەڵامی بۆ نەنێرێت، ئەمەش ئەو ڕاستیەیە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى {٣}﴾ الضحى: واتە: خودای گەورە فەرامۆش وبێ ئومێدت ناکات.

٢٩. بەهەمان شێوە باوەڕدارانیش ئەگەر شوێن کەوتەی ڕاستی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بن ئەوا خودای گەورە خۆی پارێزگاریان لێ دەکات ﴿{٣٧} إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ {٣٨}﴾السورة الحج الاية .

٣٠. بەهەمان شێوە خودای گەورە سۆز وپەیمانی پاراستنی ئاینەکەی داوە کە دەفەرمووێت:﴿ {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ {٩}﴾السورةالحجر الاية واتە ئێمە خۆمان قورئانمان ناردووە وهەر ئێمە خۆمان ئەم قورئانەش دەپارێزین.

---

١. سەخی ترین مرۆ ئەوکەسەیە کە بەخشین بدات بەکەسێك لێ ی بگرنەوە ؛ لەسەر خۆترین ولێ بووردەترین کەس ئەوەیە لێخۆش بوونی بەرامبەر کەسێك هەبێت ستەمی لێ کردبێت . ﴿ ئیمامی عومەر ﴾

٢. زانستەکان فێربن، بۆ زانستیش هێمنی و لەسەر خۆیی فێربن.﴿ئیمام عومەر﴾

## ( صلاة النبي ﷺ بوادي العقيق)

عن ابن عباس رضي الله عنهما يقول : إنه سمع عمر رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول :(( أتاني الليلة آت من ربي فقال : صل في هذا الواد المبارك وقل : عمرة في حجة )) . ( ١ )

**دەروازە: نوێژی پێغەمبەر ﷺ لە شیوو دۆڵی عەقیقدا بە فەرمانی خودایە لە پیرۆزی ئەو شوێنەیە**

عن ابن عباس رضي الله عنهما يقول : إنه سمع عمر رضي الله عنه قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول :(( أتاني الليلة آت من ربي فقال : صل في هذا الواد المبارك وقل : عمرة في حجة )) .

**لەکوڕی عەبباسەوە ڕەزای خودایان لێبێت دەڵێت، گوێی لێبوو عومەری کوڕی خەتتاب بووە کە وتی گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، :(( أتاني الليلة آت من ربي ئەم شەو نێردراوێکم هاتە لا لەلای خودای خۆمەوە فەرمووی، فقال : صل في هذا الواد المبارك { نوێژ بکە لەو شیو ودۆڵەی کە پیرۆز وڕێز لێنراوە وقل : عمرة في حجة ))**

---

## لێکدانەوەی فەرمموودەکان

## باب: صلاة النبي ﷺ بوادي العقيق

**(العقيق) شوێنێکە لە دەرەوەی شاری مەدینە .**

---

( ١ )أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ١٥٣٤ ) وأحمد في المسند برقم ( ١٦١ ) وابن ماجه في سننه برقم ( ٢٩٧٦ ) حبان في صحيحه برقم ( ٣٧٩٠ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ١٨٨٣ ) والحميدي في مسنده برقم ( ١٩ ) من طريق الوليد بن مسلم عن الأوزاعي عن يحيى بن أبي كثير عن عكرمة عن ابن عباس رضي الله عنهما به .وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٢٣٣٧ ) وأبو داود في سننه برقم ( ١٨٠٠ ) وابن خزيمة في صحيحه برقم ( ٢٦١٧ ) والبيهقي في سننه ( ١٤/٥ ) ةالبزار في مسنده برقم ( ٢٠١ ) من طرق عن الآوزاعي به .وأخرجه البخارى في صحيحه في صحيحه برقم ( ٧٣٤٣ ) وعبد بن حميد في المنتخب برقم ( ١٦ ) والبيهقي في سننه ( ١٣/٥ ) والبزار في مسنده برقم ( ٢٠٢ ) من طريق علي بن المبارك عن يحيى بن أبي كثير به .

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئیعتیزانی كردووە وعومرە وحەجی بەیەكەوە ﷺ كردوە، مەبەست پێی نوێژی دەست پێكی ئیحرامە.

٢. هەندێك شوێن پیرۆزە لەوانە ئەو وادی عەقیقە.

٣. پیرۆزی ئەوەیە خودای گەورە خۆی دیاری بكات نەك ئێمە بە پیرۆزی بزانین.

٤. هاوەڵان چۆن لە یەكتر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرن ودەگێڕنەوە بەو شێوەیە فەرموودەكانی ئیسلام بە ئێمە گەیشتووە وهیچ شتێك نەبیستراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگەر بە ئێمە نەگەیشتبێ.

٥. بەهەمان شێوە هەر شتێك كەخودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ دا بێت ئەویش بە ئێمەی گەیاندووە.

٦. نابێت زانستێك بزانین چاو چنۆك بین وبەخەڵكی نەبەخشین.

٧. نێردراو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خوداوە بریتی لە فریشتە.

٨. فێربوونی قوتابی ومامۆستایی دەگەیەنێ.

٩. فەرمانی خودای گەورەن بە پێغەمبەر ﷺ گەیاندووە.

١٠. ئەو شوێنە موبارەكە وخودای گەورە ڕێزی لێناوە ئەگەر تۆ ڕێزی لێ بنێی فەرمانی خودا وپێغەمبەرت ﷺ بەجێهێناوە، بەڵام ئەگەر بە شكۆداری ڕاینەگریت ئەوا هەر خۆت زەرەرمەندی دوا ڕۆژ دەبێت.

١١. تێكەڵ كردنی عومرە لەگەڵ حەجدا خێری زیاترە لەوەی كەتەنها عومرە بكرێت یان حەج بكرێت ئەمەش پێی دەڵێن: "تمتع" لە حەجدا.

## ( ذكر نبي الله يونس عليه السلام )

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال :- يعني الله تبارك وتعالى : (( لا ينبغي لعبدٍ لي أن يقول : أنا خير من يونس بن متى عليه السلام )) . ( ١ )

### دەروازە: باسكردنی ئیووب پێغەمبەر ﷺ لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ

**لە باوكی هورەیرەوە خودای لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: مەبەست ئەوەیە خودای گەورە فەرموویەتی: (( لا ينبغي لعبدٍ لي أن يقول : {نابێت هیچ كەسێك لە بەندەكان بڵێت، نابێت هیچ كەسێك لە بەندەكان بڵێت، أنا خير من يونس بن متى عليه السلام )) . من چاكترم لە یونسی كوڕی مەتتا سەلامی خودای لەسەر بێت}.**

### لێكدانەوەی زاناكان

**(يونس بن متى) هەندێ لە زاناكان دەڵێن متى ناوی دایكیەتی وتەنها ئەو وعیسا ﷺ بەناوی دایكیانەوە ناسراوون، بەڵام لە ڕاستیدا مەتا ناوی باوكێیتی، كابرایكی لەخودا ترس بووە لە بنەماڵەی پێغەمبەران بووە، بێ منداڵ دەبێت بۆیە دەچێتە ئەو جێگەیەی كە ئەیوب خۆی لێ دەشۆرێ، لە كاتی نەخۆشیەكەیدا ئەمە بۆچوونی هەندیكە لە زانایەكان، مەتا بەخۆی وخێزانەكەی خۆی دەشوات ودەپاڕێنەوە وخودای گەورە منداڵێكیان بداتێ ببێتە پێغەمبەر بۆ نەتەوەی ئیسرائیل.**

---

( ١ )أخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ٢٣٧٦ ) واللفظ له ، وابن أبي شيبة في المصنف ( ٥٤٠/١١ ) من طريق محمد بن جعفر عن شعبة عن سعد ابن إبراهيم عن حميد بن عبدالرحمان عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٣٤١٦ ، ٤٦٣١) وأحمد في المسند برقم ( ٩٢٥٥ ، ١٠٠٤٣ ) والطيالسي في مسنده برقم ( ٢٥٣١ ) والطحاوي في شرح مشكل الآثار برقم ( ١٠١٢ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦٢٣٨ ) من طرق عن شعبه به ، من غير تصريح أنه حديث قدسي .ولفظ البخاري أن النبي ﷺ قال : (( لا ينبغي لعبد أن يقول : أنا خير من يونس بن متى )) .

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. پیرۆزی وگەورەیی ڕێزی یونس ﷺ لەلای خودای گەورە.
٢. بۆ ئەوەی هیچ كەسێك گومانی ئەوە نەبات كە یونس ﷺ لاواز بووە كاتێ كە نەتەوەكەی موسڵمان نەبوون.
٣. ئەویش بەشەرە و مرۆڤەو وەك چۆن ئادەم هەڵەی كردوو گەڕایەوە وخودای گەورە گەڕانەكەی لێوەرگرت بەهەمان شێوە یونس گەڕایەوە بۆ لای خودای گەورە وخودایش لێی خۆش بوو.
٤. نرخ وبەهای كاری پێغەمبەران ﷺ لەلای خودای گەورە.
٥. پێویستە ئێمەش پێزان بین بەماندوو بوونی هەوڵ وتێكۆشانی ئەو پێغەمبەرانە ﷺ.
٦. هەر كەسێك ئیمام و پێشەواو بێت زانا بێت چاكسازی كاربێت وداهێنەر بێت هەر ج پلە وپایەیەكی هەبێت هەر لەخوار پلە وپایەی پێغەمبەرایەتیە.
٧. باوەڕ بوون بەگشتی پێغەمبەران ﷺ بە تایبەت ئەوانەیان كە بەڕوونی وئاشكرایی ناویان زانراوە لە قورئان وسوننەتەكاندا... بێجگە لە ئەوانیش.
٨. خودای گەورە بە گەورەیی خۆی لەسەر پێغەمبەر ﷺ یونس بە وەلام دێت.
٩. یونس هەڵبژاردە وخۆشەویستە وڕێزدارە لەلای خودای گەورە بۆیە كردویەتی بە پێغەمبەر ﷺ.
١٠. مرۆڤ بەهەڵەیەك بێجگە لە هاوەڵ پەیدا كردن بۆ خودای گەورە كارە چاك وباشەكانی پووچەڵ نابێتەوە. وەك چۆن بە كافر بوون ودووڕووی كاری مرۆڤ بەتاڵ دەبێتەوە.
١١) لایەنی چاكەی مرۆڤ بزانرێت كاتێك هەڵەیەك دەكات مادەم لە دەربارەی چاكەكانی نوقوم دەبێت.

---

با لە هەموو شتێك پێشتر لەلای تۆ ئەوەبێ لە خودا ترسینت لە كاتی نهێنی تۆ و خودا و لە كاتی ئاشكرات ، سوپاسی خودا بكە ، راست گۆبە لە ووتەو نیازتا،چونكە كردنت خودای گەورە بە هرەكانت بۆ بەردەوام دەكات ، لە خودا ترسین باشترین تۆێشووە.﴿عەبدوڵلای كوری شەداد﴾

## ( قصة موسى مع الخضر عليهما السلام )

عن سعيد بن جبير قال : قلت لابن عباس : أن نوفاً البكالي يزعم أن موسى صاحب الخضر ليس هو موسى بني إسرائيل :إنما هو موسى آخر ،فقال : كذب عدو الله ، حدثنا أبي بن كعب عن النبي ﷺ (( أن موسى قام خطيبا في بني إسرائيل فسئل أي الناس أعلم ؟ فقال : أنا ، فعتب الله عليه إذ لم يرد العلم إليه ، فقال له : بل لي عبدٌ بمجمع البحرين هو أعلم منك قال : أي رب ومن لي به ؟ - وربما قال سفينا : أي رب وكيف لي به – قال : تأخذ حوتاً فتجعله في مكتلٍ حيثمافقدت الحوت فهو ثم- وربما قال : فهو ثمه – وأخذ حوتاً فجعله في مكتلٍ ثم انطلق هو وفتاه يوشع بن نون حتى إذا أتيا الصخرة وضعا رؤوسهما فرقد موسى واضطرب الحوت فخرج فسقط في البحر فاتخذ سبيله في البحر سرباً :الطاق – فانطلقا يمشيان بقية ليلتهما ويومهما حتى إذا كان من الغد قال لفتاه : آتنا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصباً ، ولم يجد موسى النصب حتى جاوز حيث أمره الله ، قال له فتاه : أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت ، وما أنسانيه إلأ الشيطان أن أذكره واتخذ سبيله في البحر عجباً فكان للحوت سرباً ولهما عجباً ، قال له موسى : ذلك ما كنّانبغي فارتدّا على آثارهما قصصاً – رجعا يقصان آثارهما – حتى انتهياإلى الصخرة فإذا رجل مسجى بثوب فسلم موسى فرد عليه فقال : وأني بأرضك السلام قال : أنا موسى ، قال : موسى بني إسرائيل ؟ قال : نعم آتيتك لتعلمني مما علمت رشداً .قال : يا موسى أني على علم من علم لله علمنيه الله لا تعلمه ، وأنت على علمٍ من علم الله علمكه الله لا أعلمه قال : هل أتبعك ؟ قال : إنك لن تستطيع معي صبراً ، وكيف تصبر على ما لم تحط به خبراً ، غلى قوله : إمراً ، فانطلقا يمشيان على ساحل البحر فمرت بهما سفينة كلموهم أن يحملوهم فعرفوا –الخضر – فحملوهم بغير نولٍ ، فلما ركبا في السفينة جاء عصفور فوقع على حرف السفينة فتقر في البحر نقرة أو نقرتين قال له الخضر : يا موسى ما نقص علمك من علم الله إلأ مثل نقص هذا العصفور بمنقارة من البحر ، إذ أخذ الفأس فنزع لوحاً قال : فلم يفجأ موسى إلا وقد قلع لوحاً بالقدوم ، فقال له موسى : ما صنعت ، قوم حملونا بغير نول عمدت إلى سفينتهم فخرقتها لتغرق أهلها لقد جئت شيئاً إمراً ، قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟ قال : لا تؤاخذني بما نسيت ولا ترهقني من أمري عسراً فكانت الأولى من موسى نسياناً .فلما خرجا من البحر مروا بغلام يلعب مع

الصبيان فأخذ الخضر برأسه فقلعه هكذا – وأومأ سفيان بأصابعه كأنه يقطف شيئاً – فقال له موسى : أقتلت نفساً زكية بغير نفس لقد جئت شيئاً نكراً ، قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟ قال : إن سألتك عن شيء بعدها فلا تصاحبني قد بلغت من لدني عذراً .فانطلقا حتى لإذا أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبوا أن يضيفوهما فوجدا فيها جداراً يريد أن ينقض مائلاً – أومأ بيده هكذا وأشار سفيان كأنه يمسح شيئاً إلى فوق فلم أسمع سفيان يذكر (مائلاً) إلا مرة – قال : قوم أتيناهم يطعمونا ولم يضيفونا عمدت إلى حائطهم ، لو شئت لاتخذت عليه أجراً . قال : هذا فراق بيني وبينك بتأويل ما لم تستطع عليه قال النبي ﷺ (( و ددنا أن موسى كان صبر فقص الله علينا من خبرهما )) قال سفيان قال النبي ﷺ ((يرحم الله موسى لو كان صبر يقص الله علبنا من أمرهما ))وقرأ ابن عباس : وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينةٍ صالحةٍ غصباً وأما الغلام فكان كافراً وكان أبواه مؤمنين ، ثم قال لي سفيان : سمعت منه مرتين و حفظته منه ، قيل لسفيان : حفظته قبل أن تسمعه من عمرو أو تحفظه من إنسان ؟ فقال : ممن أتحفظه ، ورواه أحدٌ عن عمر و غيري ؟ سمعته منه مرتين أو ثلاثاً و حفظته منه )). (١)

## دەروازەی: چیرۆكی (موسا )و(خضر) سەلامی خودایان لێبێت

عن سعيد بن جبير قال : قلت لابن عباس : أن نوفاً البكالي يزعم أن موسى صاحب الخضر ليس هو موسى بني إسرائيل :إنما هو موسى آخر ،فقال : كذب عدو الله ، حدثنا أبي بن كعب عن النبي ﷺ **لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: وتم بە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ڕەزای خودایان لێبێ: كە كابرایەك بەناوی نۆڤ ئەل بەكالی یەوە گومانی وایە كە گوایە موسای ﷺ هاوەڵی خضر بریتی نیە لە موسای ﷺ ئەوەی بەنی ئیسرائیل، بەڵكو ئەو موسایە كابرایەكیترە بۆیە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ڕەزای خودای لێبێ وتی ئەو درۆ دەكات ئەو دوژمنی خودایە: ئینجا عەبدوڵڵای كوڕی –**

---

(١ )أخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٣٤٠١ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٣٨٠ ) ( ١٧٠ ) من طريق سفيان بن عيينة عن عمرو بن دينار عن سعيد بن جبير به .وأخرجه البخارى في صحيحه بلأرقام ( ٢٢٦٧ ، ٢٧٢٨ ، ٤٧٢٦ ) وأحمد في المسند برقم ( ٢١١١٩ ) من طريق هشام بن يوسف عن ابن جريج عن يعلى بن مسلم و عمرو بن دينار عن سعيد بن جبير به .وأخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ٢٣٨٠ ) ( ١٧٢ ) والنسائي في سننه الكبرى برقم ( ٥٨٤٤ ) وأحمد في المسند برقم ( ٢١١١٨ ) وعبد ابن حميد في مسنده برقم ( ١٦٩ ) من طريق عبيد الله بن موسى عن إسرائيل عن أبي إسحاق عن سعيد بن جبير به .واخرجه البخاري صحيحه برقم ( ٨٨ ، ٧٤٧٨ ) والنساني ي سننه الكبرى برقم ( ١١٣٠٩ ) وأحمد في المسند برقم ( ٢١١١٠٩ ) من طريق الأوزاعي عن الزهري عن عبيد الله بن عبدالله عن ابن عباس به .

عەبباس وتی: ئوبەی کوڕی کەعب هەواڵ وپێی ڕاگەیاندووین لە پێغەمبەرەوە ﷺ: (( أن موسى قام خطيبا في بني إسرائيل فسئل أي الناس أعلم ؟ فقال : أنا ، فعتب الله عليه إذ لم يرد العلم إليه ، فقال له : بل لي عبدٌ بمجمع البحرين هو أعلم منك قال : أي رب ومن لي به ؟ - وربما قال سفيان : أي رب وكيف لي به – قال : تأخذ حوتاً فتجعله في مكتلٍ حيثمافقدت الحوت فهو ثم- وربما قال : فهو ثمه – وأخذ حوتاً فجعله في مكتلٍ ثم انطلق هو وفتاه يوشع بن نون حتى إذا أتيا الصخرة وضعا رؤوسهما فرقد موسى واضطرب الحوت فخرج فسقط في البحر فاتخذ سبيله في البحر سرباً {موسا هەڵدەستی وتارێك دەخوێنی بۆیە فسئل أي الناس أعلم ؟ پرسیاری ئەوەی لێدەکرێ کێ لەهەموو کەس زاناترە؟ فقال : أنا موساش وتی من زاناترین مرۆڤی سەر زەویم فعتب الله عليه إذ لم يرد العلم إليه بۆیە خودای گەورە ڕەخنەی لێگرت کە نەیووت خودای گەورە لەهەموو کەس زاناترە فقال له : بل لي عبدٌ بمجمع البحرين هو أعلم منك بۆیە خودای گەورە بەموسای ﷺ فەرموو بەڵکو بەندەیەکی من لەتۆ زاناترە لەئاستی گەیشتنەوەی دوو دەریاکەدایە ئەو لە تۆ زاناترە، قال : أي رب ومن لي به ؟ - وربما قال سفينا : أي رب وكيف لي به –موسا وتی: ئەی خودایە کێ من دەگەیەنێتە ئەو کابرایە؟ لەوانەیە سوفیان، "کە کەسێکە لە ڕاوی فەرموودەکە، موسا ﷺ وتی: چۆن من دەگەمە ئەو کابرا زانایە قال : تأخذ حوتاً فتجعله في مكتلٍ حيثمافقدت الحوت فهو ثم- وربما قال : فهو ثمه – خودای گەورە فەرمووی نەهەنگ (ماسیەك) هەڵدەگری لەناو ڤوماشێکی دادەنێیت لەهەرکوێدا ئەو ماسیەت ون کرد، ئەوا ئەو بەندە زانایە دەبینی، وأخذ حوتاً فجعله في مكتلٍ ثم انطلق هو وفتاه يوشع بن نون حتى إذا أتيا الصخرة وضعا رؤوسهما فرقد موسى بۆیە موسا ﷺ نەهەنگەکەی هەڵگرت لەگەڵ خۆی بردی لەپاشاندا دەرچوون ودەستیان بەڕۆیشتن کرد خۆی وئەو ڤتابیەی کە لەگەڵی بوو کەناوی یوشەعی کوڕی نوونە، هەتا گەیشتنە بەردێکی گەورە سەریان لەوێ دانا وموساش خەوی لێکەوتوو واضطرب الحوت فخرج فسقط في البحر فاتخذ سبيله في البحر سرباً خووتەکەش خۆی دزیەوە بۆ ناو دەریاکە وکەوتە دەریاکەوە، ڕێگەی خۆی گرتەبەر، :الطاق – فانطلقا يمشيان بقية ليلتهما ويومهما حتى إذا كان من الغد قال لفتاه : آتنا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصباً ، ولم يجد موسى النصب حتى

جاوز حيث أمره الله ، قال له فتاه : أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت . وما أنسانيه إلاّ الشيطان أن أذكره واتخذ سبيله في البحر عجباً فكان للحوت سرباً ولهما عجباً ، قال له موسى : ذلك ما كنّا نبغي فارتدّا على آثارهما قصصاً – رجعا يقصان آثارهما – حتى انتهياإلى الصخرة فإذا رجل مسجى بثوب فسلم موسى فرد عليه فقال : وأني بأرضك السلام قال : أنا موسى ، قال : موسى بني إسرائيل ؟ قال : نعم آتيتك لتعلمني مما علمت رشداً .

**بۆیه خودا ی گەوره ڕێگەی له نەهەنگەکه کرد کەبەاوەکەدا تێپەڕبێت وەك تاقێ (کەلێن) وتی؛ (وەك ئەم تاقە)** فانطلقا يمشيان بقية ليلتهما ويومهما حتى إذا كان من الغد **موسا ﷺ وهاوەڵەکەی هەر دەڕۆن بە شەو و ڕۆژەکەیەوە هەتا بەیانیەکی تریان لێ هەڵهات،** قال لفتاه : آتنا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصباً ، ولم يجد موسى النصب حتى جاوز حيث أمره الله **موسا بە هاوەڵەکەی وت خواردنەکەمان بهێنە با بیخۆین بەڕاستی زۆر هیلاك وماندوو بووین لەم کاراوانیەماندا، موسا ماندو هیلاك نەبوو هەتا نەگەیشتە ئەو شوێنەی کە خودایب گەورە بۆی دیاری کرد بوو..** قال له فتاه : أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت ، وما أنسانيه إلاّ الشيطان أن أذكره **هاوەڵەکەی بە موسای ﷺ وت؛ ئایا لەبیرتە کاتێ؛ لەلای بەحرەکەدا ئا لەو کاتەدا من ماسیەکەم لەبیر چوو؛ ئەمەش تەنها شەیتان لەبیری منی بردەوە کە بێتەوە بیرم ماسیەکە ڕێگەی خۆی بەرە ودەریاکە گرتە بەر بۆ ئەوانیش بوو بەشتێکی سەرسوڕمان:** واتخذ سبيله في البحر عجباً فكان للحوت سرباً ولهما عجباً **موسا ﷺ بەهاوەڵەکەی فەرموو ئەوە ئەو شتە یە** فارتدّا على آثارهما قصصاً – رجعا يقصان آثارهما – حتى انتهياإلى الصخرة **بۆیە بەشوێنی خۆیانا گەڕانەوە شوێن پێی خۆیان هەڵدەگرتەوە.. هەتا گەیشتنە بەردەکە ئالەوێدا** فإذا رجل مسجى بثوب فسلم موسى فرد عليه فقال : وأني بأرضك السلام **کابرایەکیان دی خۆی داپۆشی بوو بە پارچە قووماشێك بۆیە موسا ﷺ سەلامی لێکرد کابراش وەڵامی موسای دایەوە لە موسای پرسی تۆ کێی لەم زەویەدا سەلام لەمن دەکەیت** قال : أنا موسى ، قال : موسى بني إسرائيل ؟ **لەوەڵامدا وتی؛ من موسام ﷺ، وتی؛ موسای نەوەی ئیسرائیل؟** قال : نعم آتيتك لتعلمني مما علمت رشداً

.موسا ﷺ وتی: بەڵێ، من هاتووم بۆ ئەوەی هەندێك فێری زانستم بكەیت لەوەی كەخودای گەورە ڕێنموویی تۆی لێكردووە.

قال : يا موسى أني على علم من علم لله علمنيه الله لا تعلمه ، وأنت على علم من علم الله علمكه الله لا أعلمه قال : هل أتبعك ؟ قال : إنك لن تستطيع معي صبراً ، وكيف تصبر على ما لم تحط به خبراً ، غلى قوله : إمراً ، فانطلقا يمشيان على ساحل البحر فمرت بهما سفينة كلموهم أن يحملوهم فعرفوا ـالخضر ـ فحملوهم بغير نولٍ ، فلما ركبا في السفينة جاء عصفور فوقع على حرف السفينة فتقر في البحر نقرة أو نقرتين قال له الخضر : يا موسى ما نقص علمك من علم الله إلاَ مثل نقص هذا العصفور بمنقارة من البحر ، إذ أخذ الفأس فنزع لوحاً قال : فلم يفجأ موسى إلا وقد قلع لوحاً بالقدوم ، فقال له موسى : ما صنعت ، قوم حملونا بغير نول عمدت إلى سفينتهم فخرقتها لتغرق أهلها لقد جئت شيئاً إمراً ، قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟ قال : لا تؤاخذني بما نسيت ولا ترهقني من أمري عسراً فكانت الأولى من موسى نسياناً .

قال : يا موسى أنى على علم من علم لله علمنيه الله لا تعلمه خضر: وتی ئەی موسا ﷺ من لەسەر زانستێكم كە خودای گەورە بەمنی داوە ولێی فێر كردووم تۆ نایزانی وأنت على علمٍ من علم الله علمكه الله لا أعلمه تۆیش لەهەندێ ڕووەوە لەسەر زانستێكی كە خودای گەورە بەتۆی داوە وتۆی لێ فێر كردووە من هیچی لێنازانم، قال : هل أتبعك ؟ قال : إنك لن تستكيع معى صبراً ، وكيف تصبر على ما لم تحگ به خبراً ، وتی: شوێنت بكەوم؟ ئەویش وتی: تۆ ئەی موسا ناتوانی وئارام ناگری لەگەڵ مندا ئەی چۆن تۆ ئارام دەگریت كەهیچ هەواڵ وزانستێكت پێ نەبێت هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی كەخودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ {قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَاتُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا {٧٣ {فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا {٧٤{قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا {٧٥ {قَالَ إِنسَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا {76} فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْاأَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا {٧٧ {قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِيوَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ سورەتی كهف.

فانطلقا يمشيان على ساحل البحر فمرت بهما سفينة كلموهم أن يحملوهم فعرفوا ـ الخضر ـ فحملوهم بغير نولٍ ئەوان دوو قۆڵی دەستیان بە ڕۆیشتن كرد بەكەناری دەریاكەدا كەشتی یەك بەلایاندا تێپەڕ دەبێت داوایان لێ دەكەن سواریان بكەن وبیان

پەڕیننەوە کەشتیەوانەکان خضریان ﷺ ناسی بۆیە بێ هیچ بەرامبەرێك هەڵیان گرتن، کاتێك بێ هیچ بەرامبەرێك سواری کەشی یەکە بوون فلما رکبا في السفينة جاء عصفور فوقع على حرف السفينة فتقر في البحر نقرة أو نقرتين قال له الخضر : يا موسى ما نقص علمك من علم الله إلأ مثل نقص هذا العصفور بمنقارة من البحر ، باڵندەیەك هات لەسەر پشتی کەشتیەکە نیشتەوە نوکی لە دەریاکەدا جارێك یان دوو جا قال له الخضر : يا موسى ما نقص علمي و علمك من علم الله إلأ مثل نقص هذا العصفور بمنقارة من البحر "خضر"ﷺ بەموسای ﷺ فەرموو، زانینی من وتۆ بەبەرامبەر زانینی خودای گەورە تەنها وەك کەمکردنەوەی ئەو دەریایەیە بە دەنووکی ئەو باڵندەیە إذ أخذ الفأس فنزع لوحاً قال : فلم يفجأ موسى إلا وقد قلع لوحاً بالقدوم ، ئا لەو کاتەدا تەشۆییەکی هەڵگرت دارێکی لە کەشتیە یەکەی پێ دەرهێنا ئەوەی کە شتێکی سەیر بوو بۆ موسا ﷺ ئەو دارە دەرهێنانە بوو لە کەشتیەکەدا بە تەشوێکە فقال له موسى : ما صنعت ، قوم حملونا بغير نول عمدت إلى سفينتهم فخرقتها لتغرق أهلها لقد جئت شيئاً إمرابۆیە موسا ﷺ پێی وت ئەوە چیت کرد، ئەو خاوەن کەستیە ئێمەی هەڵگرت بەبێ هیچ بەرامبەرێك تۆیش دەڕۆیت کەشتیەکەیان کون دەکەیت بۆ ئەوەی خاوەنەکەی پێی نقوم بێت، بەڕاستی شتێکی ناڕەوات کرد؟؟ قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟

یەکسەر خضر وتی، ئەی ئایا پێم نەوتی تۆ ناتوانی بەئارام بیت لەگەڵ مندا؟ قال : لا تؤاخذني بما نسيت ولا ترهقني من أمري عسراً فكانت الأولى من موسى نسياناً . موسا ﷺ وتی لێم مەگرە لەبیرم چۆوە کەڵێت نەپرسم وتۆ لەسەرم بەزەحمەتی مەخە ئەمەیان لەبیر چوونەوە بوو لە موساوە ﷺ.

فلما خرجا من البحر مروا بغلام يلعب مع الصبيان فأخذ الخضر برأسه فقلعه هكذا ـ وأومأ سفيان بأصابعه كأنه يقطف شيئاً ـ فقال له موسى : أقتلت نفساً زكية بغير نفس لقد جئت شيئاً نكراً ، قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟ قال : إن سألتك عن شيء بعدها فلا تصاحبني قد بلغت من لدني عذراً .

فلما خرجا من البحر مروا بغلام يلعب مع الصبيان فأخذ الخضر برأسه فقلعه هكذا ـ وأومأ سفيان بأصابعه كأنه يقطف شيئاً ـ کاتێك دەرچوون لە دەریاکە تێپەڕ بوون بەلای منداڵێکدا یاری وگەمەی لەگەڵ منداڵاندا دەکرد، خضر ﷺ منداڵەکەی گرت

**وسەری لەلاشەی کردەوە، ئابەم شێوەیە (سوفیان) بەسەر پەنجەکانی ئامازەی کرد وەك ئەوەی بەروو بوومی مێوەجاتەکان لێبکەیتەوە،** فقال لە موسى : أقتلت نفساً زكية بغير نفس لقد جئت شيئاً نكراً ، **موسا ﷺ پێی وت، ئایا دەروونێکی خاوێن وبێ تاوانت کوشت بەبێ ئەوەی هیچ مافی کوشتنی ئەوت هەبێت، بەڕاستی شتێکی زۆر خراپت کرد،** قال : ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبراً ؟ **خضر ﷺ وتی، ئەی ئایا پێم نەوتی تۆ ناتوانی ئارام بگریت؟** قال : إن سألتك عن شيء بعدها فلا تصاحبني قد بلغت من لدني عذراً .

**موسا ﷺ وتی، ئەگەر لەهەر شتێکیتردا پرسیارم لێکردی ئەوا تۆ هاوەڵییم مەکە، بەڕاستی بڕو بیانووم بەرامبەر تۆ نەما.**

(( فانطلقا حتى إذا أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبوا أن يضيفوهما فوجدا فيها جداراً يريد أن ينقض مائلاً – أومأ بيده هكذا وأشار سفيان كأنه يمسح شيئاً إلى فوق فلم أسمع سفيان يذكر (مائلاً) إلا مرة – قال : قوم أتيناهم يطعمونا ولم يضيفونا عمدت إلى حائطهم ، لو شئت لاتخذت عليه أجراً )).

فانطلقا حتى إذا أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبوا أن يضيفوهما **جارێکیتر دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە هەتا گەیشتنە خەڵکانی گوندێك داوای خواردنیان لێکردن، بەڵام ئەوان هیچ مێوانداریان نەکردن** فوجدا فيها جداراً يريد أن ينقض مائلاً – أومأ بيده هكذا وأشار سفيان كأنه يمسح شيئاً إلى فوق فلم أسمع سفيان يذكر (مائلاً) إلا مرة – **هەر لەو کاتەدا دیوارێکیان دی خەریك بوو دەکەوت وخوار ببووەوە، (سوفیان بە دەستی خۆی ئامازەی کرد وەك ئەوەی شتێك بسڕێتەوە بەرە وسەرەوە گوێم لێنەبوو هیچ باسی خواربوونەوە باس بکات، تەنها یەك جار نەبێت)** قال : قوم أتيناهم يطعمونا ولم يضيفونا عمدت إلى حائطهم ، لو شئت لاتخذت عليه أجراً .

**موسا ﷺ وتی، ئێمە چووینە لای کەسانی ئەو گوندە هیچ خواردنێکیان پێنەداین وهیچ مێوانداری ئێمەیان نەکرد، واتۆش دەچیت ئەو دیوارە خوارەی گوندی ئەوان ڕاست دەکەیتەوە ئەگەر حەز بکەیت کرێی لەسەر وەرگرە،** ((قال : هذا فراق بيني وبينك بتأويل ما لم تستطع عليه قال النبي ﷺ (( و ددنا أن موسى كان صبر فقص الله علينا من خبرهما )) قال سفيان قال النبي ﷺ ((يرحم الله موسى لو كان صبر يقص الله علينا من أمرهما ))قال : هذا فراق بيني وبينك بتأويل ما لم تستطع عليه

صبراخضر ﷺ وتی: ئەمە جیاوازی من وتۆیە بەلام هەوالی ئەو شتانەت بۆ دەلێم کە تۆ نەتوانی ئارام بگری لەسەریان.. قال النبي ﷺ((و ددنا أن موسى كان صبر فقص الله علينا من خبرهما ))

پێغەمبەر ﷺ خۆزگە موسا ﷺ دانی بەخۆیدا بگرتایە بۆ ئەوەی خودای گەورە چیرۆك وبەسەرهاتی ئەوانی بۆ ئێمە باس بکردایە لەهەوالْ ودەنگ باسی ئەوان، قال سفيان قال النبي ﷺ ((يرحم الله موسى لو كان صبر يقص الله علينا من أمرهما ))

(سوفیان) دەلێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: میهرەبانی خودای گەورە لەسەر موسا بێت ئەگەر دانی بەخۆیدا بگرتایە خودای گەورە چیرۆکی هەردووکیان بۆ ئێمە باس بکردایە.

وقرأ ابن عباس : وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينةٍ صالحةٍ غصباً وأما الغلام فكان كافراً وكان أبواه مؤمنين ، ثم قال لي سفيان : سمعت منه مرتين و حفظته منه ، قيل لسفيان : حفظته قبل أن تسمعه من عمرو أو تحفظه من إنسان ؟ فقال : ممن أتحفظه ، ورواه أحدٌ عن عمر و غيري ؟ سمعته منه مرتين أو ثلاثاً و حفظته منه )).

وقرأ ابن عباس : وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينةٍ صالحةٍ غصباعەبدڵلای کوڕی عەبباس ڕەزای خوای لێبێ ئایەتەکەی بەم شێوەیە دەخوێندەوە﴿وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينة خصبا﴾ لەپێش ئەوانەوە پادشایەك هەیە هەر کەشتیەك هەبێت وساغ ودروست بێت داگیری دەکرد.

وأما الغلام فكان كافراً وكان أبواه مؤمنين ئینجا خضر ﷺ لێکدانەوەکانی بۆ موسا کرد بەم شێوەیە بە بۆنەی منداڵەکەوە منداڵێکی کافر بوو لەکاتێکدا دایك وباوکی باوەڕدار بوون ثم قال لي سفيان : سمعت منه مرتين و حفظته منه ،لەپاشاندا سوفیان وتی: گوێم لێبوو دووجار گوێم لێبووە ولەوەوە لەبەر کردووە. فقال : ممن أتحفظه . ورواه أحدٌ عن عمر و غيري ؟ سمعته منه مرتين أو ثلاثاً و حفظته منه )).

وترا بە سوفیان: من ئەم فەرموودەیەم لەبەر کردووە پێش ئەوەی گوێی لەعەمرو بێت یان لەهەر کەسێکیتر؟گێڕدرایتەویەتیە وە لە عەمرەوە بێجگە لەمنیش دووجار وسێجار گوێم لێبووە وهەتا لەبەرم کردووە لە ئەوەوە.

## لێکدانەوەی زاناکان

## باب: حديث الخضر مع موسى عليهما السلام

(خضر) بۆیە ناو نراوە (خضر)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت لەسەر ووشکایی دانیشت یەکسەر بوویە سەوزایی لەباوکی هورمیرەوە گێراوەتەوە.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. تام وچێژ وەرگرتن لەبەسەرهاتی پێغەمبەران ﷺ.

٢. عیبرەت وپەند وەگرتن لە چیرۆکەکانیان.

٣. خۆڕازاندنەوە بە ئەو کارە چاك وباشانەیان کە ئەوان ئەنجامیان داوە.

٤. نەکەوینە ئەو هەڵەیەی ئەگەر ئەوان تێی کەوتبن ئێمەخۆمانی لێ بپارێزین.

٥. بۆ هەواڵی نەتەوەکانی پێش ئێستا ئێمە پێویستە بەبێ زانست قسەی لەسەر نەکەین ئەگینا بەهەڵەدا دەچین.

٦. کەس لەخۆی بایی نەبێت لەهیچ بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا.

٧. هەر کەس درۆ بکات یان بوهتان هەڵواسێ یان قسە بەبێ بەڵگە بکات ئەو دووژمنی خودایە.

٨. خودای گەورە سەر زەنشتی پێغەمبەران ﷺ دەکات لەسەر هەڵەکانیان.

٩. هەرچەندە زانا هەبێت زاناتر هەیە لە ئەو کەسە.

١٠. خودای گەورە بەبێ پەردە قسەی لەگەڵ موسادا ﷺ کردووە: ﴿کلیم الله﴾.

١١. خودای گەورە نیشانەیەکی بە موسا ﷺ فەرموو ئەویش ئەوە بوو کەماسیەکی پێبێت لەهەر کوێدا لێت ون بوو ئەو بەندەی من لەوێدا دەیبینیت.

١٢. ڕووداوەکان بە پێی فەرمانی خودای گەورە ڕوو دەدات.

١٣. ئەو بەندەی خودای گەورە موسای ﷺ بۆ لای ئەو نارد خضر ﷺ ئەویش هەر پێغەمبەر ﷺ بوو،[1] (١) لەهەندی ڕووەوە خودای گەورە زانایی پێدا بوو تەنانەت بە موسای ﷺ نەدا بوو چونکە خودای گەورە فەرمووی لەتۆ زاناترە.

١٤. هەتا بۆت بکرێت کاروانی کردنی بەتاك وتەنهایی نەکەیت ئەگەر پێت کرا دوو کەس بن ئەوتا موسا ﷺ یوشەعی لەگەڵ خۆی برد.

١٥. گەورەیی ودەسەڵاتی خودای گەورە کە نەیهێشت ماسیەکە لە دەریاکەدا ون ببێت بەڵکو ڕایگرت.

١٦. ئەوەتا موسا ﷺ وبرادەرەکەی هەست بە برسێتی ناکەن هەتا نەگەیشتنە ئەو جێگەیەی کە خودای گەورە فەرمانی دابوو بگەنە ئەوێ.

١٧. لەبیر بردنەوە لەکار وفەرمانی شەیتانە بۆ مرۆڤ بەڵام زۆر جار خودای گەورە ئەو لەبیر چوونە وە بەخێر دەگێڕێت ئەگەرلە مرۆڤەوە بە ئەنقەست نەبێت.

١٨. مرۆڤ ئەگەر خۆی درێژ کرد پارچە قوماشێکی پێوە بێت ئەگەر دەست کەوێت.

١٩. ئەگەر مرۆڤی موسڵمان گەیشت بەکەسی تر سەلامی لێ بکات بەوەی بڵێت (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) لەپاشاندا بۆی هەیە بڵێت ئەم کاتەت باش یان هەر دەربڕینێکی تر.

٢٠. بەهەمان شێوە ئەو کەسەی سەلامی لەسەر کراوە بەجوانترین دەربڕین سەلامەکەی وەڵام بداتەوە.

٢١. مرۆڤ خۆی بەڕاستی بناسێنێ بەو کەسەی کە باوەڕی پێیەتی.

٢٢. کاتێك مرۆڤ ناشەرعی یەك ببینێ هەوڵی گۆڕین ولابردنی بدات.

٢٣. ئەگەر مرۆڤ بەدوای زانستدا بچێت شەرم نەبێتە هۆی ئەوەی کەشەرم بکات وهەندێك پرسیاری پێویست لەخۆی بێ بەش بکات.

---

[1] بەڵگە زۆرن کە( خضر) پێغەمبەر ﷺ لەوانە من لەسەر زانستێکم بەتۆ نەدراوە هیچ زانستێکیش نیە گەورەتر بێت لەزانستی پێغەمبەرایەتی، بڕوانە پەرتووکی ((ابن حجر العسقلانی)) چەند بەڵگە لەم ڕووەوە دەهێنێتەوە.

٢٤. مرۆڤ بەبەشی خۆی ڕازی بێت وشانازی بەو بەهرەوە بکات کە خودای گەورە بە ئەوی ڕەوا بینیوە نەك بەشان وباڵی خۆیدا هەڵ بڵێت.

٢٥. مرۆڤ دان بنێت بە ئەو زانستەی لەلایەتی.

٢٦. بۆ هەر پێویستی و وەرگرتنێك لەبەرامبەر داوای پارمەتی وڕوخسەت بخوازی ئەگەر دەرفەتی دا ئەوا بە مەبەستی خۆی گەیشت ئەگەر دەرفەت نەدرا ئەوا بابەدڵ فراوانیەوە شتەکە وەرگرێت.

٢٧. بەهەمان شێوە دان بە زانست وچاکەی بەرامبەر بنێت.

٢٨. دەتوانرێت هەڵسوکەوت بکرێت بەپێی مەرج لەسەر یەکتر دانان هەر کەس لە مەرجی خۆی کەلەسەریەتی دەرچوو ئەوا هەڵسووکەوتەکە کۆتایی پێ بێت تەنها لۆمەو گازندە لەخۆی بکات.

٢٩. ئەگەر مرۆڤ شتێکی پێ درا بەبێ هیچ بەرامبەرێك بۆی هەیە وەرگرێت وسوپاسی کابرای بەخشەری لەسەر بکات یان بەهەمان شێوە ئەویش چاکەیەکی تری بە شێوازێکی تر لەگەڵ بکات.

٣٠. چەندە دنوکی باڵندەیەك لە دەریا گەورەکان کەم دەکاتەوە هەر ئەوەندەیە زانستی مرۆڤەکان بەرامبەر بەزانستی خودای گەورە.

٣١. جاری وا دەبێت ئێمە شتێك لەسەر دڵمان ناخۆشە وەك زەرەر وزیانێك، بەلام دەرئەنجامی کارەکان تەنها لەلای خودای گەورە ڕوونە کەچ خێری تێدایە.

٣٢. کاتێك هەڵەیەك بە بۆچوونی خۆت لەکەسێك دەبینی داوای ڕوونکردنەوەی لێ بکە.

٣٣. بەبیر خستنەوەی سۆز وپەیمان ومەرجەکان کە لەنێوان مرۆڤەکاندا دامەزراوە.

٣٤. لەبیر چوونەوەی مرۆڤ خودای گەورە هیچ تۆڵە وسزای مرۆڤی لەسەر نادات، بەهەمان شێوە ئەبێتە پاسا و وبیانوو بۆ لێبوردن.

٣٥. ئەو کاتەی خضر ﷺ ملی منداڵەکەی لەسەری کردەوە بەفەرمانی خودا بوو، لەدەرئەنجامی ئەو منداڵە کافرە بوونە باوك ودایکی بەهیلاکدا دەربرد.

٣٦. لابردن ونەهێلانی هەر شتێك کە زەرە وزیانی هەبێت.

٣٧. منداڵ بەتێکڕا خاوێن وبێگەردن چۆن موسا ﷺ فەرمووی تۆ دەروونێکی بێگەردت کوشت. بەڵام خودای گەورە فەرمانی بە خضردا بوو کە ئەو منداڵە بکوژێت، بۆ ئەوەی خودای گەورە منداڵێکی تری چاك بداتەوە بە دایك وباوکە چاکەکە.

٣٨. چاکەکاران بۆ چاکەکاران دەبن وخراپکارانیش بۆ خراپکاران دەبن، بەڵام جاری وادەبێت لە مرۆڤی چاك ولەخودا ترس منداڵی لار ولوێر وبەدکار دەبێت جاری واش دەبێت لەمرۆڤی خراپەکار خودای گەورە منداڵی زۆر چاك دەهێنێت ئەمەش لەدەسەڵاتی خودای گەورەیە.

٣٩. مرۆڤ لەکاروانیدا هەقی خۆی هەیە بەسەر موسڵمانانەوە کەخواردن وخواردنەوەی پێ بدەن ئەگەر پێویستی بوو، کە خودا دەفەرمووێت: ﴿وابن السبيل﴾.

٤٠. ئەگەر مێوانداریان نەکردی هەقی ئەوەندەت هەیە کە خۆت تێر بکەیت بۆ ئەوەندەی کە لەو جێگەیەی شەرت ومەرجیان لەسەر دابنێت.

٤١. چاکە بە چاکە کردنەوە زۆر گرنگ نیە با پێویست بێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بتوانێت چاکەو پیاوەتی لەگەڵ کەسانێك بکات لەبنەڕەتدا چاکەیان بۆی نەبووە، یان لەوەش باشتر ئەوەیە مرۆڤ بتوانێ چاکە وپیاوەتی لەگەڵ کەسێك بکات کە خراپەیان بۆی بووبێت.

٤٢. دۆستایەتی وبرایەتی ئەندازەی خۆی هەیە ئەگەر هاتوو مرۆڤ بێتامی کرد بە پرسیار کردن وئیزعاج کردنت بۆت هەیە دۆستایەتی کەم بکەیتەوە نەك خراپ بیت لەگەڵی، بۆ ئەوەی دۆستایەتی یەکە بە چاکی وباشی بمێنێتەوە تێکەڵی کەم بکەرەوە.

٤٣. کاتێك برادەرێکت دەیەوێت تێکەڵیت کەم بکات، تۆش بە پێی پێویست تێکەڵی بکە ئەوەی لێقبووڵ بکە زۆر بەسینە فراوانیەوە.

٤٤. مرۆڤ بە ئارام گرتن زۆر شتێ بەدەست دەهێنێ، کە بە تووڕەیی وپەلەکردن هەرگیز بەدەست نایەن.

٤٥. پێغەمبەر ﷺ زۆر چێژ وتامی تایبەتی دەکرد لە چیرۆکی پێغەمبەران ﷺ بۆیە فەرمووی خودای گەورە ڕەحم بە موسا ﷺ بکات ئەگەر هەندێك زیاتر ئارامبوایە زیارت گوێ بیستی بەسەرهاتەکانیان دەبووین.

٤٦. ڕێزی پێغەمبەران وخۆشەویستیان لەلای پێغەمبەر ی خۆمان ﷺ دەردخات.

٤٧. هەر چ چیرۆکیك یان ڕووداوێك لەپێش ئێمەدا هەبووە کە لەخودای گەورەمان نزیك بکاتەوە یان لە فێڵ وتەڵەکەی شەیتان بەدوورمان بگرێت یان سوودێکی دونیایی بە حەلاڵی بۆ ئێمە تیادابێت یان زەرەر وزیانێکی دونیایی یان ئایینی بۆ ئێمەتیادا بێت خودای گەورە بۆ ئێمەی باسی کردووە.

٤٨. تەنها ئەوەندە کە لە قورئان وبەڕوون کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەسە بۆ ئێمە کە دونیای پێ ڕووناك بکەینەوە چاکە وباشەی خۆمانی پێ بزانین بۆ دین ودونیامان.

٤٩. ئەگەر ئێمە ئەم جۆرە چیرۆکانە نەخەینە هزر وبیری منداڵانەوە ئەوا بەدڵنیایی دەڵێم هزر ومێشکیان پڕ چیرۆکی درۆ ودەلەسە ودزی وپیاو کوشتن وخۆشەیوستی درۆ دەکرێت، ئەو جار ئەوان دەبنە پاڵەوان بۆ فلیمەکانی ڕۆژانی ژیانمان.

٥٠. هاو ەلآن چۆن هەوڵی ئەوەیان داوە بە گەورە وبچووکیانەوە چیرۆکەکان لەبەر بکەن وەك چۆن لە پێغەمبەر ﷺ بیستوویانە.

٥١. ئێمەش بە هەمان شێوە ئەبێت بتوانین لە فەرموودەکان تێ بگەین وسوود ولەزەت وتامی تایبەتی لێ وەرگرین، لە ڕۆژانەی خۆماندا کار بە وتە وچیرۆکەکان بکەین.

٥٢. هەوڵی تەواو بدرێت منداڵان پەروەردە بکرێت لەسەر گێڕانەوە وباس کردنی ئەم چیرۆکانە، چونکە دروستیان دەکات ودەبنە پیاوانی چاکساز لەکۆمەڵگاکەماندا.

٥٣. ئەم کارەش هەمووومان لێی بەرپرسین بە شێوەیەك لە شێوەکان نابێت بەهیچ شێوەیەك هەر یەك لە ئێمە ئەرکی خۆمان لەبیر بچێت بەرامبەر منداڵەکان ونەوەکانی داهاتوومان.

خودا دەفەرموێت : ﴿قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ﴾ الانعام/٦٤ واتە : ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بڵێ خودا لەو ناخۆشی یەو سەر جەم و گشت ناخۆشیەکانی تریش رزگارتان دەکات.

**ولیەم جیمس دەڵێت: (( لە ڕاستیدا لەنێوان ئێمەوە خودای گەورە پەیوەندی گرێدانێك هەیە کە هەرگیز بچڕان و پسانی نییە بۆیە ئەگەر هاتوو ئێمە خۆمان بخەینە ژێر چاودێری خودای گەورە ئەوا ئەوکات هەموو ئاواتەکانیان بەجێ دێت و خوازیارییەکانمان بەرپا دەبن بە تێکڕا)).**

**دیل کارنیجی دەڵێت:(( پاڵەوانی جیهانی "جاك دەمیس" پێی وتم: من هەرگیز ناچمە سەر جێگەی خەوتنم هەتا دوعا و پاڕانەوەکانی خۆم بەتەواوی نەکەم ، خواردنم ناخۆم واتەواو ناکەم هەتا سوپاس وستایشی گەورەی خودای لەسەر نەکەم کە خودا ئەم خواردنەی پێبەخشیم، تەنانەت ماندو نابم و لە پاڕانەوەمەو سکاڵای خۆم ناکەوم هەتا لە ناو گۆڕەپانی مولاکەمەشدا پێش هەر وەرزش کردنێك پێش هەر جوونە بەرامبەرییەك. ویل کارینجی دەڵێت: ئەدوارد ئەستێنیۆس.. گەورە بەڕێوەبەری پێشوی ئەمریکای پێی وتم: ( ئەو هەردەم لە پاڕانەوەو نوێژکردندا بوو لە شەو ڕۆژدا بۆ ئەوەی خودای گەورە حیکمەت ورێگەی ڕاستی نیشان بدات پێ ببەخشێت لە هەڵسوکەوتەکانی...**

**دیل کارینجی دەڵێت... جەنرالی گەورە .. مارك کلارك.پێی وتم من هەموو ڕۆژێك لەسەر ئەژنۆ خۆم رادەگرم و کورنووش دەبەمو دووعاو پارانەوە دەکەم بۆ ئەوەی خودای گەورە سەرکەوتنم پێ بداتا!**

**بۆیە محمد ئەلغەزالی دەڵێت لە ڕاستیدا ئەو پاڵەوانانە دڵنیابوون لەوەی کە ئەوان بە تەنها نین لەم گەردوونەدا و لە ژیاندا، بەڵێ ئەوان هەردەم هەزاری لای ئەو خودا گەورەیەن کە لەو پەری هێزو تواناو دەسەلأت و میهرەبان سۆزدایە بۆ ئەوەی لە گەڵیان بێت لە ژیانی دونیا و ڕێنمۆیی چاودێری و دەستیان بگرێت، وەك چۆن هەموو خێرو چاکەو پیرۆزیەکی لەگەڵ کردوون کە ئەوان هێشتا لە جیهانی نادیار بوون بە وەی کە هێنانیەوە بوون و دروستی کردن و چاودێریان دەکات.باوەڕهێنان بە خودای گەورە پشت و پەنا بەستن بە ئەو خودایە دەبێتە هۆی هێمنی و ئاسایشی و دڵنیایی و سەرفرازی؟!**

**بۆیە من وەڵامی ئەم پرسیارە دوادەخەم بۆ ئەوەی ( ولیم جێمس ) ئەم وەڵامەمان بداتەوە کە دەڵێت : ( لە ڕاستیدا شەپۆلە ئۆقیانووسەکان هەرگیزو هەرگیز کاریگەری و تێکدەری نابێت لەسەر روونی و هێمنی و لەسەر خۆی قولأیی قووڵی ئۆقیانووسەکان هەرگیز نابێتە هۆی ئەوەی کە ئاسایشی تێکبدات ( بەڵکو تەنها کاریگەری ئەم شەپۆلە باو بارانە بۆ سەرەوەری دەریاچەو ئۆقیانووسەکان. بە هەمان شێوە بە ئەگەر مرۆڤ باوەڕێکی قووڵ و لەبن نەهاتووی هەبوو زۆر شیاو جێی خۆیەتی کە هەرگیزو بە هیچ شتێك دڵنیایی ئەو نەکەوێتە دڵەڕاوکێوە بە هۆی باوبارانێکی و شەپۆلێکی سەر رووکاری لەکاتێکی دیاریکراودا.**

# ( قصة موسى مع ملك الموت عليهما السلام )

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ فذكر أحاديث منها : وقال رسول الله ﷺ :(( جاء ملك الموت إلى موسى عليه السلام فقال له : أجب ربك قال : فلطم موسى عليه السلام عين ملك الموت ففقأها قال : فرجع الملك إلي لله تعالى فقال : إنك أرسلتني إلى عبدٍ لك لا يريد الموت وقد فقأ عيني قال : فردَّ الله إليه وقال : ارجع إلى عبدي فقل : ألحياة تريد؟ فإن كنت تريد الحياة فضع يدك على متب ثورٍ فما توارتْ يدك من شعره تعيش بها سنةً قال : ثم مه ؟ ثم تموت قال : فالآن من قريبٍ ربِّ أمتني من الأرض المقدسة عند الكثيب بحجرٍ )) قال رسول الله ﷺ : (( والله لو أني عنده لأريتكم قبره إلى جانب الطريق عند الكثيب الآحمر )). ( ١ )

**دەروازە: چیرۆكی موسا لەگەڵ فریشتەی مردن سەلامی خوایان لێ بێت**

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ فذكر أحاديث منها : وقال رسول الله ﷺ :(( جاء ملك الموت إلى موسى عليه السلام فقال له : أجب ربك قال : فلطم موسى عليه السلام عين ملك الموت ففقأها قال : فرجع الملك إلي لله تعالى فقال : إنك أرسلتني إلى عبدٍ لك لا يريد الموت وقد فقأ عيني قال : فردَّ الله إليه وقال : ارجع إلى عبدي فقل : ألحياة تريد؟ فإن كنت تريد الحياة فضع يدك على متب ثورٍ فما توارتْ يدك من شعره تعيش بها سنةً قال : ثم مه ؟ ثم تموت قال : فالآن من قريبٍ ربِّ أمتني من الأرض المقدسة عند الكثيب بحجرٍ )) قال رسول الله ﷺ :(والله لو أني عنده لأريتكم قبره إلى جانب الطريق عند الكثيب الآحمر ). عن أبي هريرة رضي الله عنه عن رسول الله ﷺ فذكر أحاديث منها : وقال رسول الله ﷺ :(( **لە باوكی هورەیرەوە خودای گەورەی لێ ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە ﷺ زۆر فەرموودەی باس كردووە، لەوانەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی،** جاء ملك الموت إلى موسى عليه السلام فقال له : أجب ربك

**{فریشتەی مردن هات بۆ لای موسا ﷺ پێی فەرموو وەڵامی خودای خۆت بدەوە**

١ )أخرجه البخاري في صحيحه باثر الحديث رقم ( ٣٤٠٧ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٣٧٢ ) ( ١٥٨ ) وأحمد في المسند برقم ( ٨١٧٣ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٦٢٢٤ ) وعبد الرزاق في المصنف برقم ( ٢٠٥٣١ ) والبغوي في شرح السنة برقم ( ١٤٥١ ) من طريق عبد الرزاق عن معمر عن همام بن منبه عن أبي هريرة رضي الله عنه به .وأخرجه البخارى في صحيحه برقم ( ١٣٣٩ ، ٣٤٠٧ ) ومسلم في صحيحه برقم ( ٢٣٧٢ ) ( ١٥٧ ) والنسائي في سننه ( ٤/ ١١٨ - ١١٩ ) وأحمد في المسند برقم ( ٧٦٤٦ ) من طريق عبد الرزاق عن معمر عن ابن طاووس عن أبيه عن أبي هريرة رضي الله عنه موقوفاً .

( مەبەستی ئەوەیە هاتووم ڕۆح کێشانی تۆ بە فەرمانی خودای گەورە بکەم) قال : فلطم موسی علیه السلام عین ملك الموت ففقأها یەکسەر موسا مشتەکۆڵەیەکی لە چاوی فریشتەکەدا بۆیە چاوێکی کوێر کرد، فرجع الملك إلي الله تعالى فقال : إنك أرسلتني إلى عبدٍ لك لا يريد الموت وقد فقأ عيني قال : فردَّ الله إليه پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فریشتەکە گەڕایەوە بۆ لای خودای گەورە وتی: ئەی خودایە تۆ منت ناردووە بۆ لای بەندەیەکی خۆت کەمردنی ناوێت، ئا ئەوە تا چاوی کوێر کردووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی خودای گەورە چاوی فریشتەکەی چاککردەوە وقال : ارجع إلى عبدي فقل : ألحياة تريد؟ فإن كنت تريد الحياة فضع يدك على متن ثورٍ فما توارتْ يدك من شعره تعيش بها سنةً وله پاشاندا پێی فەرموو: "بگەڕێوە بۆ لای بەندەکەم پێی بڵێ ئایا ژیانت دەوێت؟ ئەگەر تۆ ژیانت دەوێت ئەوا دەستت بخە سەر پشتی گایەك هەر چەندە موو لە ژێر دەستت بوو ئەوەندە ساڵە ژیانت دەبێت، قال : فالآن من قريبٍ ربِّ أمتني من الأرض المقدسة عند الكثيب بحجرٍ )) قال : ثم مه ؟ موسا فەرمووی ئەی لەپاشاندا؟ ثم تموت فریشتەکە وتی: لەپاشاندا دەمریت، : فالآن من قريبٍ ربِّ أمتني من الأرض المقدسة عند الكثيب بحجرٍ )) موسا ﷺ وتی: هەر ئێستا با بمرم لەکاتێکی زۆر نزیکدا ئەی خودایە لەو زەوی یەی نزیك زەوی پیرۆزە بە ئەندازەی بەرد هاویشتنێك نزیك بم لەوجێگەیە" قال رسول الله ﷺ : (( والله لو أني عنده لأريتكم قبره إلى جانب الطريق عند الكثيب الأحمر )). پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەخودای گەورە ئەگەر من لەوشوێنە بوومایە گۆڕەکەی موسام نیشان دەدات لەسەر ڕۆخی ڕێگەیەکە لە لای تەپۆڵکە سوورەکەدا}.

## لێکدانەوەی زاناکان

## باب: قصه موسى مع ملك الموت عليهما السلام

(صكه) لە ریوایەتی ئەحمەد دا مەلەکەك ئەلەوت بەئاشکرا دەهاتە میوانداری خەڵکی بۆ روح کێشان.

(لا يريد الموت) لە روایەتی عەممماردا هاتووە کە مەلەکولەوت وتی: ئەی خودایە موسا چاوی کوێر کردووم ئەگەر لەبەر ڕێزی تۆ نەبوایە زۆر ئازارم دەدا،

{فسأل الله ان يدينه من الارض المقدسة رمية الحجر) چونكە گۆڕی زۆربەی پێغەمبەران ﷺ لە بەیتولموقەددەسە.

(الكثيب) رملێكی زۆر لەسەر یەك كراوە.

## گرنگترین ڕێنماییەكان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەكانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. ئەم چیرۆكانە سوود و وانەی زۆری بۆ ئێمە تیادایە بێ حیكمەت نیە كە خودای گەورە ئەم شتانە فێر پێغەمبەر ﷺ دەكات، ئەویش بەش بەحاڵی خۆی بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە.

٢. نێوان فریشتە ومرۆڤ ئاشنایی هەیە نەك وەك نێوان شەیتانەكان وجنۆكەكانی خراپ زەرەر وزیانی مرۆڤیان مەبەستە ودەوێ.

٣. گەورەیی وخۆشەویستی موسا ﷺ لەلای خودای گەورە.

٤. بۆیە ئێمەش دوعا بكەین خودای گەورە تەمانمان درێژ بكات بۆ ئەوەی زۆرترین خزمەت بەئیسلام بكەین ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر كە دەفەرمووێت: {خيركم خيركم من طال عمره وحسن عمله}.وات: چاكترین كەستان ئەوانەن كەتەمەنیان درێژبێت و كردەوەی چاكیان هەبێت.

٥. خودای گەورە تەنانەت مردن وژیانی خستۆتە سەر ئیختیار وبەدەستی خۆیانەوە، ئەمەش بۆ وسەرجەم پێغەمبەرانە ﷺ بێجگە لە هەر مرۆڤێكی تر.

٦. موسا خۆی بە پێغەمبەری خودا دەزانێ هەندێ ئیش وكاری لە پێش مابوو بۆ خزمەت كردنی ئایینی خودایە هەر لەبەر ئەوە حەزی بە مردن نەبوو نەك حەزی بە ژیانی دونیا بێت، چونكە بەمردن دەگاتە لیقای خودای گەورە.

٧. موسا بە مستە كۆڵەیەك چاوێكی فریشتەی مردن كوێر دەكات، ئەمە بێ ڕازی بوونی خودا نیە چونكە فریشتەكەش بەندەی خودایە وموساش بەندەی خودای

خۆشەویستە لەبەر ئەوە فەرمانی خودای خۆی بەجێ دێنێ، كاتێك پەرچی موسا ناداتەوە، چونكە دەزانێت موسا لەلای خودای گەورە زۆر خۆشەویستە.

٨. بۆیە فریشتەكە دەگەڕێتەوە بۆ خزمەت خودای گەورە وخودای گەورەش ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە وفریشتەكە تەنها فەرمانی خودای بەجێهێناوە هەر بۆیەش دەگەڕێتەوە بزانێت چ فەرمانێكی تری هەیە.

٩. بۆیە خودای گەورە چاوی فریشتە وەك خۆی لێدەكاتەوە، دووبارە دەینێرێتەوە بۆ لای موسا ﷺ كە لێی بپرسێ ئەگەر ژیانی دەوێ ئەوا خودای گەورە پێی دەدات.

(لێرەدا چەند وانەیەكی تر هەیە)

**یەكەم:** بۆ ئەوەی بۆ فریشتەكە وسەرجەم فریشتەكانی بریش پیرۆزی موسا دەربخات.

**دووەم:** بۆ ئەوەی پیرۆزی موسا وسەرجەم پێغەمبەران ﷺ بۆ نەتەوەكان دەربخات.

**سێیەم:** نەك خودای گەورە نازانێت موسا ئایا ژیانی دەوێ یان نەزانێت چەند حەزی بەتەمەن درێژی هەیە.

١٠. فریشتەكە دەگەڕێتەوە بۆ خزمەت موسا وپێی دەڵێت ئەگەر ژیانت دەوێ ئەوا دەستت بە پەنجەكانەوە بخە سەر پشتی گایەك چەند موو كەوتە ژێر دەست وپەنجەكانت ئەوا بەهەر موویەك ساڵێك تەمەنت درێژ دەكاتەوە.

١١. بەڵام لەدوای ئەو هەموو ساڵە ئەبێت هەر بمرێت بۆ ئەوەی بگاتە لیقای خودای گەورە، پاداشتی بەبەهەشت بدرێتەوە، مرۆڤیش (سوننەتی خودایە) هەتا نەمرێت ناگاتە ئەم خۆشیانە، كەواتە مردن تەنها پردە بۆ پێغەمبەران وپیاو چاكان بەگەیشتنیان بە لیقای خودای گەورە.

١٢. بۆیە كاتێك موسا زانی ئەبێت ئەو مردنە هەر بچێژی ولادانی نیە بەهیچ شێوەیەك یەكسەر دوعا وپاڕانەوەی كرد كە بەزوترین كات بمرێت.

١٣. كات وشوێنەكەی خۆی دیاری كرد كە نزیك ماڵی پیرۆز بێت (بيت المقدس).

١٤. خودای گەورە دوعا وپاڕانەوەكەی موسای پەسند كرد نزیك ماڵی پیرۆزی خۆی كۆتایی بە تەمەنی هێنا.

١٥. تەنانەت شوێنی گۆڕەکەی نیشان پێغەمبەری خۆمان ﷺ دراوە.

## ١٦. سوێند خواردنی پێغەمبەری خۆمان چەند وانەیەکی تیادایە:

**لەوانە** :

**وانەی یەکەم**: بۆ دڵنیا بوون ودووپات کردنەوەی ئەو هەواڵەیە.

**وانەی دووەم**: ئەگەر بتەوێت شتێك جێگیر وڕاگیر بکەیت لەهزر وبیری خەڵکیدا بەسوێند دووپاتی بکەرەوە.

**وانەی سێیەم**: پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕاستگۆیە بەڵام بۆیە ئەو سوێندە دەخوات بۆ ئەوەی یەهوودەکان بزانن کە پێغەمبەر ﷺ دڵنیایە لە هەواڵەکانی با تایبەتیش بێت بە نەتەوەکانی پێش هاتنی ئیسلام.

**وانەی چوارەم**: بەم سوێند خواردنە لە خەڵکی لەگەران دەکەوێت بەدوای ڕاستیەتی هەواڵەکان بکەوێت.

---

**پێدانی زانستیکی زۆر گرنگ !!...**

ئایا دەزانی زیاتر لەپێنج یەکی قورئان باس لەچیرۆکی **پێغەمبەر** ﷺ موسا دەکات...بێگومان ئەمە بێحیکمەت نیە بۆیە زۆر پێویستە لەژیانامەو سەرگوزەشتەی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەرز تێگەین ...ئەمەش کائەگەر ئەوکاتە هات لەتۆ مژدەبێت ئەوفەمودەی خودا کە دەفەرموێتێ((**اولئك الذين هداهم الله فبهداهم اقتده**))

واتە: ئەوانە خوا ڕێگەی ڕاستی خۆی پێنیشان داون تۆیش ڕێگەی ئەوان بگرە بەر.... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت(٨٨): (( واعلم ان الامة لو اجتمعت على ان ينفعوك بشيء لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله لك ، وان اجتمعوا على ان يضرك بشيء لم يضروك الا بشيء قد كتبه الله عليك ))

واتە : ( بزانە ئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوود مەندت کەن بەشتێك سوومەند نابیت تەنها بەشتێك نەبێت کە خوا بۆی نووسیبیت. وەئەگەر هەموو خەڵك کۆببنەوە بۆ ئەوەی زەرەرت پێ بگەیەنن زیانت پێ ناگات تەنها بەشتێك نەبێ کەخوا بۆی نووسیبیت لێت ڕووبدات).

ووتراوە (٨٩) : (يبتلى الصالحون، فالأمثل فالامثل) واتە : پیاوچاکان تاقی دەکرێنەوە کێش چاك بێت وەك ئەوان تاقی دەکرێتەوە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (٩٠) : (( المؤمن كالخامة من الزرع نفيئها الريح يمنه ويسره))

واتە : مرۆڤی باوەڕدار وەك رووەکێکی چێنراو وایە (با) بەلای ڕاست و بەلای چەپی دەباو دەی هێنێ.

# ( الإسراء والمعراج )

وعن مالك بن صعصعة رضي الله عنهما قال : قال النبي ﷺ :(( بينا أنا عند البيت بين النائم واليقظان ـ و ذكر يعني رجلاً بين الرجلين ـ فأتيت بطستٍ من ذهبٍ ملآن حكمة وإيماناً ، فشق من النحر إلى مرق البطن ، ثم غسل البطن بماء زمزم ثم ملىء حكمة وإيماناً ثم اوتي بدابةٍ أبيض دون البغل وفوق الحمار البراق ، فانطلقت مع جبريل حتى أتينا السماء الدنيا قيل : من هذا؟ قال : جبريل قيل : ومن معك ؟ قال : محمد قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على آدم فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من ابنٍ ونبي فأتينا السماء الثانية قيل : من هذا ؟ قال : جبريل قيل : من معك قال : محمد ﷺ قيل : أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على عيسى ويحيى فقالا : مرحباً بك من أخ ونبيٍ ، فأتينا السماء الثالثة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل : من معك ؟ قال : محمد : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على يوسف فسلمت فقال : مرحباً بك من أخ ونبيٍ ، فأتينا السماء الرابعة قيل : من هذا؟ قال : جبريل . قيل : ومن معك ؟ قيل : محمد ﷺ قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم . قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على إدريس فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من أخ ونبي ، فأتينا السماء الخامسة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل ومن معك ؟ قيل : محمد . قيل: وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم .قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتينا على هارون فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من اخ ونبي ، فأتينا على السماء السادسة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل : ومن معل ؟ قيل : محمد . قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم .قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على موسى فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من أخ ونبي ، فلما جاوزت بكى فقيل : ما أبكاك ؟ قال : يارب هذا الغلام الذي بعث بعدي يدخل الجنة من أفضل مما يدخل من فأتينا السماء السابعة قيل : من هذا؟ قيل : جبريل قيل : من معك ؟ قيل : محمد . قيل : وقد أرسل إليه ؟ مرحباً به ولنعم المجيء جاء، فأتيت على إبراهيم فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من ابن ونبي ، فرفع لي البيت المعمور فسألت جبريل فقال : هذا البيت المعمور يصلي فيه كل يوم سبعون ألف ملكٍ إذا خرجوا لم يعودوا إليه آخر ما عليهم ، ورفعت لي سدرة المنتهى فإذا نبقها كأنه قلال هجر وورقها كأنه آذان الفيول في أصلها أربعة أنهار نهران باطنان ونهران ظاهران ، فسألت

جبريل فقل : أما الباطنان فقي الجنة وأما الظاهران النيل والفرات .ثم فرضت علّي خمسونٍ صلاة فأقبلت حتى جئت موسى ، فقال : ما صنعت ؟ قلت : فرضت علّى خمسون صلاة ، قال : أنا أعلم بالناس منك عالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، وإن أمتك لا تطيق فارجع إلى ربك فسله ، فرجعت فسألته فجعلها أربعين ثم مثلهُ ثم ثلاثين ثم مثله فجعلِ عشرين ثم مثله فجعل عشر ، فأتيت موسى فقال مثله فجعلها خمساً ، فأتيت موسى فقال : ما صنعت ؟ قلت جعلها خمساً فقال : مثله ، قلت : فسلمت فنودي:أني قدامضيت فريضتي وخففت عن عبادي وأجزي الحسنة عشرا)(١)

## دەروازەی ((شەو ڕەوی کردن بە پێغەمبەر ﷺ بەرز کردنەوەی بۆ ئاسمان))

وعن مالك بن صعصعة رضي الله عنهما قال : قال النبي ﷺ :**لەمالکی کوڕی صەمعە ڕەزای خودای لێبێت، وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:** (( بينا أنا عند البيت بين النائم واليقظان – و ذكر يعني رجلاً بين الرجلين – **لەکاتێکا کەمن لەلای ماڵی خودا بووم "کەعبەی پیرۆز" لە نێوان خەو وهۆشیاری دا بووم، ڕاویەکە دەڵێت کابرایەك هات کە لە نێوان کابرای تردا بوون بێگومان مەبەست پێیان فریشتەکان بوون**،(( فأتيت بطستٍ من ذهبٍ ملآن حكمة وإيماناً ، فشق من النحر إلى مرق البطن ، ثم غسل البطن بماء زمزم ثم ملىء حكمة وإيماناً ثم اوتي بدابةٍ أبيض دون البغل وفوق الحمار البراق))

(( فأتيت بطستٍ من ذهبٍ ملآن حكمة وإيمان **تەشتێکی هێنا کە لە زێڕ دروست کرا بوو پڕولیپان لیپی دانایی و باوەڕ بوو** فشق من النحر إلى مرق البطن ،**لەگەردنمەوە سینەمیان دوو لەت کرد هەتا گەیشتە سکم** ثم غسل البطن بماء زمزم ثم ملىء حكمة ـ

---

( ١ ) أخرجه البخاري في صحيحه بالأرقام ( ٣٢٠٧ ، ٣٣٩٣ ، ٣٤٣٠ ، ٣٨٨٧ ) وأحمد في المسند برقم ( ١٧٨٣٥ ) وابن حبان في صحيحه برقم ( ٤٨ ، ٧٤١٥ ) وابن خزيمة في صحيحه برقم ( ٣٠٢ ) والطبراني في معجمه الكبير ( ٥٩٨/١٩ ) والبغوي في شرح السنة ( ٣٧٥٢ ) من طرق عن همام بن يحيى عن قتادة عن أنس بن مالك عن مالك بن صعصعة رضي الله عنه به .وأخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ١٦٤ ) ( ٢٦٤ ) وأحمد في المسند برقم ( ١٧٨٣٦ ) والترمذي سننه برقم ( ٣٣٤٦ ) وابن خزيمة في صحيحه برقم ( ٣٠١ ) والطبراني في معجمة الكبير ( ١٩ ، ٥٩٩ ) والبيهقي في دلائل النبوة ( ٢ / ٣٧٣ ، ٣٧٧ ) وابن أبي شيبة في المصنف ( ١٤ /٣٠٥ ) من طرق عن سعيد بن أبيعمر و عن قتادة بن دعامة به .وأخرجه مسلم في صحيحه برقم ( ١٦٤ ، ٢٦٥ ) وأحمد في مسنده برقم ( ١٧٨٣٣ ) والنسائي في سننه ( ١ / ٢١٧ ، ٢٢١ ) والطبراني في معجمه الكبير ( ١٩ / ٥٩٩ ) من طرق عن هشام الدستواني عن قتادة به .وأخرجه البخاري في صحيحه برقم ( ٣٢٠٧ ) معلقاً ، والنسائي في سننه الكبرى برقم ( ٣١٣ ) من طريق يزيد بن زريع عن سعيد بن أبي عروبة وهشام الدستوائي به .

وإيماناً لەپاشاندا سكمیان شۆرد بەئاوی زەمزەم لە پاشاندا پڕکرا بە ئیمان ودانایی، دابةٍ أبيض دون البغل وفوق الحمار البراق)) ،لەدواتر سواریەكیان بۆ هێنام سپی بوو لە هێستر بچووكتر بوو لە گوێ درێژ گەورەتر بوو ((فانطلقت مع جبريل حتى أتينا السماء الدنيا قيل : من هذا؟ قال : جبريل قيل : ومن معك ؟ قال : محمد قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على آدم فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من ابنٍ ونبي ))فانطلقت مع جبريل حتى أتينا السماء الدنيا قيل : من هذا؟ لەپاشاندا من وجبریل ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ئاسمانی دونیا پرسیار كرا، ئەم كەسە كێ یە؟ جبریل وتی، من جبریلم، قيل : ومن معك ؟ قال : محمد قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم وترا كێیە لەگەڵت؟ وتی، محەمەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی، بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على آدم فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من ابنٍ ونبي ))

وترا بەخێر بێت، چاكترین كەسە كە هاتووە چوینە بۆلای ئادەم سەلامم لێكرد ئەویش وتی، بەخێر بێیت كوڕم وپێغەمبەر ﷺ،
، فأتينا السماء الثانية قيل : من هذا ؟ قال : جبريل قيل : من معك قال : محمد ﷺ قيل : أرسل إليه ؟ قال : نعم ، قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على عيسى ويحيى فقالا : مرحباً بك من أخ ونبي ، چووینە ئاسمانی دووەم وترا كێیە وتی، جبریل، وترا، كێت لەگەڵە نعم وترا كێیە لەگەڵت؟ وتی، محەمەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی، بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... وترا بەخێر بێت، چاكترین كەسە كە هاتووە چووینەعیسا ویەحیا سەلامم لێكرد ئەویش وتی، بەخێر بێیت براو وپێغەمبەر ﷺ،
(( فأتينا السماء الثالثة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل : من معك ؟ قال : محمد : وقد أرسل لإليه ؟ قال : نعم قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على يوسف فسلمت فقال : مرحباً بك من أخ ونبي)) چووینە ئاسمانی سێیەم وترا كێیە وتی، جبریل، وترا، كێت لەگەڵە نعم وترا كێیە لەگەڵت؟ وتی، محەمەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی، بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... وترا

بەخێر بێت، چاکترین کەسە کە هاتووە چووینەە لای یوسف سەلامم لێکرد ئەویش وتی: بەخێر بێیت براو وپێغەمبەرﷺ،(( فأتينا السماء الرابعة قيل : من هذا؟ قال : جبريل . قيل : ومن معك ؟ قيل : محمد ﷺ قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم . قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على إدريس فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من أخ ونبي ،)) چووینە ئاسمانی چوارەم وترا کێیە وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە نعم وترا کێیە لەگەڵت؟ وتی: محەممەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی: بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... وترا بەخێر بێت، چاکترین کەسە کە هاتووە چووینە لای ئیدریس سەلامم لێکرد ئەویش وتی: بەخێر بێیت براو وپێغەمبەرﷺ،

فأتينا السماء الخامسة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل ومن معك ؟ قيل : محمد . قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم .

قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتينا على هارون فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من اخ ونبي ،)) چووینە ئاسمانی پێنجەم وترا کێیە وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە نعم وترا کێیە لەگەڵت؟ وتی: محەممەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی: بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... وترا بەخێر بێت، چاکترین کەسە کە هاتووە چووینە لای هاروون سەلامم لێکرد ئەویش وتی: بەخێر بێیت براو وپێغەمبەرﷺ

، فأتينا على السماء السادسة قيل : من هذا ؟ قيل : جبريل ، قيل : ومن معل ؟ قيل : محمد . قيل : وقد أرسل إليه ؟ قال : نعم .

قيل : مرحباً به ولنعم المجيء جاء ، فأتيت على موسى فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من أخ ونبي ، فلما جاوزت بكى فقيل : ما أبكاك ؟ قال : يارب هذا الغلام الذي بعث بعدي يدخل الجنة من أفضل مما يدخل من امتي الجنة)) چووینە ئاسمانی شەشەم وترا کێیە وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە ؟ وتی: محەممەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی: بەڵێ، قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... وترا بەخێر بێت، چاکترین کەسە کە هاتووە چووینە لای موسا سەلامم لێکرد ئەویش وتی: بەخێر بێیت براو وپێغەمبەرﷺ

**کاتێك لێی تێپەڕ بووم موسا گریا لێی پرسرا بۆچی دەگریت؟ ئەی خودایە ئەم منداڵە کە لەدوای من بووە بە پێغەمبەر ﷺ نەتەوەکەی زۆرتر وگەورەتر دەچنە بەهەشت لەنەتەوەکەی من.**

فأتينا السماء السابعة قيل : من هذا؟ قيل : جبريل قيل : من معك ؟ قيل : محمد . قيل : وقد أرسل إليه ؟ مرحباً به ولنعم المجيء جاء، فأتيت على إبراهيم فسلمت عليه فقال : مرحباً بك من ابن ونبي))**چووینە ئاسمانی حەوتەم وترا کێیە وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵە ؟ وتی: محەمەدە ﷺ، وترا ئایا بەدوایدا نێردراوە؟ جبریل وتی: بەڵێ،** قيل : مرحبا به ولنعم المجيء جاء... **وترا بەخێر بێت، چاکترین کەسە کە هاتووە چووینە لای موسا سەلامم لێکرد ئەویش وتی: بەخێر بێیت کوڕ وپێغەمبەر ﷺ))**

((، فرفع لي البيت المعمور فسألت جبريل فقال : هذا البيت المعمور يصلي فيه كل يوم سبعون ألف ملكٍ إذا خرجوا لم يعودوا إليه آخر ما عليهم ، ورفعت لي سدرة المنتهى فإذا نبقها كأنه قلال هجر وورقها كأنه آذان الفيول في أصلها أربعة أنهار نهران باطنان ونهران ظاهران ، فسألت جبريل فقل : أما الباطنان ففي الجنة وأما الظاهران النيل والفرات )).

((، فرفع لي البيت المعمور **ماڵی ئاوەدانم "بيت المعمور"م بۆ بەرز کرایەوە،** فسألت جبريل **پرسیاری جبریلم کرد،** فقال : هذا البيت المعمور يصلي فيه كل يوم سبعون ألف ملكٍ إذا خرجوا لم يعودوا إليه آخر ما عليهم **وتی ئەوە ماڵی ئاوەدانی خودایە لەهەر ڕۆژێکدا حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تیدا دەکەن، ئەگەر دەرچوون ناگەڕێنەوە بۆی ودواین پەرستنە لەسەریان،** ورفعت لي سدرة المنتهى فإذا نبقها كأنه قلال هجر وورقها كأنه آذان الفيول **سیدرەی مونتەها ﴿فاذا نبقها كأنه قلال هجر﴾ گەڵاکانی وەك گوێی فیلەکان بوون** في أصلها أربعة أنهار نهران باطنان ونهران ظاهران **لە بنەڕەتەکەیدا چوار ڕووبار هەبوو، دوو ڕووباریان نهێنی و نادیار بوون ودوو ڕووبارەکەی تریان ڕوون وئاشکرا بوون، پرسیاری جبریلم کرد: وتی دوو ڕووبارە نهێنی ونادیارەکە ئەوە لە بەهەشتن، بەڵام دوو ڕووبارە ئاشکراو دیارەکان بریتیە لە نیل وفوڕات.**

ثم فرضت علَي خمسونِ صلاة فأقبلت حتى جئت موسى ، فقال : ما صنعت ؟ قلت : فرضت على خمسون صلاة ، قال : أنا أعلم بالناس منك عالجت بني إسرائيل أشد

المعالجة ، وإن أمتك لا تطيق فارجع إلى ربك فسله ، فرجعت فسألته فجعلها أربعين ثم مثلهُ ثم ثلاثين ثم مثله فجعلِ عشرين ثم مثله فجعل عشر ، فأتيت موسى فقال مثله فجعلها خمساً ، فأتيت موسى فقال : ما صنعت ؟ قلت : جعلها خمساً فقال : مثله ، قلت : فسلمت فنودي : أني قد فريضتي وخففت عن عبادي وأجزي الحسنة عشراً )) ثم فرضت علَي خمسونِ صلاة **لەپاشاندا نوێژم لەسەر فەرز کرا پەنجا نوێژ بۆ هەر شەو ورۆژێك** فأقبلت حتى جنت موسى ، فقال : ما صنعت ؟ **هەتا پێش وازیم کرد گەیشتمە موسا، وتی: چیت کرد؟** قلت : فرضت علي خمسون صلاة ،**وتم: پەنجا نوێژم لەسەر فەرز کراوە،** قال : أنا أعلم بالناس منك عالجت بني إسرائيل أشد المعالجة ، وإن أمتك لا تطيق فارجع إلى ربك فسله ، **وتی: من شارەزاترم بەحاڵی خەڵکی لەتۆ ئەی محەمەد ﷺ زۆر چارەسەرەی کێشەکانی نەوەی ئیسرائیلم کرد لەو پەڕی سەختی چارەسەریدا، بەڕاستی نەتەوەکەی تۆ ئەوەیان پێ ناکرێت، بگەڕێوە بۆ لای خودای گەورە وداوای لێ بکە بۆت کەمبکاتەوە** فرجعت فسألته فجعلها أربعين ثم مثلهُ ثم ثلاثين ثم مثله فجعلِ عشرين ثم مثله فجعل عشر ، فأتيت موسى فقال مثله فجعلها خمساً ، فأتيت موسى فقال : ما صنعت ؟ قلت : جعلها خمساً **گەڕامەوە بۆ لای خودای گەورە، خودای گەورە نوێژەکەی کرد بە چل نوێژ، لەپاشاندا بەهەمان شێوە کردی بەسی نوێژ ولەپاشاندا بەهەمان شێوە هەتا کردنی بە بیست لەپاشاندا بەهەمان شێوە خودای گەورە کردی بە پێنج نوێژ لەسەرمان، چوومەوە بۆ لای موسا وتی چیت کرد؟** فقال : مثله ، قلت : فسلمت فنودي : أني قد اوضيت فريضتي وخففت عن عبادي وأجزي الحسنة عشراً )) **وتم: خودای گەورە کردوویەتی بە پێنج نوێژ بەهەمان شێوە پێی وتم بگەڕێوە بۆ لای خودات با بۆت کەمبکاتەوە وتم من خۆم تەسلیم بەم فەرمانە کردووە بانگکرا من فەرزەکانی خۆم چەسپاند ولەسەر بەندەکانم سووك کرد، پاداشتی یەك بە (دە) دەدەمەوە...**

## لێکدانەوەی زاناکان

## باب: الاسراء والمعراج

۱. **دووجار سینگی پێغەمبەر ﷺ دوولەت کراوە لە منداڵی ولەکاتی ئەم فەرموودەیە.**

۲. **(واتیت بدابة البراق) بۆیە ناو نراوە بووراق چونکە خێرایی وەك خێرایی هەورە.**

٣. (المعراج) پێ پلەکانە بۆ ئاسمان بەرز بوونەوە.

٤(يارب هذا الغلام) مندالّ مەبەست پێی گەنجێکی زۆر زوو هەڵکەوتوو لە هێزرو بازوودا، چونکە ماوەی هاتنی پێغەمبەر کەمە لەگەڵ ئەوەشدا خێر وبێری زۆری بەخۆی ونەتەوەکەی دەگات.

(الخطابي) ئەمە بۆ گەورەیی نیعمەت وبەهرەکانی خودایە لەسەر پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکا کە تەمەنی کەمە لەچاو زۆربەی پێغەمبەران ﷺ.

(فرفع لى البيت المعمور) واتە بۆم دیار ولێم نزیك کرایەوە (الرفع) نزیك کردنەوە توێیە بۆ شتێك ﴿وفرش مرفوعة﴾ الواقعة: ٣٤ واتە: جێگەکانیان بۆ نزیك دەکرێتەوە.

(سدرة المنتهى بۆیە ئەو ناوە نراوە چونکە زانستی پێغەمبەران ناگاتە ئەوێ بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ.

(فاذا نبقها) ئەوەی کە هەڵگری سیدرە لە رووەکەکان.

(قلال هجر) القلال، کۆی (قلة) یە پێنج سەد رتلی بەغدادیە، خەتتابی دەڵێت: (القلال) بریتی یە لە گۆزەی دیاری کراو.

(ونهران ظاهران) لە فەرموودەدا ڕوونکراوەتەوە "النيل والفرات" {يخرجان من اصلها (اي في الجنة) ثم يسيران حيث اراد الله تعالى ثم يخرجان من الارض ويخرجان فيها}.

نیل وفورات لەبەهەشتەوە سەرچاوەیان گرتووە لە پاشاندا دەڕۆن بۆ ئەو شوێنەی کە خودای گەورە خۆی بیەوێ بۆی بچن، لە پاشاندا لە زەوی هەڵدەقوڵێن وئاویان بە ڕێڕەودا دەچێت.

قول (فقال:سلمت بخير) بەلامی شەددە بە قورسی یەوەن واتە خۆم دایە دەستی خودای گەورە.

ئەگەر پرسیار دەکەیت چۆن موسا پێغەمبەری گەڕاندەوە بۆ لای خودای گەورە؟ لە وەڵامدا ئەوان زانییان کە واجب نیە بە یەکجاری، چونکە ئەگەر واجبی یەکجاری بوایە بە هیچ شێوەیەك کەمکردنەوەی نیە.

## گرنگترین ڕێنماییەکان و وانەو قازانج و پەند وئامۆژگاری وسوودەکانی ئەم فەرموودەبۆ ڕۆژانەی ژیانمان:

١. ئەوەشی لێ وەردەگیری کە دروستە خودای گەورە نسخ لە شەریعەتدا بهێنێ.

٢. بۆ دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ ئەم شەو ڕەوی یە بەرزکردنەوەیە بۆ ئاسمان کرا.

٣. بۆ دڵرا گیری بوونی پێغەمبەر ﷺ لەسەر فەرمانەکانی ئیسلام لەکاتێکا کە کافرەکان باوەڕە پێ ناهێنن.

٤. بۆ یەکرێزی پێغەمبەران ﷺ کاتێك پێغەمبەر ﷺ بە مێوانداری سەردانی ئەوەندە پێغەمبەرە ﷺ دەکات.

٥. ئاشنا بوونی پێغەمبەرە ﷺ بە براکانی خۆی لە پێغەمبەران ﷺ.

٦. بۆ خاوێن وبێ گەردی خستنە دڵ وسینەی پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەشی شەیتان ئەگەر هەبێت بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك نەتوانن ورێگری پێغەمبەر ﷺ بن ودڵە ڕاوکێی بخەنە دڵیەوە.

٧. پێغەمبەر ﷺ هەستی بە حەوانەوەی دەروونی دەکرد کاتێك لە سایەی کەعبەدا هەندێك ئیستراحەتی بکردایە.

٨. خەریکبوو خەونی لێبکەوێت سێ کەس (فریشتە هاتنە خزمەتی بە تەشتێکەوە کە لە زێڕ دروست کرا بوو پڕو لیپان لیپی دانایی وزانایی باوەڕ بوو سینەی پێغەمبەریان ﷺ دوو کەت کرد، هەتا سەرسکی پیرۆزی لەپاشاندا سکیان شۆرد بە ئاوی زەمزەم لەپاشاندا پڕ کرا بە دانایی وزانایی وباوەڕداری.

٩. جۆرە سواریەکیان بۆ هێنا بۆ شەوڕەوی کردنەکەی بچووکتر بوو لەهێستر وگەورەتر بوو لە گوێ درێژ، ناوی "بوڕاق" بوو، لە فەرموودەی تردا هاتووە کە دەست وپێیەکانی هەڵدەگرن بە دووری چاو بینی هەتا چاوی بڕ بکات دایدەنا.

١٠. لەم فەرموودەیە دا باس لە "بيت المقدس" دەکات کە چۆن لەگەڵ زۆربەی پێغەمبەران ﷺ کۆ بووەتەوە ونوێژی بۆ کردوون، بەڵام فەرموودەی ڕاستی لەسەرە.

١١. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جبریل بەرز بوویەوە بۆ ئاسمان هەتا دەرگاوانی ئاسمان پرسی کێیە؟ جبریل خۆی ومحەمەدی ﷺ ناساند، بۆیە کاتێك لە دەرگای ماڵێك دەدەیت خۆت بناسێنی بەڕاستی ودروستی ئەگەر حەزیان لێ نەبوو بچیتە ژوورەوە ئەوا بگەڕێوە وهیچ دڵت نیگەران نەبێت، چونکە ئەوە بۆ تۆ وبۆ خاوەن ماڵیش چاکترە.

١٢. بەخێر هاتنی گەرمی پێغەمبەران ﷺ بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد، تۆیش ئەگەر میوانت هات بەخێر هاتنی گەرمی بکەیت.

١٣. لەسەر مەوعید بۆ سەردان بچیت.

١٤. یەکەم کەسێك کە خودای گەورە نیشانی پێغەمبەری خۆمانی دا باوکمان ئادەم بوو کە زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کوڕەکەی خۆی کرد.

١٥. لەئاسمانی دووەمیشدا بەهەمان شێوە هەتا لەوێ عیسای کوڕی مەریەم ویەحیای کوڕی پوری عیسای دی کە زۆر بەخێرهاتنیان کرد. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئایینی خۆمان بەناردنی پێغەمبەر ﷺ دواین پێغەمبەرە بۆ ڕاست کردنەوەی ئەهلی کتاب هاتووە وهیدایەت دانی ئەو کەسانەی کە بێ پەرتووکن.

١٦. لە ئاسمانی سێیەمدا بەهەمان شێوە پێش وازیان لێکرا ولەوێدا یوسف پێغەمبەری ﷺ دی.

١٧. لە ئاسمانی چوارەمدا ئیدریس پێغەمبەری ﷺ دی.

١٨. لەئاسمانی پێنجەمدا هاروونی برای موسای ﷺ دی.

١٩. لەئاسمانی شەشەمدا موسا پێغەمبەری ﷺ دی موسا ﷺ بەهەمان شێوە بەخێر هاتنی پێغەمبەری ﷺ کرد، کاتێك پێغەمبەر ﷺ تێپەڕ بوو، موسا گریا، پرسیاریان کرد بۆچی دەگریت وتی چونکە لە نەتەوەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ زۆرتر دەچنە بەهەشت لە نەتەوەکەی من ئەویش حەزی بەوە بوو کە نەتەوەی ئەو لەسەرجەم نەتەوەکانی پێغەمبەران پتر بچنە بەهەشت، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەشاییەکی زۆرم دی وامزانی نەتەوەی منە، بەڵام

پێیان وتم ئەوەیە نەتەوەی موسا، لەپاشاندا نەتەوەی خۆمیان پێشان دام زۆر گەورەتر بوو لەنەتەوەی موسا.

**لەم خاڵانەدا چەند وانەیەك وەردەگیرێن:**

**وانەی یەكەم:** مرۆڤ حەز دەكات بەرهەمی دیار بێت با ئێمەش هەوڵ بدەیت بەرهەمی دەستمان دیار بێت.

**وانەی دووەم:** مرۆڤ پەرۆشی خزمانی خۆی بێت كاتێك كە لە ناخۆشی دان.

**وانەی سێیەم:** مرۆڤ خۆی حەزی بەوە بێت خزمانی گەڵ وولاتی لە خۆشی دابن.

**وانەی چوارەم:** هەر كەسە ولە ئێمە هەوڵ بۆ سەر فەرازی بەختەوەری گەلمان بدەین.

**وانەی پێنجەم:** بەختەوەری ڕاستەقینە ئەوەیە مرۆڤ لەهەردوو ژیان كامەران وسەرفەراز بیچت.

**وانەی شەشەم:** بەختەوەری هەمیشەیی بەردەوام وبیگەرد تەنها لەبەهەشتدا بەدەست دێت.

**وانەی حەوتەم:** میهرەبانی خودای گەورە بە ئومەتی پێغەمبەر ﷺ لە زۆرینەی هەموو نەتەوەكانی تر دەچنە بەهەشتێ.

**وانەی هەشتەم:** هیدایەت وڕەحمەتی خودای گەورە ئەم ئوسمەتەی گرتووەتەوە لەسەرەتا تا كۆتاترین مرۆڤ لەسەر ئەم زەویەدا.

**وانەی نۆیەم:** ڕێزی ئەم نەوەی ئیسلامە بگرین.

**وانەی دەیەم:** هەوڵ بۆ گەیاندنی ئیسلام بكەین لە ناوەوە ودەرەوەی بازنەی موسڵمانان.

٢١) لە ئاسمانی حەوتەمدا بەهەمان شێوە پێش وازیان لێكرا وپێغەمبەر ﷺ گەیشتە باوكی پێغەمبەران ﷺ ئیبراهیم خەلیلی رەحمان.

٢٢) دیار وئاشكرایە پلەی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ لەسەجەم پلەكانی تری پێغەمبەران بەرز تر بوو چونكە خۆشەویستی خودا بوو.

٢٣)پێغەمبەری خۆمان ﷺ پلەی لە پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ بەرز تر بوو، چونکە لە ئیبراهیمیش تێپەڕ بوو بۆ ماڵی بەیتو لمعەمور، یان بەیتول مەعموریان نیشاندا کاتێك پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە جبریل کرد وەڵامی دایەوە ودەفەرمووێ هەر ڕۆژەی حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناو ئەو ماڵەی خوداوە کاتێك لێی دەردەچن بۆ هیچ جارێکیتر سەرەیان نایەت کە بگەڕێنەوە ناوی.

٢٤) ئێمە فێری ئەوە دەبین ئەگەر شتێکمان نەزانی پرسیاری لێبکەیت وسنووری خۆمان نەبەزێنین.

٢٥)زۆری ئەو فریشتانە دیار دەکات کە بەندایەتی وپەرستنی خودا دەکەن: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ {٦}﴾.سورةالتحريم الاية

٢٦) گەورەیی ودەسەڵاتی خودای گەورە ئاشکرا دەکات.

٢٧)لەپاشندا "سیدرە المنتهی" وبۆ دواین پلە بەرز کرایەوە، کە دواین پلەیە لە نزیکبوونەوە بۆ خزمەت خودای گەورە هەر لەوێدا خودای گەورە زۆرشتی سەرسوڕمانی نیشان پێغەمبەر ﷺ دا. لەوانە:

أ- خۆشیەکانی بەهەشت.

ب- ئەو ناز ونیعمەتەکانەی کە لە بەهەشتدا هەیە.

ت- ناردنی نیگا بۆ سەر پێغەمبەر وفەڕز بوونی نوێژ، ئەمەش گەورەی نوێژ دەردەخات تەنها ئەو فەرزە لەئاسماندا فەڕز کراوە وەك ئەوەی خودای گەورە .

## ئەم چەند وانەیە بە ئێمە بفەرموویت:

**وانەی یەکەم:** هەر کەس نوێژ بکات خودا بەرزی دەکاتەوە لەلای خۆی ڕێزی لێدەگرێت.

**وانەی دووەم:** هەر کەس نوێژ نەکات خودای گەورە نزم وسەرشۆڕی دەکات.

**وانەی سێیەم:** نوێژ پاڵت پێوە دەنێت بۆ هەموو چاکایەك قەدەغەی هەموو خراپەیەکت لێ دەکات.

**وانەی چوارەم:** مرۆڤی نوێژ کار دەبێت سەرکەوتوو بێ بۆ دین وبۆ دوونیای.

**وانەی پێنجەم:** پەیوەندی ئاسمانە بە زەویەوە وپەیوەندی خودای گەورە بە بەندەکانیەوەیەتی.

۲۹) چوار ڕووبار هەن پیرۆزن دوویان ئاشکرایە کە نیل وفوراتە دووەکەی تریان نادیارە لەبەهەشت هەڵ دەقوڵێن.

30) شارەزایی وپسپۆڕی موسا بەدەرروونی خەڵکی کە داوای کرد لە پێغەمبەر بگەرێتەوە بۆ خزمەت خودای گەورە وداوای کەمکردنەوەی نوێژەکانی لەلا بکات هەتا بووە پێنج نوێژ؛

## لێرەدا چەند خاڵێك وەردەگیرێت.

**خاڵی یەکەم:** موسا ﷺ زۆر دەردەسەری دیوە بەدەست نەتەوەکەی خۆیەوە بۆیە موسا ﷺ پێغەمبەری ڕاگەیاند کە خەڵك نەتوانن ئەو پەنجا نوێژە بکەن.

**خاڵی دووەم:** ئەم هاتوو چووەی پێغەمبەر لەلایەن موساوە گەڕانەوەی بۆ لای خودای گەورە خۆشەیوستی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات. کە هەر چەند بیویستبێت دەگەڕایەوە خزمەت خودای گەورە.

**خاڵی سێیەم:** موسا بۆ چوونەکەی ڕاست بوو کە ئەوەندە کێشە وپیشە دروست دەبوو ئەمان توانیایە ئەو پەنجا نوێژە بکەین.

**خاڵی چوارەم:** پێغەمبەر ﷺ بەقسەی موسای دەکرد دەگەڕایەوە بۆ لای خودای گەورە.

**خاڵی پێنجەم:** ئێمەش فێری ئەوە دەکات کە لە ئەزموونی خەڵکانی تر سوود مەند بین.

**خاڵی شەشەم:** هەر شتێك بۆ خۆت پێت خۆش بێت ئەبێت بۆ گشت موسڵمانان پێت خۆش بێت.

**خاڵی حەوتەم:** نابێت خۆ بەگەورەزانیت هەبێت وهەق وڕاستی لەخۆت بچووكتر وكەمتر بوو وەرنەگریت.

**خاڵی هەشتەم:** شەرم نابێت ڕێگر بێت لە فێر بوون.

**خاڵی نۆیەم:** ئەزموون وەرگرتن لە هەڵسووكەوت لەگەڵ خەڵكی كارێكی پێویستە، ژیان بریتی یە لە چەند ئەزموونێك كە دووبارە دەبێتەوە.

٣١. دوای ئەوەی كە نوێژەكە لە پەنجا نوێژ كەمكرایەوە بۆ پێنج نوێژ خودای گەورە بە كەرەمی خۆی خێری پەنجا نوێژمان بۆ دەنووسی.

٣٢. پەنجا نوێژەكە فەرزە، بەڵام خودای گەورە لەسەر بەندەكانی سووك وئاسان كرد هەر كەس پێنج نوێژ ئەنجام بدات وەك پەنجا نوێژەكەی كرد بێت وایە.

## ناوەرۆکی فەرمووودەی قودسی

ناوەرۆك

پرۆژەی مەوسووعەو کۆکراوەی فەرمودەی قودسی .. پرۆژەیەکی هەرەگەورەیە هەقی خۆیەتی چەندەها داموو دەزگا هەستێت بەتاوتوێکردن و هەڵبژاردن و پوختەکردن و بەکوردی کردنی ئەم فەرمووده قودسیانە **لەبەر ئەم چەند خاڵانە:**

**خاڵی یەکەم:** دەتوانرێت بەچەند بەرگێك تێکرای فەرموودەکانی قودسی کۆبکرێتەوە. لەکاتێکا لەوانەیە بەسەدەها بەرگ تێکرای فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆنەبێتەوە.

**خاڵی دووەم:** پێگەی فەرموودەی قودسی لەناو دڵ و دروونی هەرموسوڵمانێکدا، کە پێگەیەکی یەکجار پڕ بەهاو قورس و سەنگین و بەرز و گەورەی هەیە.

**خاڵی سێیەم:** هەتا ئەو رادەیەی کەفەرموودەی قودسی بەرانبەر قورئان ناودەبرێت، بۆنموونە: لەکاتی گێرانەوەی و باسکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو :خودای گەورە دەفەرموێت: کەواتە فەرموودەکەی دەدایەوە پاڵ خودای گەورە.

واتاداریی و پڕبەهایی وشەکانی فەرمودەی قودسی کەبەکەمترین رستە واتایەکی زۆر گەورە زل دەدات بەدەستەوە.

**چوارەم:** گرنگترین کارێك کە لە و رێگەیەوە بتوانرێت خودای گەورەی پێرازی بکرێت بەهۆی تێگەیشتن و کارپێکردنە بەفەرموودە قودسیەکان.

**خاڵی پێنجەم:** ئەوەی زۆر پێویستەو لە پێش هەموو شتێکیترەوەیە ، ئەوەیە کە خودای گەورە لەقورئاندا یان لەفەرموودەکانی قودسیدا باسی لێوە کردووە و لە پاشاندا بەفەرمووددەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زیاتر وزیاتر بۆ ئێمە روونکراوەتەوە.

**خاڵی شەشەم:** لەبەر ئەمهۆیانە منیش لە پاش پشتیوانی بەستن بەخودای گەورە چەند رێگەیەکم گرتووەتە بەر بۆ ئەوەی کەبتوانم خزمەتێك بە ئایین و گەل و وڵاتم بکەم **بەم شێوەیە ی خوارەوە:**

**شێوەی یەکەم:** هەڵبژاردنی گرنگترین فەرموودەی قودسی لەسەدان فەموودەکانیتر.

**شێوەی دووەم:** راسترین فەرموودەم هێناوە لەهەزارەها بەناو کراو بە فەرموودەو لەراستیدا فەرموودەش لێی دوورە و بەریە.

**شێوەی سێیەم:** راڤەکردن و لێکدانەوەی زانا پسپۆرەکانی ئەم بوارەم باسکردووە:

**شێوەی چوارەم:** هەڵێنجراوانە زۆرترین و گرنگترین رێنماییی و وانە و سوود و قازانج و پەند و ئامۆژگاری، کەزۆر پێویستە بۆ باری ژیانی رۆژانەی خۆمان و هەرموسوڵمانێك چونکەچاو روونی دەکات لەهەڵسوکەوتی لەگەڵ خودای گەورەی خۆی وپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئایین وتێکراو سەرجەم موسوڵمانان و خزمان و دۆستانی ، تەنانەت لەگەڵ دووژمنانیشی لەشەیتان وناخەزانیشی.

**شێوەی پێنجەم:** کەدەتوانم بڵێم ئەم هەڵێنجراوانە و رێنمایی و دەرس و وانەو پەند و سود و قازانجی بەسەدها رێنمایی لەخۆگرتووەو هەژمار کردووە. بۆیە دەتوانم بڵێم: ئەم پەرتووکە یەکەم پەرتووکە تا رۆژی ئەمرۆ لەسەر ئاستی هەموو ناوچەکە لەوانەشە بتوانم بڵێم لەسەر ئاستی هەموو جیاهانیش، لەم جۆرە رێ و شوێن گرتنە بەر و پا پەند بوونە، لە پێش هەموو شتێك خودای گەورە رێنموویی و چاودێریی تایبەتی کردووم لەم جۆرە خزمەتکردنە بۆ فەرموودەکانی خۆی بۆیە: بەیەکەم پەرتووك دەژمێردرێت لەمدبواره‌دا.. خۆ ئەگەر هەرنەبێ ئێمە هێشتا نەماندیوە!..

**شێوەی شەشەم:** ئەم بەرگە یەکەم بەرگ دەبێت دەخرێتە ماڵانی موسوڵمانانەوە: لەکاتێکا چاوەڕوانی بەرگی دووەمێ بەیارمەتیدان خودای گەورە..

**شێوەی حەوتەم:** هیچ فەرمودەیەکم دووبارە نەکردوتەوە. بەئەمەش خۆی لە خۆیدا خوێنەری بەڕێز لەزۆر **ماندووبوون وگەڕان دەپارێزێ لەوانە:**

**ماندوو بوونی یەکەم:** لەسەرئێشەی تێکەڵکردنی فەرموودەی راست لە ئەوانەی ناونراون فەرموودە و لەهەمانکاتدا راستنین.

**ماندوو بوونی دووەم:** پەرش وبڵاوی و فراوانی و قووڵی فەموودەکان لەناو سەرجەم پەرتووکەکانی فەرموودەبیدا.

**ماندوو بوونی سێیەم:** واتاکردنی بەکورترین شێوە دراوە بەدەسەتەوە.

**ماندوو بوونی چوارەم:** ئەم بەرگە و لەوانەیە بەرگی دووەمیش هەرو بەس تەنها فەموودە قودسیەکانە ((متفق علیه)) یان هەرنەبێت بوخاری لەمەسلیم بەجیاگێروایەتیەوە یان موسلیم بەجیا لە بخاری گێراویەتیەوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بارسەنگی و پڕبەهایی و دڵنیایی دەدات بەخوێنەری بەرێز لەم فەموودانەدا.

جابۆئەم مەبەستانە دوا لەسەرجەم موسوڵمان دەکەم کەبەهەموو شێوەیەك بشتگیریم بکەن بۆ هێنانەدی و سەرخستنی ئەمپرۆژە گەورەیە خودای گەورە یارمەتی دەری هەمووانە

براتان: ابو بکر توفیق فتاح